





# خودا

سعید حوی
نووسیویەتی

سۆران
کردوویەتی بە کوردی

نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە ـ هەولێر

* ناوی کتێب: الله ﷻ (خودا).
* ناوی نووسەر: سەعید حەووا.
* ناوی وەرگێڕ: سۆران.
* چاپی یەکەم: ١٤٢٠ك – ٢٠٠٠ ز
* تیراژ: ١٥٠٠دانە.
* ژمارەی سپاردن (٣٠٦)ی ساڵی ١٩٩٩ز.
* لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر / هەولێر.
* چاپکردنی : چاپخانەی پەروەردە

لێکۆڵینەوەی بەرنامەیی ئامانجدار لەمەڕ سێ بنەمای:

خودا- پێغەمبەر- ئیسلام





## سعید حوی

نووسیویەتی

## سۆران

کردوویەتی بە کوردی

گەر ئەم کتێبەت خوێندەوە بۆت دەردەکەوێ گەورەترین ڕاستی کە زانست و ژیری سەلماندویانەو چیتر دەمەقاڵێ هەڵناگرێ (بوونی خودا) یەو هیچ کەسێك بێجگە لە موسوڵمان لەم گەردوونەدا ناتوانێ بە تەواوەی خوا بناسێ.

مەبەست لەم زنجیرەیە

# زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی‌یە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی‌و سازێنەری بێداری‌و رابوونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی‌و تاکڕەوی‌و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت.

﴿ الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فَيَتبَعونَ أَحسَنَهُ. أولئِكَ الذّينَ هَداهُمْ الله وَأولئِكَ هُمْ أولُـــوا الالبابْ ﴾.   (زمر –١٨)

نووسینگەی تەفسیر



# وتەيەك

لەم كتێبەدا ئەمەوێت لە سێ بنەمای سەرەكی بدوێم كە بەبێ زانین و بڕوا بوون پێی (موسولّمان بوونی مرۆڤ) نایەتە دی، زیاتر تیایدا بە كۆكردنەوەو ڕێكخستنی زانیارییەكانی ناوی هەستاوم، نەك وەك شتێكی تازەو نوێ داهێنان بێت. هەرچەندە تێبینی ئەوەم كردووە كە زۆر لەسەر ئەم سێ بنەمایە نووسراوە، بەڵكو لە هەر بەشێك لە بەشەكانی هەر یەك لەم سێ بنەمایە زۆر نووسراوە، بێ ئەوەی لێكۆڵینەوەیەكی سەراپاگیری هەبێت بۆ ئەم بنەمایانە، بۆیە منیش لێرەدا هەولّم داوە ئەم كەلێنە بە هەموو تواناكەمەوە پڕ بكەمەوە، لە هەر جێگەیەكیشدا كەسێكم بینیبێتەوە لە من باشتر لەو بوارەدا دوابێ ئەوە هیچ ڕێگرێكم لەبەردەمما دانەناوە بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرم و هەندێكی لێوە باس بكەم. ڕەنگە ئاماژەم بە سەرچاوەكە دابێ یاخود نەمدابێ، لە هەردوو حاڵەتەكەشدا هۆكاری خۆی هەیەو پێویست بە باس كردن ناكات، جا خوێنەری بەڕێز لات سەیر نەبێت كە هەست بە گواستنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی ترەوە بكەیت لەم كتێبەدا، چونكە سووربوون و خەمی من زیاتر لە دەرخستنی بیرۆكەی كتێبەكە بووە ، نەك

ستایش کردنی ئەوەی راستی گوتووە یا لە ترسانم لەوەی کە ئاگر هەڵگیرسێنێ بـە خراپـە بدوێ.

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ((مـن قـال رضیـت بـالله ربـاً وبالإسـلام دینـاً وبمحمدٍﷺ نبیاً وجبت له الجنة)) أخرجه مسلمو نسائي وأبوداود. یاخود دەفـەرموێ: ((ذاق طعم الإیمان من رضي بالله رباً وبالإسلام دیناًو بمحمدٍ رسولاً)) أخرجه مسلم والترمذي.

ئەم کتێبەش کە ناوی (الأصول الثلاثة)یە بەجۆرێك لەمەڕ زاتی خوداوە دەدوێت کە هیچ گومانێك نەهێڵێتەوەو بە پشتیوانی خودا هـەموو شوبهەیەك رادەماڵێ،و بـواری هیـچ درۆیەك ناهێڵێتەوە، واش لە مرۆڤ دەکات رازی بێت بە پەروەردگارێتی خوای گەورە.

بەجۆرێکیـش لـە بـارەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ وە ئـەدوێ کـە کەسـایەتی ئـەو پێغەمبـەرە مەزنـەی تیـا دەرئەکـەوێ بەوپـەڕی بـاوەڕ پـێ هێنـانو بەڵگـەوە، ئـەم دوو سیفەتەش وا لە مرۆڤ دەکەن راستییەکانی وەك خۆر لا روون بێـت، ئـەو راسـتییەی کـە محمد ﷺ مەزنترین رووخسارەکانی مرۆڤایەتییە لە هەموو بوارێکەوە، وەك چـۆن بەڵگـەی پەیامەکەی بە جۆرێکە هیـچ بوارێـك لـە بـەردەم ژێریـدا ناهێڵێتـەوە جگـە لـە بـاوەڕ بـوون نەبێت.

لە بەشی سێیەمدا لە بابەت ئیسلامەوە ئەدوێین؛ وەك عـەقیدەو بەندایـەتی کـردنو بەرنامـەی ژیـانو دان پیانـانو پاڵپشـتیەکان، بەشـێوەیەك هەمەکیـەکانی ئیسـلام روون ئەکاتـەوەو هـەروەها پشـكو بەشەکانیشـی، بنـەماو لقـەکانی دەرئـەخات بـەجۆرێك بەڵگـە لەسەر خەڵك دێنێتەوەو بوار نادات دەست بەرداری بێتو بەشێ ترەوە بنیشێتەوە ﴿ومن یبتغ غیر الإسلام دیناً فلن یقبل منه﴾ آل عمران–٨٥ واتـە: و هەرکەسێ بێجگـە لـە ئیسـلام (تەسلیم لە راست خوادا)، دینێ تر هەڵبژێرێ، جا (هەرگیز) لێی قبووڵ ناکرێ

مرۆڤ کاتێك لە خوێندنەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەبێتەوە؛ دڵنیا دەبێت، گەر خۆی بیەوێتەحەق بناسێو خوداش رێی نیشـان بـدات بـە فێنکایی یـەقین دڵـی داکـەوێ، ئەگـەر

وانەبێت ئەوا زۆر هزرو ژیری هەرچەند هەق دەبینن بەڵام لێی لائەدەن، ئەم کتێبە خاڵی سەرەتایە بۆ لەدایك بوونەوەیەکی نوێی مرۆڤ کە دەیەوێ لە تاریکایی گومانو دوو دڵی و فەوتانو لێك ترازانو گێرە شێوێنی رزگاری بێت.

خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا تێبینی ئەوە دەکات کە من زۆر وەستاوم لەسەر یەکەم بنەما کە (اللّٰه)یەو بنەمای دووەمیش (الرسول) بەشێوەیەکی شی کراوەو گفتوگۆ کراو وبەڵگە هێنانەوەی قەناعەتپێکەر دواوم، بە پشت بەستن بە گوتاری ژیری بە ئارامو خۆ گرتنەوەو گرتنی هەموو دەروازەیەکی گومانو شوبهە ئەم باسەم تاوتوێ کردووە، بەڵام لە بنەمای سێیەمدا (الإسلام) زیاتر راستییەکانم خستۆتە روو وەك لە شێوازی گفتوگۆ کردن، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە مرۆڤ دوای ئەوەی بڕوا دێنێت بە خوایەتی اللّٰه و پێغەمبەرێتی محمد ﷺ، هیچی تر لەبەردەمیدا نامێنێتەوە تەنیا باوەڕهێنان نەبێت بە ئاینو شەریعەتەکەی، باسەکە ئەوە نیە کە بەڵگە لەسەر هەموو بەشێکی ئیسلام بهێنینەوە.. –هەچەندە بەڵگەش هەن– بەڵکو باسەکە لێرەدا پێناس کردنە، لۆجیکی ژیریش دەڵێ: مرۆڤ هیچی لەبەردەمدا نامێنێ جگە لە تەسلیم بوون بۆ خواو شەریعەتەکەی نەبێت، خوا پەروەردگارەو دروستکراوەکانیش بەندەن؛ ئەو پەروەردگارە زانایەی کە مرۆڤی فێر کردووە دەربارەی ئەو شتانەی نەیدەزانی.

هۆیەکی تری ئەوەی وای لێ کردووین زۆر لەسەر باسی (خودا)و (پێغەمبەر) بدوێین، ئەوەیە کە(ماددییەتی بێ باوەڕ) هەردەم بە هەموو تواناکانیەوە لە هەوڵدایە مرۆڤ خودا لە بیر بکات،و لە بوونو دڵییەوە پێغەمبەرانی خودا بە بچووکتر تەماشا بکات، لەمەشدا نەخشەی خاوەن ئایینە پووچەکان لە ناشیرین کردنی وێنەی راستەقینەی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ دەوری گرنگیان بینیوە، پێویستە ئەم لێکۆڵینەوەیە ماف خۆی بدرێتێ، چونکە ئەم شاڵاوانە رۆژ دوای رۆژ لە زیاد بوون دان، رەنگدانەوەی لەسەر دەروونی مرۆڤ سات دوای سات پتر دەبێ، تەنانەت موسوڵمانانیش ـ کە بەتەنیا خاوەنی رێگای راستن– تووشی هەمان بەدبینی ناڕەوا بوون، تەنانەت ئێستا وان لەسەر لێواری

هەلگەڕانەوەیەکی سامناکی گـەورە، بۆیـە زۆر ئاتـاجی روون کردنـەوەی ئـەم دوو بنەمایـە دەبن لەگـەلْ سـێیەم بنـەمادا، نـەك ئـەوانی تـر، تـەنیا ئـەو کەسـانە نـەبێت کـە خـودا دەیانپارێزێت..

جگە لەمەش لەم کتێبەدا مەبەستێکی تـرم هـەبووە، ئـەمیش ئەوەیـە کـە ئەوانـەی خەریکی کاری پـەروەردەی ئیسلامین گرنگترین لایـەنیان لـەبیر کـردووە، ئـەو لایەنـەی کـە ئیمامی عومەر لەم وتـەیەدا ئاماژەی پیٚ دەکات:

(ئێمە سەردەمێك ژیـاین، هـەر یـەکێك لـە ئێمـە ئیمـانی پێـش قورئـان وەرئـەگرت، پاشان کە سورەتەکان دەهاتنە خواریٚ حەلآڵو حەرامو فەرمانو نەهییەکانی بـە ئاسـانی دەزانیوپێویستی نەدەکرد لەسەریان بوەستیٚ، کەچی من کەسانێکم بینی قورئانیان پێـش ئیمـان وەردەگـرت، قورئـانی لـە فاتیحـەوە دەخوێنـد تـا کۆتـایی کـەچی نـەیدەزانی چ فەرمانێکی پیٚ کردووەو لەچی دووری خستۆتەوەو پێویستە گرنگی بـەچی بداتو ئـەوەی خراپە وەکو خورمای خراپ(الدقل) لیٚی دوور کەوێتەوە) .

مەرگەساتی موسولْمانان لەوەدا کۆدەبێتەوە کە زانیاری ئیمـانو ڕێگاکـەیان پشـت گویٚ خست، کە ئەمەش پێشەکییەکی فیطری کتێبەکەی خوداوەندە، ﴿قل هو للذين آمنوا هدى وشفاء، والذين لا يؤمنون في آذانهم وقر، وهو عليهم عمى﴾ فصلـت/٤٤، واتـە: بلْـیٚ: ئەم قورئانە بۆ کەسانیٚ کە بڕوایان هێناوە ریٚ نوێنو شـیفایە،و ئەوانـەی کـە بـڕوا نـاهێنن کەڕنو کوێرنو نابینن.

ئەم کتێبە لەگەلْ کتێبێکی تـردا بـەناوی (جنـد الله ثقافـة وأخلاقـاً) هەولْدانێکـە بـۆ گەڕانەوەی شتەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان لەم بابەتەوە (بابەتی ئیمان).

جا ئەم کتێبە هێزێکی بەلْگەدار بە موسـولْمان‌دەبەخشـیٚ کـە بـەو هۆیـەوە بتوانـیٚ هـەموو کەسـێکی ئـاوارەو شـەپرێوی بـەردەرگای خوداوەنـدی میـهرەبان بانگـەواز بکـات، هەروەها رەنگە بەهۆیەوە بتوانیٚ بەلْگە لەسەر هەموو دوژمنێکی خوا بهێنێتەوە کە نکۆلْـی

لە نیشانەو ئایەتەکانی خودا دەکەن، دەروونیان بە هۆی ستەمو خۆ بەزل زانینەوە پەسەندیان کردووە.

لە کۆتاییشدا پێویستە ئەم باسەش بخەمە روو کە:

لە کتێبی بێ باوەڕانو لادراوانەوە زانیاریم وەرگرتووە، چونکە حیکمەت چەکی بزری بڕوادارە، هەموو ئەو کتێبانەش سوودم لێ وەرگرتوون ئاماژەم بۆ نەکردوون، مەرج نیە هەموو نووسەرێکیش کە وتەیم وەرگرتووە شایستەی خوێندنەوە بێت، هەرشتێکم وەرگرتبێ بەبێ روون کردنەوە بەسەریا بازم‌نەداوە، پەروەدگاریش ئاگاداری مەبەستەو پشتو پەناو خاوەنە لە دونیاو دوارۆژ داو باشترین پشتیوانە.

تێبینی: کاتی خۆی، بەشەکانی بەرایی ئەم باسەم کە دەربارەی زاتی خوداوەند بوو، بۆ هەندێك لە قوتابیانی زانکۆ پێشکەش کرد پێش ئەوەی بیکەم بە کتێبێك، ئەو کاتە بە بیرمدا نەدەهات دەبێتە بەشێك لەم کتێبەو بە ناوی منەوە بڵاو دەبێتەوە، بۆیە هەوڵم نەداوە هەموو وشەو رستەیەك كە لەم کتێبەدا لێی دواوم بیگێڕمەوە بۆ سەرچاوەکەی، هەروەها کاتێ دەربارەی چاپ کردنو بڵاو کردنەوەی کتێبەکە دووام، دوور بووم لە کتێبخانەی وڵاتەکەمەوە، ئیدی باسەکەم هەر بەم جۆرە نارد بێ ئەوەی هەڵسم بە کاری جیاکردنەوەی ئەوەی کە وەرم گرتووە، دیارترین ئەو سەرچاوەیەش کە سوودم لێی وەرگرتوومووتەی خاوەنەکانیانم لە دوو توێیدا یەك خستووە:(قصة الإيمان)ی شێخ (نديم الجسر)ە خوا بیپارێزێ،هەروەها کتێبی (اللّٰه)ی عقاد... ئیدی ببوورن...

# الله
# جل جلاله

ناسینی خوا ئەو کۆڵەکــە ســەرەکییەیە کــە تــەواوی ئیســلامی لەســەر دادەمــەزرێ، بــەبێ ئــەم ناسـینەش هــەر کـارێك لــە ئیسـلامدا بــە ئــەنجام بگەیەنرێت بــەبێ ســوودێکی راستەقینە دەمێنێتەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا گیانی ئیسلام فەرامۆش ئەکرێ، ئیدی نرخی کارێك چییە گیانی لەبەردا نەبێت؟

بەڵام ئایا چۆن خودا (الله) بناسین؟ ئەی رێگای ئەم ناسینە چییە؟ وەڵامــی ئــەم پرسیارە زۆر پێویست و گرنگە، چونکە ئێمــە گــەر رێگەکــە نەناسـین نـاتوانین بگەینــە ئــەو مەبەستەی دەمانەوێت پێی بگەین.

۱- تێڕوانینی بێ باوەڕان بۆ ئەم رێگایە:

هەندێك مرۆڤ لە کۆن و نوێدا نکۆڵــی لــە بوونــی خــودا دەکــەن، چونکــە بــە هــۆی هەستەکانیانەوە دەرکی پێ ناکەن، وایان زانیوە رێگەی گەیشـتنیان بــە خــودا بــەم جــۆرە دەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا بڕوادارانیان بە تۆمــەتی تێوەگلانــی خەیاڵاتــەوە تاوانبـار دەکـرد، یاخود بە گومڕاو شوێن ئەفسانە کەوتوو و ســەرلێتێکچوو مرۆڤــی نازانسـتییان دادەنـان...

وچەندان جوێن‌و بەسووك تەماشا کردن‌و گاڵتە پێ کردن، کە بێ باوەڕان بە خـوای گـەورە ئاڕاستەی ئەو بڕوادارانەی دەکەن کە بەهۆی ڕێگەی تری بێجگە لە ڕێی هەستەکان بڕوایان بە خودا هێناوە.

نمونەی ئەوانەی کە تەنیا بڕوا بەو شتانە دەهێنن کە بەر هەستەکانیان بکەوێ ئـەو واقیعـە ماددییـەی تیـایدا دەژین بـەدرۆیان دەخاتـەوە. بـۆ نموونـە بڕوایـان بـە هـێزی کێشندە(القوة الجاذبیة)و یاساکانی هەیە کەچی نەشـیان بینیـوە، بـەڵکو بەرەنجامەکـەیان بینیـوە، هـەروەها بڕوایـان بـە ژیـری هێنـاوە هەرچـەندە نەشـیان بینیـوە، بـەلام کاریگەرییـەکانیان بینیـوە، هـەروەها بڕوایـان بـە هـێزی موگناتیسـی هەیـە، کـەچی تـەنیا ڕاکێشانی ئاسن بۆ ئاسنیان بینیوە بێ ئەوەی هێزی کێشندەکە ببینن، بڕوایان بە بوونـی ئەلکترۆن‌و نیوترۆن هەیە کەچی نە ئەلکترۆن‌و نە نیۆترۆنیشیان بینیوە!، جا ڕاستی ژیانی ئەو جۆرە کەسانە ئەوە دەردەخات کە بڕوایان بە هەندێ شت هێناوە هەسـتەکانیان پـەی پێ نەبردوون، بەلام شوێنەوارەکەی نیشانی داون ئەوانیش گەیشتوونەتە یەقینێکی گومان بڕ، ئەمەش ئەو ڕاستیەمان بۆ دەرئەخات کە ئەو کەسانە بڕوایان بـە شـوێنەواری شـتەکان هێناوە نەك بە خودی شتەکان.

بۆ ئەم بڕوا بوونەش ژیری پێی ناساندن نەك هەسـتەکان، هـەر چـەندە هەسـتەکان ئەو ئامێرانەن کەرەسەکانی حوکم دانی بە ژیری بەخشـیوە بـۆ دەرك کردنـی حوکمەکـەی، بەلام گەر ژیری نەبێت هیچ حوکمێك نادرێت‌و هیچ ناساندنێك نایەتە دی، بەڵکو هەستەکان زۆر جاران وێنەی خەیاڵیمان پێ دەبەخشن،بەلام تەنیا بەهۆی ژیرییەوە ڕاستییەکانمان بـۆ دەردەکەوێت: ئەو دارەی لە ناو ئاودا دەیبینین بەشێوەی شکاو دەر دەکـەوێ‌و ئـەو هێڵـە هاوتایانەی کە هێڵـی تـر جیـای کردۆتـەوە بـە شـێوەیەکی نـا هاوتـا دەردەکـەون، یـاخود ژمـارەی سپی لـە ژمـارەی ڕەش گـەورەتر دەردەکـەوێ، هەمیشـەش هەستمان وایـە کـە بەڕێگادا دەڕۆین سەرمان بۆ سەرەوەیە، جا گـەر لـە تـەوەرەی بـاکوور یـان لـە تـەوەرەی خواروی گۆی زەوی یان لە هێڵی ئیستیوا بین! جا ئەم وێنانە بە ڕوونـی ئـەوەمان نیشـان

دەدەن کە ژیری نەبێت هەستەکان تووشی هەڵەمان دەکەن، هەروەها گەر ژیری نەبوایە هیچ ناساندنێکمان لە جێی خۆیدا نەدەبوو.

جا ئایا ئەو کەسانە راست دەکەن کە مەعریفەکانیان تەنیا لەهەستکانیاندا بیینا کردووە؟ ئایا لەگەڵ دەروونی خۆیاندا ژێر بێژن کاتێ رەفزی بروا بوونیان بە خوای گەورە کرد چونکە بە هەستەکانیان پەی پێ نابەن؟ لەگەڵ ئەوەش ئەوان تەنیا بە شوێنەوارو کاریگەری شتەکان بروایان بە هەموو راستییەکان هێنا کە نەیانبینیوەو گەورەترین راستیش پێك دێنێ کە مرۆڤ ناسیبێتی.

ئەم بۆ چوونە هەڵەیەی رێگای ناسینی خوای گەورە (چ لە کۆنو نوێدا) گەورەترین هۆکاری دوور کەوتنەوەی زۆربەی خەڵکییە لە رێگای باوەڕ بوون بە خوا، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم بۆچوونانە بە پێی پێوانەی زیرەکیو ژیری هەڵەیە، چونکە ژیری بەهۆی زیرەکییەکەیەوە حوکم ئەدات کە (ﷲ) بەدی هێنەری ماددەیە نەك ماددەکە خۆی، چونکە ماددە ناتوانێ ماددە دروست بکات، جا گەر کۆتایی دەرکی هەستەکان تەنیا بۆ ماددە هەست پێ کراوەکان بێت ، ئەوا ئەو کاتە (ﷲ) دەرکی پێ ناکرێت، ئەوەی روونو ئاشکراشە ئەوەیە کە هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوانو هیچ بێ باوەڕێك لە بێ باوەڕان نەبووە گەر ئەو گومانو شوبهەیەیان بۆ دروست نەبووبێ لەمەڕ تێڕوانینی هەستەکی بۆ رێگەی ناسینی زاتی خوداوەند، وەك چۆن لەم رۆژگارەدا چەندان کەس دەبینینەوە کە نە بینینیان دەبێتە هۆیەکی هاوەڵ دانان بۆ بێ باوەڕ بوونیان، وەك چۆن بیستوومانە هەندێ دەوڵەتانیش(نەبینین)دەکەنە پاساو بۆ بێ باوەڕییان، وەك دەزگاکانی راگەیاندنی یەکێتی سۆڤیەت کە پاش ناردنی یەکەم مانگی دەستکردی خۆی ئەوەی راگەیاند.

لە بەسەر هاتە خۆشەکانی وەڵامی فیطرە بۆ ئەم مەسەلەیە ئەو بەسەر هاتە نوکتە ئامێزەیە کە دەڵێن لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییدا روی داوە، لە کاتێکدا مامۆستایەکی پۆلی شەشی سەرەتایی بە قوتابییەکان دەڵێت: ئایا من دەبینن؟ گوتیان:

بەڵێ، ئەویش گوتی: کەواتە من هەم، پاشـان گوتـی ئایا ئـەو تەختەیـە دەبینـن ئـەوانیش گوتیان: بەڵێ، ئەویش گوتی! کەواتە تەختەکە بوونـی هەیـە، ئینجـا گوتـی ئـەی مێزەکـە دەبینن؟ ئەوانیش گوتیانڕ بەڵێ، ئەویش گوتی کەواتە مێزەکـە بوونـی هەیـە، پاشـان لێـی پرسین: ئایا خوا دەبینن؟ وتیان: نەخێر، مامۆستاکەش گوتی: کەواتە خوا بوونی نیە، لەم کاتەدا یەکێك لە قوتابییە زیرەکەکان هەستاو گوتی: ئەی ئایا عـەقڵی مامۆسـتا دەبینـن؟ وتیان نەخێر، ئەویش گوتـی: کەواتە مامۆستا عەقڵی نیە.

جا ئەو خەیاڵەی کە زۆر لە بێ باوەڕان هەر لە کۆنـەوە دەسـتی پێـوە دەگـرن زۆر کۆنە، وەك چۆن شوێنەوارێکی نەخۆشی دڵو دەروونیشەو، جا ئەمـە هـەرگیز شـوێنەواری بیرێکی رێكو ژیرییەکی راستو ویژدانداری نیە لە لێکۆڵینەوەدا.

قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە کە بێ باوەڕان لە هـەموو سـەردەمێکدا بـۆ بـڕوا بوونیان مەرج دائەنێن، ئـەویش دەبـێ هەسـت بـە بوونـی خـوا بکـەن بـەهۆی بیسـتن یـان بینینەوە، ئەمەش بەشێکە لەو ئاماژە دانەی قورئان بە هۆکارەکانی ئەم مەرج دانانـە، کـە خۆی لە خۆیدا نەخۆشییەو لە ئەنجامدا بۆچوونی خراپو لێدوانی هەڵـەی لێ دەکەوێتـەوە، قورئانی پیرۆز هۆکانی ئەم داوایە بـەم خاڵانـە لێـك ئەداتـەوە: نـەفامی، خـۆ بـەزل زانـین، لادان، ستەم.

١-نەفامی: ﴿وقال الذين لا يعلمون لولا يكلمنا الله أو تأتينا آية، كذلك قال الذيـــن من قبلهم مثل قولهم، تشابـــهت قلوبهم قد بيّنا الآيات لقوم يوقنـــون﴾ البقـرة/١١٨ واتـە: و ئەوانەی وا ئاگادار نەبوون، وتیان: دەی چاکە، خوا بە ئێمە بڵێ یا نیشـانەو بەڵگەیـەکمان بۆ بێنێ ، هەروەهاش پێشینانی ئەوانیش هەر قسەیەکی ئاوایـان دەکـرد، دڵو دەروونیـان وەك یەکە، بەڵام ئێمە نیشانەکانی خۆمان بۆ خاوەن یەقینەکان روون کردۆتەوە.

ئەم ئایەتە ئاماژە بـەوە دەکـات کـە ئـەم گوتنـە وتـەی زاناکـان نیـە بـەڵکو وتـەی نەفامانە،و ئەم وتەیە نوێ نیە بـەڵکو بۆمبێکـی بـێ باوەڕانـە لـە کـۆنو نـوێدا، هۆکەشـی ئاکامی ویکچوونـی دڵەکانـە، لـە کۆتاییشـدا ئەمـە روون دەکاتـەوە کـە رێگـای گەیشـتنە

پەروەردگار نیشانەو بەڵگەو ئایەتەکانیەتی، یاخود شوێنەوارەکانین کە دەلالەتی بوونی خودا دەچەسپێنن.

٢-خۆبەزل زانین: ﴿وقال الذين لا يرجون لقاءنا، لولا أنزل علينا الملائكة أو نرى ربنا، لقد استكبروا في أنفسهم وعتو عتواً كبيراً، يوم يرون الملائكة لا بشرى يومئذٍ للمجرمين﴾ الفرقان/٢١-٢٢، واتە: و ئەوانە کە هیوایان بە دیداری ئێمە نیە (ڕۆژی بەرێ ئینکار ئەکەن) دەڵێن: بۆچ مەلائیکەت بۆ ئێمە نازل نابێ؟ یا پەوروەردگارمان بەچاو نابینین؟ بە هەقیقەت ئەوانە خۆیان بە گەورە دائەناو نا فەرمانیان کرد نافەرمانێکی گەورە، بەڵام ڕۆژێ مەلائیکەتەکان دەبینن ڕۆژی مزگێنی تاوانباران نابێ!.

وەك چۆن لە یەکەم ئایەتدا ئەوەمان بینی کە بێ باوەڕان دەیانەوێ لە خوا ببیستن، ئالێرەشدا دەیانەوێ پەروەردگار ببینین، بەڵام ئایا ئەوانە کێن کە دەیانەوێ پەروەردگار ببینن؟ ئەوانە ئەو جۆرە کەسانەن کە دەزانن ژیانی دونیا هەموو شتێکەو ئیدی لە پشتییەوە هیچ شتێك نیە جگە لە عەدەم نەبێت، وەك چۆن یەکەم ئایەت بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ وەڵامیان ئەداتەوە، هەر بەم جۆرەش لەم ئایەتەدا ئەوە روون دەکاتەوە کە لەجیهانێکی تری جگە لەم جیهانەو لە یاسای جیاوازی جگە لەم یاسایانەدا بێ باوەڕان فریشتەکانی پەروەردگار دەبینن، بەڵام لە یاساکانی ئەم جیهانە ئاساییەدا هەستەکان پەی بە جیهانی نەزانراوو غەیب نابەن، جا گەر بە پێی یاسا ئاساییەکانی ئەم جیهانە فریشتەکان نەبینرێن ئەوە زاتی خوا زۆر لە پێشترە لەم مەسەلەیەدا کە نەیبینین، هەروەك چۆن ئایەتەکەش ئەمەی روون کردووەتەوە کە خۆ بەزل زانین تاکە هۆیەکە وای لێکردوون ببنە خاوەنی ئەم روانگەیە، بەڵام ئەم مرۆڤەی خۆی راستەڕێ دەگرێ و حەز لە حەق دەکات، رێگای راست دەگرێتە بەر.

٣- لادان و لاڕێ بوون: لە ئایەتێکی تردا دەربارەی یەکێك لە فیرعەونەکانی میسر دەدوێ و دەفەرموێ: ﴿وقال فرعون يا هامان أبن لي صرحاً لعلي أبلغ الأسباب، أسباب السموات فأطلع الى إله موسى وإني لأظنه كاذباً، وكذلك زيّن لفرعون سوء عمله وصد عن

سبيل﴾ المؤمن، غافر/٣٦-٣٧.. واته: فیرعەون بە هامانی وت: کۆشکێکی بـەرزم بـۆ سـاز بدە، بەڵکو بگەمە کەرەستەو ئامرازێك، ئامرازەکانی هۆی (بەرز بوونەوە بـۆ) ئاسمانـەکان تـا لـە خـوای موسـا ئاگـادار بمو بەڕاسـتی گومـان ئەبـەم کـە ئـەو درۆزنـە، ئـا بـەم جـۆرە کردەوەی خراپی فیرعەون لەبەر چاوی رازابۆوەو ئەوەی لە ڕێگای هەق گێڕایەوە.

لـەم ئایەتـەدا وەك دەبینـین وەڵامـی ئـەم جـۆرە کەسـانەی لـە خۆگرتـووە کـە دەفەرموێ ﴿وصد عن السبيل﴾، جا ئەوەی کە فیرعەن لـە تێڕوانینیا هـەبووە ئـەو ڕێگـە راستە نەبووە کە خوای پێ بناسرێتەوە، بەڵکو لە ڕێگەیەکی هەڵەوە بووە.

٤-ستەم: لە ئایەتێکی پیرۆزی تردا پـەروەردگار ئەمـەمان بـۆ روون دەکاتـەوە کـە یەهوود ئەم داوایەیان بـەهۆی زوڵـمو سـتەمەوە بـەرز کـردەوەو دەربـڕی، کـە دەفـەرموێ: ﴿وإذ قلتم يا موسى لن نؤمن حتى نرى الله جهرة فأخذتكم الصاعقـــة وأنتـــم تنظـــرون﴾ البقرة/٥٥ واته: و ئەو دەمە کـە وتتـان: ئـەی موسـا ! هـەرگیز بـڕوا بـەتۆ نـاهێنین، تـا بـە ئاشکرا خوا نەبینین، جا لەو دەمەدا هەورە بریسکە (لـە ئێـوەی داو) ئێـوەی گـرتو ئێـوە تەماشاتان دەکرد. یان لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: ﴿فقد سألوا موسى أكبر من ذلـــك، فقالوا: أرنا الله جهرة فأخذتهم الصاعقة بظلمهم﴾ النساء/١٥٣، واتـە: جـا ئەوانـە گـەورەتر لەمەیان لە موسا ویست جا وتیان بە ئاشکرا خوامان نیشان بدە (بەم قسەیە ستەمیان لـە خۆیان کرد) جا لەبەر ئەم ستەمەشیان، هەورە تریشقە ئەوانی گرت.

وەك چۆن ئایەتی یەکەم بە شێوەیەکی نـاواخندارو شـاراوە وەڵامـی نموونـەی ئـەو کەسانەی دایەوە، ئا لێرەدا هۆشیارمان دەکاتەوە لە وەڵامدانەوەیان بە وشەی ﴿بظلمهم﴾ چونکـە دادو راسـتی وای لێ نـەکردوون ئـەم داوایـە دەربـبڕن، بـەڵکو سـتەم کردنیـان ئـەم داوایەی دروسـت کـردووە، سـتەمی دەروونـەکان بـۆ حـەق کـە راسـتی دەزانـنو نکۆڵـی لێ دەکەن. وەك چۆن ئەمڕۆ قسەی بێ باوەڕان لەم حاڵەدا یەکانگیر دەبێت، ئاوهـاش هـێرش کردنیان لەمڕۆدا هاوتای هێرشەکانی رابردوویـان دەبێتـەوە.. قورئـانی پـیرۆز بەسـەرهاتی هێرشەکانیان دەردەبڕێو دەفەرموێ: ﴿قال ربي يعلم القـــول في الســـماء والأرض وهـــو

السميع العليم، بل قالوا أضغاث أحلام، بل افتراه، بل هو شاعر﴾ الأنبياء/٤-٥ واته: (بەڵام پێغەمبەر) فەرمووی: پەروەردگاری من هەموو قسەیەك چ لە ئاسمان‌و چ لە زەوی بێ، ئەیزانێ، هەر ئەویشە زۆر ژنەواو زانا، ئەوانە وتیان: نا (ئەوەی موحەممەد هێناویەتی وەحی نیە) بەڵکو خەوی هاشەو پاشەیە، بەڵکو بە درۆ ئەوانە بەدەم خواوە هەڵدەبەستێ تا بەڵکو ئەو هەستیارێکە!.

ئەمانە بڕوادارانیان بەمە تاوانبار دەکرد کە شوێنی خەیاڵات کەوتوون‌و درۆزنن‌و سادەو عاتیفین... هەرچی بێ باوەڕەکانی ئەمڕۆشن ئەوا باوەڕداران بەوە تاوانبار دەکەن کە:- دژە زانستن‌و راست ناکەن‌و سەرلێتێکچووو خەڵەتاوون.

جا گەر کەسانێکی زۆر لەسەر ئەو ڕێیە بن ئەوا موسوڵمانی خاوەن دڵی مەزن نابێت شوێنی ئەو گومڕایانە بکەوێت، تا تووشی ئەوە نەبێت کە پەروەردگار ئاگاداری کردووەتەوە لەو بارەیەوە ﴿أم تريدون أن تسألوا رسولكم كما سئل موسى من قبل، ومن يبدل الكفر بالإيمان فقد ضل سواء السبيل﴾ البقرة/١٠٨.واتە: یا ئەتانەوێ لەگەڵ پێغەمبەری خۆتانا هەر ئەو داخوازییە بهێننە گۆڕێ کە بەر لەمە، لەگەڵ موسادا هێناتانە گۆڕێ؟ کەسێ کە بڕوا بگۆڕێتەوە بە کوفر، جا ئەوە رێگای راستی ون کردووە.

**٢- رێگای بەرەو خوا چوون: ئایەت و نیشانەکانی:**

کەواتە ئەو رێگایانەی کە باسمان کردن نامانگەیەننە مەبەستەکانمان لە بابەت زاتی پەروەردگارەوە، چونکە دەست نیشان کردنی رێگەو زانینی، بنەمایەکی گرنگە بۆ گەیشتنە ئامانج... گەیشتن بە پەروەردگار گرتنە بەری ئەو شوێنەوارەیە کە ئاماژەی پێ دەدات‌و ئاکە رێگەشە، جا بۆ کەسێك بیەوێت ئەم رێگەیە بگرێت‌بوونی مەرجەکانی ژیریی‌و بیرو زانست تێیدا زۆر سەرەکی‌و گرنگە.

چونکە بەبێ ژیریی ناتوانین نیشانەو ئایەتەکان بناسینەوە، بەبێ بیر کردنەوەش خاوەنەکەی ناناسرێتەوە، بەبێ زانیاریش ناتوانین ئایەتەکان تێبگەین‌و خاوەنەکەی

بناسین، رەنگە ئەم قسەیە لای بێ باوەڕان نامۆ بێت، چونکە هەمیشە نازنـاوی عیلمـانییەن‌و عەقلانییەن‌و ئازادی خواهان‌و هزرمەندان دەدەنە پاڵ خۆیان. بـەڵام بانگەوازی بـێ بەڵگـە! هیچ نرخ‌و بەهایەکی زانستی نیە.

جا ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیـەدا دەیخەینـە روو- بـە ویسـتی پـەروەردگار- تـەواوو دروست دەبێت،و رووخاندنی بانگێژی بێ باوەڕان دەبێت ﴿والذين يحاجون في الله من بعـد ما استجيب له حجتهم داحضة﴾ الشورى/١٦.واتە: و کەسانێ کە لە بابـەت (دینی) خـواوە شـەڕە قسـە دەکـەن، دوای ئـەوەی بانگهێشـتنی ئـەویان قبـوڵ کـردووە، بەڵگـەیان لای پەروەردگاریان پووچ‌و بێ کەڵکە.

بەرەو دوا لەم باسەدا روونکردنەوەی ئەم باسەت پێشکەش دەکرێت.

بەڵام ئێستا پێویستە بڵێین: کەسێك کەمێك لە قورئان رابمێنێت، بۆی دەرئەکەوێت سەرنجی مرۆڤ بۆ شێوەیەکی روون‌و ئاشکرا رادەکێشێت، بەجۆرێك فراوانی بە ژیری بـیرو زانست‌و شوێنەوارو جێماوەکـان (الآثار) دەبەخشـێت، ئەمـەش مـەرجێکی سـەرەکییە بـۆ ناسینی خوداوەندی مەزن بە شێوەیەکی ئاسان‌و روون‌و ئاشکرا ﴿قل أرأيتم ما تدعون مـن دون الله أروني ماذا خلقوا من الأرض، أم لهم شرك في السموات، أئتوني بكتاب من قبل هـذا أو أثارة من علم إن كنتم صادقين﴾ الأحقاف/٤، واتە: بڵێ: ئایا دیوتانە ئەوانەی کە بێجگـە لە (ﷲ) بانگی دەکەن بە منی نیشان بدەن چییـان لـە ئـەرزدا خولقـاندووە؟ یـا لەبـەدی هێنانی ئاسمانـەکاندا چ بەشدارییەکییان هـەبووە؟ کتێبـێ کـە بـەر لـە قورئـان هـاتووە یـا شوێنەواری عیلمیێ لە رابردووان بۆ من بێنن ئەگەر راست بێـژن (تابەڵگـەی راسـت بێژیتـان بێ).

بەواتایەکی تر ئایا هیچ گەردێك لە زانست‌و زانیاری گەواهی لەسەر ئەوە ئەدات کە هیچ بەدیهێنەرێکی تر هەبێت جگـە لـە (ﷲ)، جـا کـاتێك خـەڵکی نکۆڵـی پـەروەردگاریان بکەن ئەمە بەڵگە نیە لەسەر بوونی زانیاری لـەو نکۆڵـی کردنـە، بـەڵکو بەڵگـەی نەزانینـە، ﴿ومن الناس من يجادل في الله بغير علم، ولا هدىً ولا كتاب منير﴾ الحج/٨، واتە: و لە نـاو

خەڵكدا كەسانێك هەن كە لە بابەت خـواوە بـێ هیـچ زانسـتو ڕێنوێنـیو كتێبێكـی ڕوونـاك موجادەلەو قرە دەكەن.

بەڵام نەزانینێكی ڕەهای ڕامالڕاو نیـە لـە هیـچ مەعریفـەتێك، بـەڵكو زانینێكـە لـە جۆرێكی تایبەت كە پەروەردگار بەم جۆرە باسی دەكات ﴿يعلمون ظاهراً من الحياة الدنيـــا وهم عن الآخرة هم غافلون﴾ الروم/٧، واتە: ئەوانە تەنیا ڕواڵەتێ لە ژیانی دنیا دەزانن‌و لە ئاخیرەت غافڵن. ﴿فأعرض عن من تولى عنْ ذكرنا ولم يرد إلا الحياة الدنيا. ذلك مبلغهم من العلم﴾ النجم/٢٩-٣٠. واتە: جا كەوایە لەوانەی كە لە یادی ئێمە مل دەسوڕێنن‌و بێجگە لە ژیانی دنیا شتی تریان ناوێ خۆ لادە، ئەمە دوا پلەی ئاگاداری ئەوانە.

دووبارە كردنەوەی وشەكانی زانیاری‌و بیرو ژیری لە قورئانی پیرۆزدا دیاردەیـەكی سەرنج ڕاكێش‌و ئاشكرایە ﴿إن في ذلك لآية لقوم يعقلون﴾ الرعد/٤، واتە: بەڕاستی لەمــەدا نیشانە گەلێك هەیە بۆ ئەوانە ئەقڵی خۆیان دەخەنە كار. ﴿إن في ذلك لآية لقوم يعلمـون﴾ النمل/٥٢، واتە: بەڕاستی لەمەدا نیشانەیەكی ڕوون هەیـە بـۆ ئەوانـەی ئاگـادارن (تـا پـەند بگرن) ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون﴾ النحل/١١، واتە: بەڕاستی لەمــەدا نیشـانەیەكی ڕوون هەیە بۆ هۆزێ كە بیر دەكەنەوە. ﴿إن في ذلك لآيـــات للعـــالمين﴾ الـروم/٢٢، واتـە: بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك بۆ جیهانیان هەیە. ﴿قل انظروا ماذا في السموات والأرض﴾ یونس/١٠١، واتە: بڵێ: بڕواننە ئەوەی وا لە ئاسمانەكان‌و زەویدایە.

كەسێك لە قورئان ڕابمێنێت بۆی دەردەكەوێت كـە ئـاییني پـیرۆزی ئیسـلام لەسـەر موسوڵمانانی فەرز دەكات كە بیر بكەنەوەو فـێر بـبن، چونكـە زانسـتو بـیر كردنـەوە دوو بەشـی سـەرەكین لـە پێكـهێنانی كەسـایەتی موسـوڵمان، لـە كـاتێكدا ئـەم دوو شـتـە لای خەڵكانی تر جگە لە موسوڵمان حەزێكە بۆ چێژو خۆ خەریك كردن بەكار دێت... یـان وەك دەروازەیەك بۆ گوزەران بەڕێ كردن، یان لای هەندێكی تر ئـارەزووە، بـەڵام ئیسـلام بۆیـە زانست فەرز دەكات چونكـە بـە هـۆی زانسـتەوە بۆمـان دەردەكـەوێت كـە ئیسـلام ڕاستە

﴿ويرى الذين أوتوا العلم الذي أنزل إليك من ربك هو الحق﴾ سبأ/٦، واتـه: ئەوانـەی کـە زانستیان هەیە ئەزانن ئەوەی کە لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتووە ئەوە هەقە.

لە لاپـەڕەکانی داهـاتوودا بـە پشـتیوانی خـوا لـە بەڵگـەو نیشـانەکانی پـەروەردگار دەکۆڵینەوە تا راستییە روون‌و دیارەکانمان بۆ ئاشکرا بێت، ئەو راستییەی دەفەرموێ بـێ باوەڕان بە خوای گەورە دڵیان گومڕایە ئەگەر رێی پەروەردگاریان نەگرتە بەر، وبڕواداران دڵیان رێنووما بووەو رێی هیدایەتی پەروەردگاریان گرتۆتە بەر ﴿ومن يؤمن بـــالله يـــهد قلبه﴾ التغابن/١١، واتە: و هەر کەسێ کە بڕوا بـە خـوا بێنـێ خـوا دڵ‌و دەروونـی رێنوێنـی ئەکا. جا نموونەی بێ باوەڕێك بـە ژێـری بـڕوای بە خـوا نـەهێنابێ دوای ئـەوەی نیشـانەو بەڵگەکانی بینیوە، وەك نموونەی ئەو کەسـە وایـە کـە بـارەکتێبێکی هـەڵگرتووەو نرخیـان نازانێت‌و دانەرەکانیشیان ناناسێت‌و بۆیـە ئەیداتـە پـاڵ نەناسـراوو نـەبوو... هـەروەها بـە پشتیوانی خوا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە نە کەمی ئایەتەکان‌و نە ئاڵۆزییان هۆ نین بۆ بە کافر بوونی خەڵکی، بەڵکو ئایەتـەکانی خـوا هێنـدە زۆرن نایەنـە هـەژماردن، هێنـدەش رونـن لای کـەس ناشـاردرێنەوە، بـەڵام نهێنیەکە لـە خـودی مرۆڤ دایـە، نهێنیەکـە لـە پشتهەڵکردنی مرۆڤەکەدایە لە نیشانەکانی خوای گەورە، لە خۆ بـەزل زانـین دایە لـە دان نەنان بە راستیدا، لە نەناسینی حەقیقەتدایە، لە لادان دایە لـە فیطـرەی رێکـی مرۆڤایـەتی وخوورەوشتی پەسەند، بەڕادەیەك وای لێ دێت دڵـی دادەخـرێ‌و کوێـر دەبێتـەوە، تەنانـەت ئـەو کەسـانە بـە جۆرێکـن گـەر دەسـتی قودرەتـی خـودا بـە شـێوەیەکی سەراسـیمەش بیانجوولێنێ هەر لەسەر نکۆڵی خۆیان سوور دەبن.

قورئانی پیرۆز سەبارەت بەوانە بۆمان دەدوێت ﴿ولو فتحنا عليهم باباً من الســـماء فظلوا فيه يعرجون لقالوا إنما سكرت أبصارنا بل نحن قوم مسحورون﴾ الحجر/١٤-١٥. واتە: و ئەگەر دەرگایەك لە ئاسمانەوە بۆ ئەوان بکەینەوەو ئەوانە بـەوێدا بڕۆنـە سـەرێ پێمـان دەڵێن: بەرچاومان گیرابوو؟ بەڵکو ئێمە (سەر تا پێ) سیحراوی بووین! !. ﴿وإن يروا آيــة يعرضوا، ويقولوا سحرٌ مستمر﴾ القمر/٢، واتـە: و ئەگـەر نیشـانە (و کشـگیر: معجـزە)یـەك

ببينن روو دەسوڕێنن‌و دەڵێن: جادوێکی هەمیشەییە. ﴿وكأين مــن آيــةٍ في الســموات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون﴾ يوسـف/١٠٥. واتـه: و چـەند زۆرن نيشـانەكانى (خوا) لە ئاسمانەكان‌و زەويدا كە ئەوانە بەلايدا ئەڕۆن‌و رووى لێ وەردەگێڕن!.

جێى خۆيەتى پێش ئەوەى ئايەتەكان بخەينە روو چەند پرسيارێك بكەين:

ئايا پەروەرگار پێويستى بە ئێمەيە تا بەندايەتى بكـەين‌و بـڕواى پـێ بـهێنين؟ يـان ئێمە ئاتاجى ئەوەين كە بڕواى پێ بهێنين لە پێناو خۆمان دا؟ ﴿إن الله لغنيٌ عن العــالمين﴾ العنكبوت/٦، واته: خوا لە هەموو جيهانيان بێ نيازە.

كەواتە با دەروونمان رزگار بكەين تا شايستەى بينينى نيشـانەو ئايەتـەكانى خـواى گەورە بين:-

١- لەخۆبەزل زانينەوە: پەروەردگار ئايەتەكانى خـۆى نيشـانى دڵێكـى خۆبـەزلزان نادات ﴿سأصرف عن آياتيَ الذين يتكبرون في الأرض بغير الحق، وإن يروا كل آية لا يؤمنــوا بها، وإن يروا سبيل الرشد لا يتخذوه سبيلاً، وإن يروا سبيل الغي يتخذوه سبيلاً، ذلك بــأنهم كذبوا بآياتنا وكانوا عنها غافلين﴾ الأعراف/١٤٦. واته: كەسانێ كە لە زەوى بە ناهەق خـۆ بە زل ئەزانن لە نيشانەكانى خۆم لايان ئەدەم، ئەگەر هەر جۆرە نيشـانەيەك ببينـن بـڕواى پێ ناهێنن‌و ئەگەر رێگاى هيدايەت ببينن، پێيدا نـاڕۆن‌و نايكەنـە رێگـاى خۆيـان،و ئەگـەر رێگاى خوار (و خراپ) ببينن پێيدا ئەڕۆن (هەموو ئەمانـە) لەبـەر ئەوەيـە كـە نيشـانەكانى ئێمەيان بەدرۆ دەخستەوەو لەوە غافڵ بوون.

٢- دەبا دەروونيشمان لە ستەم كردن‌و درۆ قوتار بكەين ﴿والله لا يــهدي القــوم الظالمين﴾ الصف/٧، واته: خوا هۆزى ستەمكار رێنوێنى ناكات. ﴿إن الله لا يهدي من هــو كاذب كفّار﴾ الزمـر/٣. واتـه: بەڕاسـتى خـوا كەسـێ كـە درۆزنـى ناسـوپاس بـێ رێنوێنـى ناكات.

٣-و با خۆمان لە خراپەكارى لەسەر زەوى‌و پەيمان شكاندن‌و پەيوەندى پچڕانــدن رزگار بكەين كە پێويستە نەيپچڕێنين‌و بيهێڵينەوە ﴿وما يضل بــه إلا الفاســقين، الذيــن

ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه ويقطعون ما أمر الله به أن يوصـــــل، ويفســـدون في الأرض أولئك هم الخاسرون﴾ البقرة/٢٦-٢٧. واته: و خوا بەو (مسەلە) کەس گومڕا ناکا، مەگەر فاسقان نەبێ (فاسقان) ئەمانەی کە پەیمانی خوا دوای مەحکەم گرێ دان، ئەپسێنن،و پێوەندێك کە خوا فەرمانی پێ دابوو، ئەبڕن،و لە رووی زەویدا فەساد ئەکەن هەر ئەمانەش لە زەرەرو زیاندان.

٤-و با خۆمان لە بێ ئاگایی وغەفڵەت دەرباز کەین: ئەگەر بمانەوێت هەموو ئایەتەکانی پەروەردگارمان بۆ ئاشکرا بێت، ئەوا هەندێك لە ئایەتەکان تەنیا بە هزرو فیکرەوە بۆمان روون دەبێتەوە گەر رێگرێکیان لەبەردەمدا نەبێت، و هەندێکی تریان بە هۆی ژیرییەوە بۆمان دەردەکەوێت، نموونەی ئەمانەش ئایەتەکانی قورئانن کە پەروەردگار سەبارەتیان دەفەرموێ: ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يتفكـــرون﴾ الرعد/٣، واتە: بەڕاستی لەمانەدا نیشانەگەلێك هەیە بۆ ئەوانەی بیری لێدەکەنەوە ﴿إن في ذلك لقـــوم يعقلـــون﴾ الرعد/٤. واتە: بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك هەیە بۆ ئەوانەی ئەقڵی خۆیان دەخەنە کار.

بەڵام سەرجەم ئایەتەکانی خوا بۆ دڵێـك دەرناکەوێت گەر لە خاوەنەکەیدا بیرکردنەوەو یادی خوای(فکرو ذکر)ی تیا کۆنەبووبێتەوە﴿إن في خلق الســـموات والأرض واختلاف الليلو النهار لآيات لأولي الألباب، الذين يذكرون الله قياماًو قعوداً وعلى جنوبهـــم ويتفكرون في خلق السموات والأرض﴾ آل عمران/١٩٠-١٩١.واتە: بەڕاستی لە بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویداو هاتووچۆی شەو ورۆژدا، بۆ ژیرو خاوەن ئاوەزان نیشانەن، کەسانێ کە بەڕاوەستانو دانیشتنو بەڕاکشانەوە یادو زیکری خوا ئەکەن بیر لە بەدی هێنانی ئاسمانەکانو زەوی دەکەنەوە.

بەربەستیش لە نێوان هەر کەسێكو پەروەردگارا دروست نەبووە بەهۆی غەفڵەتو بێ ئاگاییەوە نەبووبێت، هەموو غەفڵەتێکیش لە گەمەو ئارەزووەوە بەرپا دەبێت، ژیانی دنیاش هەمووی گەمەو ئارەزووە ﴿إنما الحياة الدنيا لعب ولهـو﴾محمد/٣٦، واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دنیایە تەنیا کایەو خۆ خەریك کردنە ئەگەر بڕوا بێننو خۆپارێز بن. ﴿إقـــترب

للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون، ما يأتيهم من ذكر من ربهم محدث إلا استمعوه وهـــم يلعبون، لاهية قلوبهم﴾ الأنبياء/١-٣. واته: زەمانی لێپرسینەوە نێزیك بۆتەوە، بەڵام ئەوان لە غەفڵەت دانو روو سوڕێنەرنو هیچ یاداوەری تازەیان لە لای پەروەردگاریانەوە بۆ نایـێ، مەگەر گوێی بۆ رادەگرنو گاڵتەی پێ دەکەن لە حاڵێکدا کە دڵو دەروونیان لە بێ ئاگایی دایە.

٥- دەبا خۆشمان لە تاوانکاری دوور خەینەوە ﴿كلا بل ران على قلوبهم ما كـــانوا يكسبون﴾ المطففين/١٤.. واتە: وا نیە کە ئەوان بـیری لێ دەکەنـەوە، بـەڵکو بـە هەقیقـەت کردەوەیان هەر وەکو ژەنگ دڵو دەروونی گرتوون. ﴿كذلك نسلكه في قلوب المجرمــين، لا يؤمنون به وقد خلت سنة الأولين﴾ الحجر/١٢-١٣. واتە: ئا بەم جۆرە، رێگـای قورئـان بـۆ نـاو دڵو دەروونـی تاوانبـاران دەکەینـەوە (بـەم حاڵەشـەوە) ئەوانـە بـڕوا بـەو (قورئـان)ە ناهێننو بە هەقیقەت رەوشتی هۆزەکانی بەر ویش هەر وا بووە.

٦-و با دەروونمان لە ڕاڕایی لە وەرگرتنی حـەق دوور خەینـەوە گـەر بـە راشـکاوی بۆمان دەرکەوت: ﴿ونقلب أفئدتهم وأبصارهم كما لم يؤمنوا به أول مرة، ونذرهم في طغيانهم يعمهون﴾ الأنعام/١١٠ . واتە: و ئێمە دڵو چاویان وەردەگێڕین هەروەکو لە یەکەمجاریشـدا بڕوایان بەمە نەهێنا،و ئەوانە لە ناو گێژاوی خۆیـان وێـڵ دەکـەین تـا بـێ (پشـتیوان) هـەر بسوڕێنو گێژ بخۆن.

ئیتر لەم کاتەدا ئایەتەکانی خوداوەند لە پرشنگدانو هەڵهاتندا دەبنو سەرانســەری دڵ ئەتەنن، پاش ئەمە ئامادەیی دەبێ بۆ وەرگرتنی نوورو رووناکی، بـەڵام هـەرگیز دڵێکـی شەیتانی شایستەی وەرگرتنی هیدایـەتی پـەروەردگار نـابێت. چونکـە تـەمو گومـان رێگـر دەبێت لە پەخشی رووناکی، هـەروەها ناتەواوییـەك لـە چـاودا رێگـر دەبێـت بـۆ بینـین..و بوونی نەخۆشی لە گوێدا رێ لە بیستن دەگرێ، ئاوی فوراتیش هیـچ تـاوانێكو خەتایـەکی نیە،لە دەمی مرۆڤی نەخۆشدا تاڵ بێت ﴿يا أيها الرسول لا يحزنك الذيـــن يســـارعون في الكفر من الذين قالوا آمنّا بأفواههم ولم تؤمن قلوبهم، ومن الذين هادوا سمّـــاعون للكـــذب،

سمّاعون لقوم آخرين، لم يأتوك يحرفون الكلم من بعد مواضعه، يقولون إن أوتيتم هذا فخـذوه وإن لم تؤتوه فاحذروا، ومن يرد الله فتنة فلن تملك له من الله شيئاً، أولئك الذين لم يرد الله أن يطهر قلوبهم، لهم في الدنيا خزي ولهم في الآخرة عذاب عظيـــم﴾ المـائدة/٤١، واتـه: ئـەی پێغەمبەر! کەسانێ کە بۆ کوفر بەلەز پێش دەکەون، تۆ خەفەتبار نەکەن، لـەو کەسـانەی کە بەدەمو زوبان دەڵێن: بڕوامان هێناوەو (کەچی) بەدڵ بڕوایان نەهێناوە، (هەروەها) لەو کەسانەی کە بوونەتە جولەکە، کە زۆر گوێ لە تۆ دەگرن تا بەڵگەت لێ بدۆزنەوەو بە درۆت بخەنەوە، ئەوانە جاسوسی هۆزێکی ترن کە خۆیان نەهاتوونەتە لای تۆ، کەسانێ کە جێگا گۆڕکێ بە واژە دەکەنو واتاکانی دەگۆڕنو (بەو جاسوسـانە) دەڵێـن ئەگـەر (وەك ئـەوەی ئێمە وتومانە) پێتان درا (موحەممەد بە ویسـتی ئێـوە داوەری کـرد) وەری گـرن،و ئەگـەر ئەمەیان پێ نەدان دووری لێ بکەنو هەر کەس کە خوا بیەوێ تاقی کاتـەوەو (سـزای بـدا)، هەرگیز تۆ لە لایـەن خـواوە کارێکت بـۆ ئـەو لەدەسـت نایـە، ئەوانـە کەسـانێکن کـە خـوا نەیویستووە دڵو دەروونیان پاك بکاتەوە، بۆ ئەوان لە دنیادا پەستیو روو رەشی هەیـە،و لە ئاخیرەتیشدا عەزابی گەورەیان بۆ هەیە.

کەواتە هەمیشە نهێنیەکە لە خودی مرۆڤدایە ﴿فلمـــا زاغــوا أزاغ الله قلوبهـــم﴾ الصف/٥، واتە: جا کاتێ ئەوانە لە هەق لایاندا، خـوا دڵو دەروونـی ئـەوانی لـە حـەق کـلا کرد.

بەڵام ئایەتەکانی پەوەردگار روونو ئاشکران ﴿وكذلك نفصل الآيات ولتســـتبين سبيل المجرمين﴾ الأنعام/٥٥، واتە: ئا بەم جۆرە ئایەتی خۆمان جیاجیا روون دەکەینەوە تـا رێگای گوناحکاران بە ئاشکرا دەرکەوێ.

ئایەتەکانی پەروەردگاریش لە سێ شێوەدا دەبینرێن:

١- گەردوون ٢- قورئان ٣- موعجیزەو کەرامات.قورئانی پیرۆزیش باسی ئەم سێ شتەی کردووە وەك نیشانەی رێپیشاندان:

**گەردوون:** ﴿وفي الأرض آيات للموقنين، وفي أنفسكم أفلا تبصرون﴾ الذاريات/٢٠-٢١، واتە: و بۆ یەقین داران لە زەویدا نیشانەو پەندگەلێ هەیە،و لە وجودی خۆتاندا (نیشانە هەیە)، ئایا نابینن (و بیر ناکەنەوە). ﴿وكأين من آية في السماوات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون﴾ يوسف/١٠٥، واتە: و چەن زۆر نیشانەکانی (خوا) لە ئاسمانەکانو زەویدا کە ئەوانە بەلای ئەڕۆنو ڕووی لێ وەردەگێڕن!. ﴿وآية لهم الليل نسلخ منه النهار فإذا هم مظلمون والشمس تجري لمستقر لها ذلك تقدير العزيز العليم والقمر قدرناه منازل حتى عاد كالعرجون القديم﴾ يس/٣٧-٣٩، واتە: شەویش بۆ ئەوان نیشانەو پەندی ترە کە ڕۆژی لێ دەردەکێشن، جا لە ناکاو تاریکی داگری هەموویانە،و خۆریش بەرەو بنکەی خۆی دەڕوا، ئەمەیە فرمانی خوای عەزیزو زانا و بۆ مانگیش قۆناغگەلمان داناوە (دوای بڕینی ئەو قۆناغانە)، سەرەنجام بە وێنەی شاخەی ویشکی کونی خورما (کەوانی شکلو زەرد) دەگەڕێتەوەو دەبێتە دەمە داس. ﴿ومن آياته خلق السماوات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم إن في ذلك لآيات للعالمين ومن آياته منامكم بالليل والنهار وابتغاؤكم من فضله﴾الروم/٢٢-٢٣. واتە: و لە نیشانەکانی ئەوە بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویو تەفاوتو جیاوازی زمانەکانتانو ڕەنگەکانتان، بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك هەیە بۆ تاقمێ کە گوێیان ژنەوایە،و لەنیشانەکانی ئەوە خەوتنی ئێوە بەشەوو ڕۆژو کارو کۆششتان (لەو ڕۆژا) بۆ کەلك وەرگرتن لە فەزڵی ئەو.

**قورئان:** ﴿وقالوا لولا أنزل عليه آيات من ربه قل إنما الآيات عند الله وإنما أنا نذير مبين، أولم يكفهم أنا أنزلنا عليك الكتاب يتلى عليهم﴾العنكبوت/٥٠-٥١، واتە: و وتیان: چ دەبوو نیشانەکانی لە پەروەردگاریەوە بۆ هاتبا؟ بڵێ: بە هەقیقەت نیشانەکان تەنیا لای خوانو بەڕاستی من ترسێنەرێکی ئاشکرام، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە کە کتێبمان بۆ ناردووی بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە. ﴿بل هو آيات بينات في صدور الذين أوتوا العلم﴾العنكبوت/٤٩، واتە: بەڵکو قورئان نیشانەکانی ڕوونە کە لەنێو دڵو دەروونی زانایان دایە. ﴿وكيف تكفرون وأنتم تتلى عليكم آيات الله﴾ آل عمران/١٠١، واتە: چلۆن کافر ئەبن، لە حاڵێکدا ئایەتی خوا بەسەر ئێوەدا ئەخوێندرێتەوە.

**موعجیزەكان:** ﴿وفيكم رسوله﴾ آل عمران/١٠١ واتە: و پێغەمبەری ئەو لەنێو ئێوە دایە؟ ﴿اقتربت الساعة وانشق القمر وإن يروا آية يعرضوا ويقولوا سحر مستمر﴾ القمر/١-٢، واتە: قیامەت نێزیك بۆتەوەو هەیڤ لەت دەبێ،و ئەگەر نیشانە (و كشكێر: موعجیزە) یەك ببینن روو دەسوڕێننو دەڵێن: جادویەكی هەمیشەییە. ﴿ويا قوم هذه ناقة الله لكم آية﴾هود/٦٤، واتە: و ئەی هۆزی من! ئەمە حوشتری خوایە كە بۆ ئێوە نیشانەیەكە. ﴿ورسولا إلى بني إسرائيل، أني قد جئتكم بآية من ربكم، أني أخلق لكم من الطين كهيئة الطير فأنفخ فيه فيكون طيرا بإذن الله، وأبرئ الأكمه والأبرص، وأحي الموتى بإذن الله، وأنبئكم بما تأكلون وما تدخرون في بيوتكم، إن في ذلك لآية لكم إن كنتم مؤمنين﴾ آل عمران/٤٩ واتە: و ئەو (عیسا)ی (بەناوی) رەسول بۆ لای بەنی ئیسرائیل (نارد، تا پێیان بڵێ) من نیشانەیەكم لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هێناوە، من لەگڵ شتێ وەكو باڵندە دروست ئەكەمو لە پاشان فوی تێ ئەكەم،و بە فەرمانی خوا ئەبێتە باڵندەیەك،و كوێری زگماكیو بەڵەك چاك ئەكەمەوەو مردوو بە ئیزنی خوا زیندوو ئەكەمەوەو، و لەوەی ئەیخۆنو یان لە ماڵدا ئازوخەی دەكەن (ئاگادارمو) خەبەرتان ئەدەمێ، بەڕاستی لەمانەدا نیشانەیەك بۆ ئێوە هەیە، ئەگەر بڕوادار بن.

دەقەكانی قورئان روونی دەكاتەوە كە لە گەردووندا چەندەها ئایەتی تێدایە نەك بە تەنیا ئایەتێك، هەروەها لە قورئانیشدا چەندەها نیشانەو بەڵگەی تێدایە نەك بە تەنیا یەكێك.

دەیان دیاردە لە گەردووندا هەیەو هەر یەكەیان ئاماژەی ناسینی خودامان بۆ دەكەن، دەیان دیاردەش لە قورئانی پیرۆزدا هەن، كە هەر ئایەتێك بەسە بۆ بەڵگەهێنان بۆ (اللَّهُ) جل جلاله، موعجیزەكانیش كە دیاردەی مێژوویین، هەر دیاردەیەكیان بەسە بۆ ئەوەی خوای پێ بدۆزینەوە، لە هەر دیاردەیەكیشدا هەزاران ئاماژەی تێدایە كە دەمانگەیەنێتەوە (اللَّهُ)جل جلاله، خوداوەند بەڵگەی تەواوی لەسەر ئادەمیزاد هێناوەتەوە ﴿رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل﴾النساء/١٦٥، واتە: كە پێغەمبەرانێ مزگێنیدەرو ترسێنەر بوون تا بۆ خەڵك دوای

ناردنی ئەم پێغەمبەرانە بەڵگەو بیانویەك نەمێنێ. ﴿قالوا أولم تك تأتيكم رسلكم بالبينـات، قالوا: بلى، قالوا: فادعوا وما دعاء الكافرين إلاّ في ضلال﴾(المؤمن) غافر/٥٠، واتە: جا لەم دەرفەتەدا نیشانەو بەڵگەو ئایەتەکانی پەروەدگار لـە گـەردووندا دەخەینـە روو، بـەجۆرێك تیـایدا بەڵگـە لەسـەر هـەموو بێبـاوەڕو مووچـیڕو کەللـەڕەقێك دەهێنینـەوە، بـەوەی پەورەردگار ئامادەیەو بوونی هەیەو خاوەنی هەموو سیفاتی تەواوەتیو شکۆو جوانیەکە.

لە دووەم نامەشدا کە بە ناونیشانی (الرسول)ە، بەشێوەیەکی ناواخنی ئایەتـەکانی پەروەردگارمان لە قورئانو موجیزەی پێغەمبەراندا بۆ دەردەکەوێ، هەر وەك چۆن قورئان خۆی لـە خۆیـدا ئایەتێکـەو ئەمانگەیەنێتـە پـەروەردگار، یـا هـەروەك چـۆن موجـیزە بــە شێوەیەکی رەها ئایەتێکە ئەمانگەیەنێتە پەروەردگار، لە هـەمان کـاتداو هـەرواش قورئـان شایەتییە لەسەر ئەوەی کە محمد پێغەمبەری خوایـە، هـەروەها لـە موجیزەکانیشـیدا ئـەو گەواهییە هەن، بۆیـە ئیمـەش ئـەم دوانـەمان دوا خسـتن بـۆ نامـەکانی داهـاتوو کـە تیـایدا راسـتێتی پـەیامی محمـد ﷺ بـە بەڵگـەوە دەسـەلمێنن بـە پشـتیوانی خــوای گەورە، ئێستاش لە دیاردەکانی گەردوونەوە دەست پێ دەکەین کە بەڵگەی پەروەردگارێتی خوای مەزنمان بۆ نیشان دەدات:

# دیاردەی یەکەم

## دیاردەی بەرپابوونی گەردوون

**دیاردەی بەرپابوونی گەردوون، یان پەیدا بوون دوای ئەوەی کە نەبووە!**

یەکەم دیاردە کە ئەمانگەیەنێتە پەروەردگارو بەڵگەیە لەسەر پەروەردگاریێتی (ﷲ) جل جلالە، بریتییە لە رووداناو بەرپابوونی ئەم گەردوونەی کە پێمان دەڵێت بەدیهێنەرێکی هەیە، هەرچەندە زانستیش پێش بکەوێت ئەوا بە شێوەیەکی وردترو قوڵترو زیاتر بەڵگەمان ئەدا بە دەستەوە تا قەناعەت بەم دیاردەیە بکەین، بەڵکو بە هۆی ئەو بەڵگە زۆرەی زانستی لەم رووەوە پێشکەشی کردووین بووەتە حوکمێکی بەڵگە نەویست، چونکە تێکڕایی بەڵگەکان گومانمان لەلا ناهێڵێتەوە، بۆ نموونە یاساکانی گەرمیو یاساکانی ئەلکترۆنو یاساکانی خۆر، هەر یەکەو بەڵگەی ئاشکرای خۆی لەم رووەوە خستۆتە روو، جا بەیەکانگیر بوونی ئەم بەڵگانە، بەجۆرێك مەبەستەکە روون دەبێتەوە کە بواری گومان نەمێنێتەوە، ئەمە جگە لە بەڵگە فیطریو ئەقڵیو بڕاوە (قطعي)یەکان کە پیاوانی خوا هەر یەکەو لە سەردەمی خۆیدا لێی دواون. ئێمەش هەوڵ ئەدەین یەك لە دوای یەك ئەم لایەنانە بخەینە روو، تا بزانین چۆن هەر یەکەو بەڵگەی خۆی دەخاتە روو لەسەر ئەوەی کە ئەم گەردوونە لە دروستکردنی بەدیهێنەرێکی خاوەن توانایە!

١-یاسای گەرمی:

(لیکۆنت دی نوی) سـەرۆکی بەشـی فیزیـای پـەیمانگای باسـتۆر، سـەرۆکی بەشـی فەلسەفە لە زانکۆی سۆربۆن لە کتێبی (چارەنووسی مرۆڤایەتی-مصیر البشریة)دا دەڵێ:

رووبەك لەو روانەی زانستی نوێ سەرکەوتنێکی گەورەی تیا بەدەست هێنا، گـرێ دانـی یاسـای (کـارنوت-کلۆزیـوس)ە -هـەروەها یاسـای دووەمـی ترمۆدینامیکیشـی پـێ دەگووتـرێ- کـە دادەنـرێ بـە کلیلـی تێگەیشـتنمان بـۆ مـاددەی نـازیندوو، -بـەهۆی ئەگەرەکانەوە- زانای فیزیایی بەناوبانگ، (بولتزمان) سەلماندی کە پەرەسەندنی نازیندوو شایستەی پێچەوانە بوونەوە نیە (إنعكاس) کە ئەم یاسایە فەرزی دەکات، زیاتر لەگەڵ گەشەسەندنێکا یەك دەگرێتەوە کە زیاتر بەرەو یەك حاڵـەت دەچـێ و بە سیفەتی زیاد بوونی تناظرو هاوکێشەیی توانا وەسف دەکرێ، بەم جۆرە گەردوون مەیلی تـەوازنی هەیـە بە جۆرێك کە هەموو ناتەناظورە هەبووەکان لەم کاتـەدا دەپووکێنـەوەو هـەموو جوڵـەکان دەوەستن‌و تاریکایی تەواو بەرپا دەبێ.

بـەم جـۆرە (أدوار لوزکیـل) دەربـارەی ئـەم یاسـایە بـە جۆرێـك دەدوێـت کـە دەیچەسپێنێ ئەم گەردوونە سەرەتایەکی هەیە بەم جۆرە:

هەندێك وا گومان دەبەن گەردوون بەدیهێنـەری خۆیـەتی، بـەڵام هـەندێکی تـر وای دەبینین کە بڕوابوون بە ئەزەلـییەت ئاسـانترە لـە بڕوابـوون بـە بوونـی خوایـەکی ئـەزەلی، یاسای دووەمـی دینـامیکی گـەرمی ئـەو رایـە بـە حـەق دادەنـێ، زانسـتەکانیش بـە روون‌و ئاشـکرایی سـەلماندوویانە:رەی تـێ ناچـێ ئـەم گەردوونـە هـــەتا هـــەتایی بێـت، چونکـە گواستنەوەی گەرمی بەردەوامـە لـە تەنـە گەرمەکانـەوە بـۆ تەنـە ساردەکان، پێچەوانـەی ئەمەش بە هێزێکی زاتی نایەتە دی، بەمانایەکی دی گەردوون دەگاتە رادەیەك کە گەرمایی هەموو تەنەکان بگاتە رێژەیەکی یەکسان بەیەك، ئەو کاتەش دەبێتە سەرچاوەی وزە، ئەو کاتـەش کـارلێکی کیمیـاوی‌و سروشـتی روونـادات، وهیـچ شـوێنەوارێکی ژیـانیش لـەم گەردوونەدا نامێنێت، بۆیە دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کـە رەی تـێ نـاچێت ئـەم گەردوونـە

هەتاهەتایی بێت، ئەگەر نا لە مێژبوو وزەکەی لە دەست دەداو هەموو چالاکییەکی بوون دەوەستا، بەم جۆرەو بێ مەبەست زانست گەیشتە ئەو باوەڕەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە بەم پێیەش بوونی خودا دەسەلمێنێ، چونکە شتێك سەرەتای هەبێت رێی تێناچێ خودی خۆی هێنابێتە بوون، بەڵکو دەبێ سەرەتاسازێکی هەبێت، یان جوڵێنەری یەکەم، یاخود ئەو بەدیهێنەرەی کە خوداوەندە.

هەروەها (فرانك آلان)ی زانای سروشتی بایۆلۆجی بەڵگەی لەسەر ئەوە هێناوەتەوە کە گەردوون هەتاهەتایی نیە بەپێی ئەم یاسایە، کە دەڵێت: زۆر دەگوترێ ئەم گەردوونە ماددەیە پێویستی بە بەدیهێنەر نیە، بەڵام ئێمە بڕوا بەوە بهێنین کە ئەم گەردوونە بوونی هەیە ئەوا دەپرسین بوونو گەشەی گەردوون چۆن بووە؟ لێرەدا چوار ئەگەرمان بۆ دروست دەبێ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە: یان ئەم گەردوونە وەهمو خەیاڵە، ئەمەش پێچەوانەی هۆ دەوەستێ کە لە سەرەتاوە بڕوامان بە بوونی هێناوە، یان گەردوون لە خۆڕا لە نەبوونەوە هاتووەتەدی، یاخود گەردوون هەتا هەتاییەو دروست بوونی سەرەتای بۆ نیە، یاخود ئەم گەردوونە بەدیهێنەرێکی هەیە.

سەبارەت بە ئەگەری یەکەم هیچ گرفتێکمان پێش ناخات جگە لە گرفتی هەستو شعور، ئەمەش ئەوەیە کە هەست کردنمان بەم گەردوونەو ئەم شتانەی تیایدا روو دەدەن ناکرێت خەیاڵو وەهمبێتو سێبەری راستەقینەیی نەبێت، کەواتە ئەو رایەی کە دەڵێ ئەم گەردوونە بوونێکی کردەیی نیەو تەنیا وێنەیە لە ناخو بیرمان داو ئێمە لە جیهانی خەیاڵدا دەژین ئەمە پێویستی بە گفتوگۆو دەمەقاڵێ ناکات.

سەبارەت بەڕای دووەمیش کە دەڵێ ئەم جیهانە بە ماددەو وزەی ناویەوە لە خۆیەوە لە نەبوون دروست بووە، ئەمە لە رای یەکەم بێ بایەخ ترو سووکترە، کە شایستەی گفتوگۆو تێڕوانین نیە.

رای سێیەمیش کە دەڵێ ئەم گەردوونە هەتا هەتاییەو سەرەتای نیە، لەگەڵ ئەو رایەدا یەکانگیر دەبێت کە دەڵێ ئەم گەردوونە پەروەردگارێکی هەیە، خاڵی

هاوبەشیشیان رەگەزی هەتا هەتاییەکەیەتی، جا ئێمە یان دەبێت سیفەتی ئـەزەلی بدەینـە پـاڵ جیـهانی مـردووی بێ گیـان، یـان دەبـێ بیدەینــە پــاڵ پــەروەردگارێکی زینــدووی بەدیهێنەر، لێرەدا هیچ گرانیەکیش لەسەر بیرمان دروست نابێت کە یەکێك لەم دوو ئەگەرە هەڵبژێرین، بەڵام یاسای دینامیکای گەرمی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کـە رەگـەزی پێکهاتـەی ئەم گەردوونە هێدی هێدی گەرماییەکەی لە دەست دەدا..و بەرەو ئەو رۆژە ئەچێتەوە کـە پلەی گەرما بگاتـە سفری رەهـاو، ئـا لـەم رۆژەشـدا وزە نامێنـێو ژیـان دەوەسـتێ، ئـەو کاتەش هیچ شتێك دادمان نادات،کـاتێك کـە وزە نـەمێنێت پلـەی گـەرمای تەنـەکان بگاتـە سفری رەهاو بە تێپەڕبوونی رۆژگار.. خـۆری گڕ گرتـوو، ئەسـتێرەی پرشـنگدار، زەمینـی دەوڵەمەند بە جۆرەها ژیانی جیاواز هەموو بەڵگەیەکی روونن لەسەر ئـەوەی کـە بنـەڕەتی گەردوونو بناغەکەی پەیوەستە بە کاتێکی دەست نیشان کراوەوە کە لـە سـاتێکی دیـاری کراوەوە دەستی پێ کردبێ. کەواتە لە رووداوەکانەوە رووی داوە، مانـای ئەمـەش ئەمەیـە کە دەبێ رەسەنو بنەمای گەردوون بەدیهێنەرێکی هەتا هەتایی هەبێت، بێ سەرەتا بێـت، زانـاو ئاگـادار بێـت بـە هـەموو شـتێك، بـە توانـاو بـەهێز بێـت بەشـێوەیەکی بـێ سـنوور، دەشبێت ئەم گەردوونە لە دروستکراوی دەستی ئەو بێت.

کەوا بە یاسا دەیسەلمێنێ مادام لە گەردوون گەرمایی هەیە کەواتــە رێی تێنـاچی کە هەتا هەتایی بێت، چونکـە گـەرما بۆخـۆی نایەتـە دی دوای سـارد بوونـەوەی، چونکـە ئەگەر هەتا هەتایی بوایە سارد ئەبوو نەك گەرم.

**٢- یاساکانی جوڵەی ئەلکترۆنی:**

شایـەتیتر لەسـەر ئـەوەی کـە گـەردوون رووداوەو بـەرپا بـووە، ئـەوا لــە هــەموو گەردێکی بوونەوەردا دەیدۆزینەوە، چونکە گەردەکانی بوونەوەر لە پارچە پارچـەو بەشـی کارەبایی سالیبو موجەب پێکهاتووە، کە بە بارگە موجەبـەکان دەگوتـرێ پرۆتـۆن، و بـە بارگەی سالیب دەگوترێ ئەلەکترۆن، هەندێك گەرد زیاد لەمەشی تێدایە کە تەوژمێکی مـام ناوەندییەو پێی دەگوترێ نیترۆن، هەچی نیترۆنو پرۆتۆنە ناوکی گەرد پێکدەهێنن، بەڵام

ئەلکترۆن هەسارە گەڕۆکـەکانی گـەرد دەنوێـنیٚ‌و بـە تیژییـەکی خـێراو بـە جوڵانەوەیـەکی بازنـەیی ئیـهلیلجی دەخولێتـەوە، جا بـەهۆی ئـەم خێراییـە تیـژەی لـە ئـەلکترۆندا هەیـە ئەلکترۆن بە بەردەوامی بەم پێیە دەجولێت. چونکە گـەر ئـەو خولانەوەیـە نەبوایـە ئـەوا پارچەی ناوکەکە پارچە ئەلکترۆنـەکانی رادەکێشا، ئالێرەوە سەرسامی بـەم کارلێکردنـە دێتـە دی، چونکـە لـەم حاڵەتـەدا هەسـارەیەکی وەك گـۆی زەوی لـە قـاڵب‌و قـەبارەی هێلکەیەکدا دەرئەکەویٚ‌و خۆی دەنوێنیٚ، چونکە بۆشایی لە جیـهانی گـەرددا زۆر فراوانـە، وڵــــەتی پارچـەکان زۆر شـوێنێکی بچووك داگیر دەکـەن لـە بۆشـاییی‌و بـڵاوی گـەرد (الـذرة)دا، چونکـە دووری نێوانـی نـاوك‌و ئەلکترۆنـەکانی خـوول خـواردوو بــەدەوریا، وەك دووری نێوان خۆرو هەسارە گەڕۆکەکان وایە بەشێوەیەکی رێژەیی....

لەم کورتە لێکۆڵینەوەی (گەرد)دا ئەم راستییانەمان بۆ ئاشکرا دەبێت:

١- ئـەلکترۆن لـە زۆربـەی گـەردەکانی بوونـدا -گـەر لـە هەمووشـدا نـەبێت- لـە جوڵەیەکی بازنەیی بەردەوام دایە.

٢- هیچ بەڵگەیەك نیە لە بوونەوەردا ئـەوە بسـەلمێنیٚ کـە ئەلکترۆنـەکان حاڵـەت‌و شێوەیەکی تریان هەبوویٚ ئینجا بەم جۆرەی لیٚ هاتبیٚ، ئەگەر حوکمیـش نـەدەین بەسـەر مەحاڵێتیــنی تێڕوانینێکی کۆنی تری ئەم بارە، چونکە گەر وا بوایە ئـەوا پێویستمان بـە کارلێکەریٚ دەبوو کە ئەلەکترۆنەکانی بوون دوای سســتی‌و وەسـتانیان بجووڵاندنایـەو بـەم پێیەش گەردوون دوای تەسکیەکەی بەر فراوانتر دەبوو..

٣- ئـەم گەردوونـە هـەمووی لــەو گەردانــە پێکــهاتووە کــە ئێســتا لەمــەڕ تایبەتمەندییەکانی دواین، بەڵکو لە هـەمان رەگـەزیش پێکهاتووە، ئـەو جوڵەیـەش کـە لـە ئەلکترۆندا دەیبینینەوە لە تەنە ئاسمانیە گەورەکانیشدا هەیەو هەمان شتە.

دوای ئەم راستییانە دەڵێین:

ئەو شتـەی دەخوولێتـەوە دەبێـت خـاڵی سـەرەتای (کـاتی‌و شـوێنی) هـەبێت کـە خوولانەوەکەی لێوە دەست پیٚ کردووە، جا کە ئەلکترۆن‌و تەنەکان هەمووی لە جوڵەیەکی

بازنەیی دابێ، وەك دەردەكەێت ئەم جوڵەیە دەست پێكـردوو (مستأنفة) نـەبووە، كەواتـە دەبێت سەرەتاییەكی زەمەنیو شوێنێكی هەبێت بۆ جوڵەی ئەلكترۆن، ئەم سەرەتایەش لە راستیدا سەرەتای بوونی خوودی گەردەكان بووە، ئا لێرەشدا دەگەینـە ئـەو بەرەنجامـەی كە ئەم گەردوونە سەرەتاو سەرهەڵدانێكی هەبووەو بەدیهێنەرێكیشی هەیە كە لـە نەبوونـە هێناویەتە بوون، چونكە نەبوون بوونی لێ ناكەوێتەوە.

٣- وزەی خۆر:

پێمـان خۆشـە سـەرەتا لـە بابـەت مانـای وشـەی (ئـەزەل)ەوە روون كردنەوەیـەك بدەین، ئەمەش ئەوەیە كە ئەگەر ژمارە (١) دابنێینو لەبەردەمیەوە هێنـدە ژمـارەی سفر دابنێین تا دەگاتە ئۆقیانووسی گۆی زەوی، و ئەو ژمارە گەورەیە گـەر بكـەین بـە سـاڵ ئەوا نزیكە وەك سفر تەماشا بكرێت سەبارەت بە كۆتـایی نـەهاتنو سـەرەتا نـەبوون، هـەر هەمان شێوە ئەگەر ژمارە (١) هێندە سفری لەبەردەمەوە دابنێین لەسەرەتای گەردوونەوە تا كۆتایی، ئەوا ئەم ژمارەیەش تەنیا بەشـێكی كۆتـایی نـەهاتن دەنوێنـێ كـە وەكـو سـفر وایە، ئا بەم جۆرەیە سەبارەت بە مانای هەتا هەتایی.

جا ئەوانـەی كـە دەڵێـن مـاددە هـەر بـووە ئـەوا ئـەم مانایـەی پـێ دەبەخشـن، لـە راستیشدا سەرجەم دیاردەكانی گەردوون پێچەوانەو ناڕاستی ئـەم رایـە دەسـەلمێنن، ئـەم دیاردەیەش كە لێی دەدوێین بە یەكێك لەو دیاردانە دادەنرێت.

ئایا خۆر ئەو وزەیەی لە كوێ دەهێنێـت؟ وچـۆن پارێزگـاری گەرماكـەی دەكـات؟ كاتێكیش دەڵێین خۆر ئـەوا مەبەسـتمان هـەموو ئەسـتێرەكانی ئـەم گەردوونەیـە، چونكـە ئەستێرەكانی ئەم گەردوونە هەمووی خۆرەو بەهۆی دوورییان لێمانەوە بچووك دیارن، ئەم خۆرەی ئێمەش نموونەیەكە لەوە.

ئەو دوو پرسیارەی كە دەرمان بڕی زۆر گرنگن، چونكە خۆرو هەموو خۆرەكان لـە بەخشینێكی بەردەوام دان، هەردەم تیشكی گەرمایی دەبەخشن كە وزەی لە خۆ گرتـووە،

ساڵی ١٩٣٣ پێشانگای شیکاغۆ بە تەواوی رووناك بووەوە بە هۆی کلیلێکی گەورەوە کە بە هۆی تیشکێکی کەمی ئەستێرەی (السماك الرامح)ەوە دەرچوو پێش ٤٠ ساڵ.

کەواتە ئایا هۆی ئەو وزانە چییە لە خۆرەکاندا؛ زیاد لە وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە دادەنێین، بەڵام هیچیان جێی متمانە نین گەر دوا وەڵام نەدەینەوە کە دەڵێت: گەردەکانی ئەم خۆرانە لە ناوەوە تێك دەشکێن کە گەرماییەکی لە رادەبەدەریان لە هەناودایە، جا بەهۆی ئەم تێکشکانە گەورەو بەر فراوانەو بەردەوامە وزەی گەرمی بێ هاوتاو بێنموونە پێك دێت، و ئاشکراشە کاتێك گەرد تێك دەشکێت بەشێك لە پێکهاتەکەی بزر دەکات و ئەم بەشە دەبێتە وزە، واتە هەر رۆژێك بەسەر خۆرێکدا تێ بپەڕێ بەشێك لە پێکهاتەکەی بزر دەکات گەرچی کەمیش بێت، بۆ نموونە خۆر هەر رۆژەی ئەوەندە کیلۆگرام کەم دەکات هەر بەم جۆرەش سەرجەم ئەستێرەکانی تریش..

جا گەر ئەم خۆرانە کۆن و هەر بووبن، ئایا رێی تێ دەچوو بەم جۆرەی ئێستا بوونایە؟ یا خود بە یەکجاری تەواو ئەبوون و کۆتاییان پێ دەهات؟ جا وەك چۆن بۆمان دەرکەوت ئەزەل بریتییە لە هەتاهەتایی، ئێمەش ئەوەمان لە یاد ناچێت کە بەشێك لەو وزەیەی کە خۆر سەرف دەکات دەبێتە ماددە، بەڵام رێژەی ئەم گۆڕانە لە چاو رێژەی نەگۆڕاندا زۆر کەمە وەك رێژەی ئەستێرەکان وان سەبارەت بە ئاسمان. ئەم وتەیەش وەنەبێت لە بەشێکی گەردووندا وابێت و لە بەشێکی تریدا وانەبێت، بەڵکو زۆر جار ئەم هاوتاییە دەبینرێت، بەڵام قسەی ئێمە سەبارەت بە: گەردوونە بە گشتی، چونکە مادام ئاسمان هێندە بەرفراوان و مەزنە، بێگومان بەشێکی زۆر لەو وزەیە بزر دەبێت و نابێتە ماددە، و مادام تاکە تیشکێك هەبێت وای دابنێین بە هیچ ماددەیەك ناکەوێت هەتا دووبارە دروست بوونەوەی بنیات بنرێ بەشێوەیەکی نوێ، ئەوا تێڕوانینی ئەزەلییەت بۆ گەردوون شتێکی مەحاڵە. چونکە تاکە تیشکێك بە درێژایی بوون و ئەزەل بەسە بۆ تەواو کردن و بە پایان گەیاندنی وزەی هەموو گەردوون.

بەڵام سەبارەت ئەوەی بگوترێ گەردوون هەمووی لە بنەڕەتدا وزە بووە،و پاشـان بووەتـە مـاددە،و ئێسـتاش ماددەیـەو دەبێتـەوە وزە، پاشـان دەبێتـەوە مـاددەو بـەم جۆرە... ئـەوا هەڵـەی ئـەم تێڕوانینانـە زۆر ئاشـکرایە، چونکـە کـاتێك وزە دەبێـت! کـە ماددەیەك هەبێت پێکی بـهێنێ، چونکـە وزە پێویسـتی بـە زاتـەو وەك (نـەبوو) وایـە، یـان بەپێی دەربڕینی زانا کۆنەکان: مـاددە نیشـانەیەکە پێویسـتی بـە ناوەڕۆکێکـە کـە تیـایدا دەربکەوێت، بۆ نموونە خۆر کاتێك تیشك دەداتـــە زەوی، گەردەکانی زەوی گەرمابیەکەی وەردەگرن، ئەوسا گەردەکانی زەوی بە وزەی گەرما بارگاوی دەبن، بەڵام لە کاتێکدا ئـەم تیشکە بەر ماددە نەکەوێت ئایا بۆ خۆی دەبێتە گەردی ماددی؟ بەلایەنی کەمەوە کەس تا ئێستا ئەمەی نەدرکاندووە، بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کـە ئـەم گەردوونـە کـۆن نیـەو سەرەتایەکی هەیە، بوونی گەردوونیش ڕێی تێنـاچێت ئەگـەر بەدیهێنـەرێکی نـەبێت، ئـەو بەدیهێنەرەی کە لەسەرەتادا دروستی کردووە دوای ئەوەی کە گەردوون بوونی نەبووە.

٤- زاناکانی یەکتاپـەرستی پێشین لە کۆندا بەم جۆرە بەرپا بوونی گەردوونیان لـە نەبوونەوە بە توانای (ﷲ)جل جلالـە لێك داوەتـەوە: کـاتێ تەماشـای گـەردوونیان کـرد، پێکهاتەکانی بەسەر دوو جۆردا دابەش بوون: بەشێکیان بۆ خۆیان پێك دێن، جۆرێکیشیان بەبێ زات پێك نایەن، بۆ نموونە لاشە بۆ خۆی پێك دێ، بـەڵام نەخۆشـی بـێ بوونـی لاشـە دروست نابێ، ئەتۆمیش بۆ خۆی پێکدێ بەڵام گەرمی بە بێ زاتو بوون نایەتەدی، ئەوەش کە هەڵدەستێ بە پێکهاتنی خۆی پێی دەوترێت ناوەڕۆك (جوهر)، ئەوەش کە بەبێ بوونی ناوەڕۆك نایەتەدی پێی دەگوترێ نیشانە (بـەرەنجام- عَرَض) کەواتـە گـەرد جەوهـەرەو گەرمییەکەی بەرەنجامە، لاشەش ناوەڕۆکەو لەش ساغی رووکەشەکەیەتی.

هەروەها گوتویانە ناوەڕۆکەکان لە رووکەش جیا ناکرێنەوە، هیچ ناوەڕۆکێکیشـمان بەبێ بەرەنجام نەبینیوە، هەموو (نیشانە - عرَض)ێکیـش رووداوە، بـۆ نموونـە تاریکـایی رووداوو بەرپا بووە چونکە پێش ماوەیەك رۆژ هەبوو، هەروەها رۆژیش بەرپا بـووە، پێـش ماوەیك شەو بووە، گەرمایی گەردەکانیش هـەر چۆنێـك بێـت ئـەوە هـەر سـەرەتای هەیـە،

هـەرواش ساردییەکەی سـەرەتایەکی هـەبووە، کەواتـە هـەموو بـەرەنجامێك سـەرەتایەکی هەیە، جا کەوابێ گەر هەر ناوەڕۆکێك بەبێ بەرەنجام نەیەتەدی،ئەوا هەموو ناوەڕۆکێك بـێ سـەرەتا نـابێت، ناوەڕۆکـەکانو بەرەنجامـەکانی گـەردوونیش هـەر هـەموو دروسـتکراون و ئەزەلی نین.



گفتوگۆی پرسیارێك:

خەڵك کە دەگاتە ئەم راستییە پرسیارێکی دووبارەو کۆنی لا دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە کە ئایا کێ خـوای بـەدی هێنـاوە، کـە هـەموو شـتێکی هێناوەتـە بـوون؟ جا لـە نـاوەڕۆکی پرسـیارەکەدا وەڵامەکـەشمان چنـگ دەکـەوێت، کەواتـە (اللّٰه) بـەدی هێنـەرەو پـەروەردگاریش بـەوجۆرە بێـت ئەمـە وامـان لیٚ دەکـات ئـەوە نەیـەت بـە بیرمـاندا کـە پەروەردگار بەدی هاتوو بێت، چونکە ئەگەر بەدیهاتوو بوایە ئەوا نەیدەتوانی بەدی هێنـەر بێت! ئیـدی چـۆن ئـەو بۆچوونـەمان لا دروسـت بێـت کـە بەدیهێنــەری ئـەم گەردوونـە بەدیهاتووە؟هەر بۆ نموونە مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی کـە ئـەم هـەموو توانایـەی پـێ بەخشـراوە ناتوانێ شتێ لە (نەبوونەوە) بخوڵقێنێ،جا چۆن بـە خـەیاڵمان بـێ کە بە دیهێنـەری ئـەم گەردوونە خۆی بەدیهێنراو بێ؟! پێشەوا –بەننا– رەحمەتی خوای لیٚ بێـت– بـەم جـۆرە وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە ئەو پرسیارە دەکەن: ئەگەر کتێبێکت لـە کتێبخانەکـەتدا دانـا پاشان ژوورەکەت جێ هێشتو پاشی کەمێك گەڕایتەوە نـاو ژوورەکـە، پاشـان کتێبەکـەت بینی لە ناو چەکمەجەکە دانرابووە، ئەوا بە تەواوی باوەڕت دێتە سەر ئـەوەی کـە کەسـێك خستبێتیە ئەو جێگایە، چونکە دەزانیت لە سیفەتەکانی ئەو کتێبە ئەوە نیە کـە بـۆ خـۆی خۆی بگوازێتەوە.. ئەم خاڵە بزانەو با لـە یـادت بێـتو پێکـەوە بچینـە سـەر خـاڵێکی تـر: ئەگـەر لـە ژووری کتێبخانەکـەتدا کەسـێکت بیـنی لەسـەر کورسییەك دانیشـتبوو، پاشـان چوویتە دەرەوەو هاتیتەوە ژووری، بۆ نموونە بینیت لەسەر فەرشێك دانیشتووە، ئەوا ئەو کاتـە لـە هـۆی گواسـتنەوەکەی ناپرسـیتو بـەبیرتا نایـەت کەسـێك لـەو جێگەیـەیدا

گواستبێتیەوە! چونکە بۆت دەردەکەوێت لە سیفەتەکانی ئەو کەسە ئەوەیە کە بۆ خۆی دەگەڕێت نەك کەسێك هەبێت بیگوێزێتەوە، ئەم خاڵەشت لە یاد بێت ئەنجا بزانە! کاتێك سەرجەم بەدیهاتووەکان ڕووداوو بەرپا بووین بشزانین کە سروشتو سیفەتیان بە جۆرێکە کە بۆخۆیان نایەنە دی، بەڵکو دەبێ بەدیهێنەرێکیان هەبێ، زانیشمان کە بەدیهێنەرەکەی خوداوەندی بەرزو بەشکۆیە. وکاتێك تەواویەتی لە خوایەتیدا پێویستی بکات لە سەرمان کە نابێت هیچ خوایەکی تر هاوەڵی هەبێت، چونکە لە سیفەتەکانی ئەوەیە کە بۆ خۆی بووە، ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێ کەزاتی خۆی هەر هەبووەو پێویستی بە کەس نەبووە بیهێنێتە بوون، جا گەر دووخاڵەکەی پێشین بخەینە پاڵ ئەم وتەیە، ئەوا ئەگەینە ئەم پلەیە لە راستی، عەقڵی مرۆڤیش کورتی هەڵهێناوە کە پەی بە زیاتر لەمە بەرێت.

زاناکانی یەکتاپەرستیش وای دەبینن کە ئەم پرسیارە هیچ واتایەکی نیەو بۆیە دەڵێن: کاتێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا بڕۆین کە دەڵێن: کێ خوای دروست کردووە؟ ئەگەر پێمان گوتن یەکێکیتر ئەوی بەدیهێناوە، دەڵێن: ئەی کێ ئەوی تری بەدیهێناوە؟ وپاشان ئەوی سێیەم... بەم جۆرە.. ئەی لە کۆتاییدا چی دێت؟ بێگومان دەبێ لە کۆتاییدا بگەینە زاتێکی بێ سەرەتا کە هیچ بەدیهێنەرێکی نەبێت، ئەم زاتەش کە سەرەتاو هیچ خوایەکی نیە زاتی خوداوەندی تاکو تەنیایە، هەچ پرسیارێکیش لەم بارەیەوە بکرێ لەکۆتاییدا بێ مانا دەمێنێتەوە،چونکە تەنیا بەدیهێنەرو بەدیهاتوو هەیە، رێشی تێ ناچێت بەدیهێنەر هیچ بەدیهێنەرێکی تری هەبێت.

لە راستیشدا کەسێك ئەم پرسیارە دەکات یان گاڵتە پێکەرە، ئەوە دەبێت پشتی تێکەین، یاخود خەیاڵاتی بۆ دروست بووەو دەبێ هۆکاری ئەو خەیاڵاتەی بڕەوێنینەوە، چونکە گەر وای ببیستین ئەم بۆچوونە بەسەر بەدیهێنەری گەردوونیشدا دێتە دی، ئەوا مەرج نیە کە سەرجەم ئەو یاسایانەی بەسەر دروستکراودا دێتەدی بەسەر دروستکەریشدا بێنە دی، چونکە دروستکراوانو ئەو یاسایانەی رامی دەبن لە بەدیهێنانی دروستکەرێکە، لە سنووری هەموو جیهانیشدا دەبینین ئەمەی کە مرۆڤ دروستی دەکات ئەو حاڵەتانەیان بەسەردا دووبارە نابێتەوە کە بەسەر مرۆڤدا دێت، بۆ نموونە مرۆڤ لە خۆڕا دەڕوات و

ویستی هەیەو فێر دەبێتو دەرك دەكاتو بیر دەكاتەوەو دەخواتو دەخواتەوەو دەنوێتو حەز دەكات، ئەمە شتانێكنو ئەوەی دروستیان دەكات شتێكی ترە، هەر یەكەشیان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، ئەم گەردوونەش شتێكەو پەروەردگارەكەشی شتێكی ترە، گەردوونیش تایبەتمەندی خۆی هەیەو زاتی خوداوەندیش سیفاتی خۆی هەیە.

زۆربەی جار خاوەن پرسیار لەو جۆرە كەسانەیە بڕوای بە خودا نەبێت، وەڵامی ئەمانەش ئەمەیە كە: ئێمە هەموو لەسەر ئەوە رێك كەوتووین شتێكی كۆن هەیە بێ سەرەتاو بێ دروست كەرە، رەنگە تۆبڵێی ئەو شتە دێرینە: ماددەیە، ئێمەش دەڵێین ئەو شتە كۆنە (اللَّهُ)یە، زانستی نوێش سەلماندویانە كە مادده كۆن نیەو ئالێرەدا هیچمان لەبەردەم نامێنێتەوە جگە لەوەی تەنیا پەروەردگارو بەدیهێنەرمان بە كۆن بمێنێتەوە.

لە لاپەڕەكانی رابووردوشدا هەندێك لەو بارەوە دواین كە بزانین زانست چ دەڵێ؟ ئا لێرەشدا هەندێك لە وتەی زاناكان رادەگوێزینەوە سەبارەت بە هەمان بابەت كە لە كتێبی (الله يتجلى فى عصر العلم– ل٢٧) وەرمان گرتووەو كۆتایی ئەم دیاردەی پێ دەهێنین، (جۆن كوشران) دەڵێ زانستی كیمیا پێمان دەڵێت كە هەندێك مادده بەرەو لە ناو چوونو تەواو بوون دەچن. بەڵام هەندێكیان زۆر بە خێرایی بەرەو لە ناوچوون دەچن، هەندێكی تریشیان بە هێواشی، كەواتە لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت كە مادده ئەزەلیو هەتا هەتایی نیە، واتای ئەمەش ئەوەیە ئەزەلی نیەو بەڵكو سەرەتایەكی هەیە، بەرەنجامەكانی كیمیاو زانستەكانی تریش ئەوەمان بۆ روون دەكەنەوە كە سەرەتای مادده هێواشو لەسەرخۆ نەبووە، بەڵكو لە پڕێكدا هاتووەتەدی، تەنانەت زانیاری نوێ دەتوانێ ئەوەمان پێ بڵێ كە لە چ كاتێكدا ئەم ماددانە دروست بوونو پێكهاتوون.

هەروەها (ایرفنج ولیام) لە هەمان سەرچاوەو لاپەڕە(٥٥)دا دەڵێ:

( ... زانستی گەردوونناسی ئاماژەی ئەوە دەكات كە ئەم گەردوونە سەرەتایەكی دێرینی هەیە، گەردوونیش بەرەو كۆتایی هاتنێكی حەتمی دەچێت، هەرگیز ئەوەش لەگەڵ راستدا یەكانگیر نابێت كەبڵێین ئەم گەردوونە ئەزەلییەو هیچ سەرەتای نیە، یان هەتا هەتاییەو كۆتایی نیە، بەڵكو لەسەر بنەمای گۆڕان دروست بووە)

ئەمە وتەی ئەو کەسانەیە لەسەر بێ باوەڕبوونیانەوە- چونکە بڕوا بوون بە خوا پێداویستی خۆی هەیەو ئەو کەسانە پێی هەڵنەستاوون- بەڵام بە هۆی بوونی زانیارییان بە یاساکانی گەردوون گەیشتوونەتە ئەم راستییە نەمرو هەبووەی کە لە فیطرەی هەموو مرۆڤێکدا هەیە،و لای هەموو خاوەن ژیرییەکی رێك و پێك راستییەکی بێ بەڵگەیە.
پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿أم خلقوا من غير شيء أم هم الخالقون. أم خلقوا السموات والأرض﴾ الطور/٣٥-٣٦، واتە: ئایا ئەمانە بێ هۆ بەدی هاتوون؟ یا خۆیان خولقێنەری خۆیانن، یان ئەوانە ئاسمانەکان و زەوییان خەلق کردووە.

# دیاردەی دووەم

## دیاردەی توانا (الإرادة)

-١-

سێ ئەگەر هەیە پێویستە لە کاتی ئاخاوتنماندا لەمەڕ گەردوون و ئەوەی تێیدایە لێی بدوێین تا بگەینە حەقیقەتی بەدواداچوونەکەمان:

یەکەم: ئەوەیە کە لە دروست کردنی (الله)ی خوای گەورە بێ.

دووەم: یا لە دروست کردنی گەردەکانی ماددە بێت، یان بەش و رەگەزەکانی و توانا و گرنگی پیدانیش هەر لای ئەمانەوە بێت، بەواتایەکی تر: رەگەزەکانی ماددە سەرەکییەکە بیر کردنەوەو کاریان بە ئەنجام گەیاندووەو رێك کەوتووە لەسەر دروست کردنی هەمەچەشنەییەتی دنیا بەم جۆرو شێوەی کە دەیبینین.

سێیەم: ئەوەیە کە گەردوون و ئەوەی ناویشی بەرێکەوت هاتبێتە دی، یان ئەو پشکە کارەباییانەی کە گەردی ئەم گەردوونەی لێ پێك هاتووە بەرێگەی رێکەوت بەدیهاتووە، کە هەندێ سالیبەو هەندێکی تریشی موجەب و بەشەکەی تری مام ناوەندە، ئەمانە بە رێکەوت بوون و هەموو بەشە سالیبێك لەگەڵ بەشە موجەبەکەیدا بە رێگەی رێکەوت پێك هاتبێ؟ یاخود لە ١ تا ٢٣٨ بەدوای یەکدا لە بەشەکانی موجەبی ماددە لەگەڵ یەکدا رێکەوت پێکی هێنابن! پشکە سالیبەکانیش لە دەوری ناوکەکان بە رێکەوت

دەسووڕێنەوە؟ لە نێوان ناوکو تەوژمە کارەباییەکاندا ئەو بۆشاییەی هەیە ئەگەر نەبوایە ئەوا تەنی ئەم زەمینە بە قەبارەی هێلکەیەك دەبوو، ئەوەش بە رێکەوت بووە؟ هەموو خولگە جێگیرەکانی هەر هەشت کارەبایەك بە رێکەوت بووە؟ یاخود توانای یەکگرتنی نێوان رەگەزەکان بۆ پێك هێنانی پێکهاتەیەکی نوێ کە بە هۆی کەمی ئەلکترۆنەکانەوە دەبێت لە هەشت کەمتر، کە لە بەرگی هەندێك گەردردا هەن هەر بە رێکەوت بوون؟ یان یەکگرتنی ئەم رەگەزانەو کۆبوونەوەیان بۆ پێك هێنانی ئەم تەنە مەزنانە لە کۆمەڵەی خۆر هەروا بە رێکەوت بوون؟ یان رێکخستنی خۆرەکان لە خولگەکانیانداو هەروا هەسارەکانیش لە خولگەکانیاندا،هەروەك چۆن ئەلکترۆنەکانیش رێك خراون هەمووی بە رێکەوت بووە؟ یان ئەو گەرماییەی لە خۆرەکاندا هەیەو تیشكو تەرتیب کردنیان بە رێکەوت بووە؟ پاشان ئەم زەمینەی کە شایستەی ژیانە بە: بەرگەکەی، هەوای، ئاوی، شاخ، قەبارەی.... هەمووی بە رێکەوت بووە؟ هەروەها ژیانیش بەهەموو هەماهەنگیو پێك هاتنیو ئامێرە ئاڵۆزەکانیەوە لە خۆڕا بە رێکەوت هاتوونەتە بوون؟ پاشان مرۆڤ بە ژیریو بیرو پێکهاتەو گیانو رەوشتو ئامادەگی ئەندێشەو تێڕوانینو زانستیو سەرجەم تواناکانیەوە بۆ رام کردن، هەموو ئەمانە بە رێکەوت بوون؟.

لەم سێ ئەگەرە هیچ ئەگەرێکی تری زیاتر نیە بۆ لێکدانەوەی بوونی گەردوون، هەرچی ئەگەری یەکەمە بڕواداران لێی دەدوێن، ئەگەری دووەمیش کەس باسی ناکاتو سێیەم ئەگەریش مرۆڤە ماددییەکان دەیڵێن.

کەواتە ئێمە واین لەبەردەم دوو ئەگەردا: یان دەبێت ئەم گەردوونە بە هەموو جۆرەکانیەوە لە دروست کردنی کەرێکی خاوەن توانا بێت بە پێی پرێنسیپی هۆکارێتی (مبدأ السببية)، یان لە ئاکامی رێکەوتەوەیە!

-٢-

ئەرکی گرنگی ئێمە ئەوەیە کە بزانین ئایا کام لەم دوو ئەگەرە لەسەر بەڵگە بنیات نراون، و کامیان هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی نیە؟ بەڵکو رێکەوت زۆر جار رێی تێ دەچێ بێتە

دیو زۆر جاریش لە حوکمی مەحاڵە ژیریەکاندا دەبێت، ئێستاش نموونەیەك دێنینەوە بۆ شایستەییەتی حاڵەتی بوونو مەحاڵییەتی بوونی:-

لەسەر پارچەیەك قوماش دەرزییەك بچەقێنەو لە کونی ئەو دەرزییەش دەرزییەکی تری پێوە بکە، پێم بڵێ گەر مرۆڤ ئەم دوو دەرزییە ببینێو بپرسێت چۆن ئەو دەرزی دووەمە چووە ناو کونی دەرزی یەکەمەوە؟ ئەوا مرۆڤێکی ناسراو بە راستگۆیی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: کەسێك بە دەستی خۆی نووکی دەرزی یەکەمی خستە ناو کونی دەرزی دووەمەوە، هەروەها مرۆڤێکی تریش هەر بە راستگۆیی ناسرا بێت بڵێت: ئەوەی بەم کارە هەستاوە منداڵێکی بچووك بووە کە هەر بە کوێری لە دایك بووە.

جا تۆ گەر بە رێکەوت بەسەر ئەم رووداوە رابووردی ئایا بڕوا بە کامیان دەکەیت؟

بێگومان باوەڕ بە هەواڵی یەکەم دەکەیت، بەڵام بەهۆی راستگۆیی کەسانی بێژەرەوە رەنگە بڕوا بە رێکەوت بکەی لەو رووداوەداو ئەوسا هیچ هەواڵێکیان بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ ناکەیت، بەڵام گەر ئەم کەسە دەرزی سێهەمی بینی خرابووە کونی دەرزی دووەمەوە، ئایا لەم حاڵەتەشدا هەردوو حاڵەتەکە وەك یەك تەماشا دەکرێ؟ نەخێر.. ئا لێرەوە خاڵی مەبەستدارێتی ئەدرێ بەسەر رێکەوت دا، بەڵام ئێستاش هەر بواری رێکەوت دەمێنێتەوە ئەگەر بە کەمیش بێت. بەڵام گەر هەمان کەس (دە) دەرزی بینی، هەر دەرزییەك بە کونی ئەوی تردا کرابوو، ئایا بواری مەبەستدارێتی لەم حاڵەتەدا وەك ئەوەی پێشوو تەماشا دەکرێ؟ نەخێر بەجۆرێك بیرۆکەی مەبەستدارێتی لەم کارەدا بەرەندە دەبێت کە بواری رێکەوتی تیا نەمێنێتەوە.

هەرچەندە ئەم کردارە بەرەو ئاڵۆزی بچێت کەمتر بواری رێکەوت لە بەردەماندا دەمێنێتەوە، بۆ نموونە گەر بڵێین هەر (دە) دەرزییەکە ژمارەی لێدرابووو بەڕیز لە یەکەوە تا دەو پاشان پێیان گوتین منداڵەکە ئەم دەرزییانەی بە دوای یەکدا بەرێکەوت لە ناو کیسێك دەرهێنا، بێ ئەوەی بیانبینێو پاشان یەك بە دوای یەك دەرزییەکانی فڕێدەدا لە خۆڕا دەچوونە ناو یەکەوەو تا هەر (دە)یان تەواو دەبوو، بەدوای یەکداو بەرێکەوت.

پاشان ئەگەر ئەم باسە ئالۆزتر لێك بدەینەوەو لە بری منداڵەکە هەوا یا ئاو یا نەبوون دابنێین، ئایا بواری ڕێکەوت لەم کارەدا مەحاڵ نابێت؟!.

ئایا هەڵویستی مرۆڤ چی دەبێت لەم کارەدا؟ ئایا هێشتا بواری ڕێکەوت دەمێنێتەوە؟ یان دەگوترێت کەسێکی خاوەن تواناو بینین بەم کارە هەستاوە؟ بێگومان مرۆڤی ژیر یەکسەر کەسی دووەم بە ڕاستگۆ دادەنێت.. هۆی ئەم بڕیاردانەش ئەوەیە کە ڕێکەوت یاسایەکی بیرکاری هەیەو ناتوانین خۆمانی لیّ لادەین، یاساکەش ئەوەیە کە:-

هەر چەندێك ژمارەی شتە زۆرە بەراوورد کارەکان کەمتر بێتەوە زیاتر بواری هاتنە دی ڕێکەوت دێتە دی، بەڵام گەر ژمارەکە زیاتر بوو ئەوا گومانی حاڵەتی ڕێکەوت کەمتر دەبێتەوە.

جا گەر بەراووردکردنەکە لە نێوان دوو شتی هاوتادا بوو ئەوا ڕێژەی ڕێکەوت (١ بەرانبەر٢) دەبێت، بەڵام گەر لە نێوان (١٠)شت دابوو، ئەوا ڕێژەی ڕێکەوت (١بەرانبەر ١٠)دەبێت، چونکە هەریەکەیان هەلی بەرەندەبونی وەك ئەوی تر وایە، بێ هیچ پێشخستنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا، ئا لێرەوە ڕێژەی سەرخستنی نێوان شتەکان وێك دەچێت، تەنانەت ئەگەر سەد یا هەزاریش بوون، بەڵام هەرچەندێك ڕێژەی ژمارەکان زۆرتر بێت، ئەوا ڕێژەی هاتنەدی ڕێکەوت دەچێتە سنووری حوکمی مەحاڵو نەبوونەوە، جا بۆ تێگەیشتن لەم باسە ئەوا ئەم نموونەیە بخوێنەرەوە:

وای دابنێ تۆ چاپخانەیەکت هەیەو نیو ملیۆن پیتی تێدایە لە نێوان سندوقە جیاجیاکان دا، ئەگەر لەم کاتەدا بوومەلەرزەیەك لەسەر زەوی ڕوویداو سەرجەم سندوقی پیتەکانی خستو سەرەوژێری کردن، پاشان ڕێکخەری پیتەکانی چاپخانەکە پێت ڕابگەیەنێت کەوا لە ئاکامی ئەم تێکەڵاو بوونەدا (١٠) وشەی جیاجیا لە واتا پێك هاتووە بێ ئەوەی واتاکانیان پەیوەندی بە یەکەوە هەبێت، ئەم باسە لەم حاڵەتەدا ڕێی هاتنەدی دەبێت.

بەڵام گەر پێت بڵێت: ئەو (١٠) وشەیە رستەیەکی تەواوی پێك هێناوە، کەمتر جێی بڕوایە. بەڵام بە مەحاڵیش نابینرێت.

بەڵام گەر پێت بڵێت هەموو پیتەکانی چاپخانەکە دوای تێکەڵاو بوونیان بە شـێوەی رێکەوت، یەك کتێبی (٥٠٠) لاپەڕەیی تەواوی پێك هێنــاوە کـە یـەك هۆنـراوەی تـەواوی پـڕ واتای کێشداری لیٚ دەرچووە، ئەوا تۆ لەم حاڵەتــەدا بێگومـان ئـەم هاتنەدییـەت لا مـەحاڵ دەبێت.

جا گەر زانیمان رێژەی دەرکردنـی (دە) ژمـارە بـە دوا یەکەکـەی دەرزییـەکان (١ حاڵەت بەرانبەر ١٠ملیـارە) ئـەوا گریمـانی دەرچوونـی یـەك بـە دوای یـەکی (دە) ژمارەکە ئەگەر (١٢) دەرزی بێت (١بەرانبەر ١٠٠٠ملیار) دەبێت، بــەڵام گـەر (٢١) دەرزی بێـت ئـەوا رێژەی هاتنە دی رێکەوتی هەر (٢١) دەرزییەکە یەك بەدوای یــەکدا (١ بەرانبـەر ١٠٠٠ملیـار ملیار) دەبێت.

ئەی دەبێ هەڵوێستمان چی بێت سەبارەت بە تێکەڵاو بوونی (٥٠٠) هەزار پیت بـۆ پێکهێنانی نزیکەی (١٢٥) هەزار وشە؟ بەشێوەو رێگەی وا کە هەرگیز نەیەتـە هـەژمارین؟ بەجۆرێك ئەم ئەگەرە رێی تێدەچێت کە ژمارە پەی پیٚ نەبات لە ژمـاردنیدا بـۆ پێکهێنانی کتێبێکی لەم جۆرە.

جا بۆ ئەوەی مانـای (٥٠٠) هـەزار پیـتو (١٢٥) هـەزار وشـەو (٢٨) پیـتی هیجـائی بزانیـت، لـەم پەرەگرافـە بکۆڵـەرەوە ((پرۆتینـات پێکهاتـەی سـەرەکی هـەموو خانەیـەکی زیندووە،و لە پێنج رەگەز پێك دێت: کاربۆن، هایدرۆجین، نایترۆجین، ئۆکســجین، کـبریت، ژمارەی گەردەکانی هەر پرۆتینێك "٤٠,٠٠٠" گەردە،و لە کاتێکدا رەگـەزە کیمیاوییـەکانی سروشت ژمارەیــان "٩٢"[1] رەگـەزی دابـەش بـووە بـە شـێوەیەکی رەمـەکی، جـا ئەگـەری کۆبوونەوەی ئەم پێنج رەگەزە بۆ پێکهێنانی بەشێك لە بەشــەکانی پرۆتـین، دەتوانـین بـە

[1] ئەم ژمارەیە بەپێی رێژە کۆنەکەیە پێش ئەوەی هەندێك ماددەی کیمیاوی نوێ بدۆزرێتەوە.

جۆرێك حيسابى بكەين بەپێى رێژەى ئەو ماددەيەى كە پێويستە تێكەڵاو ببێ بۆ پێكهێنانى ئەو بەشە، پاشان بۆ زانينى درێژى ئەو ماوەيەى كە پێويستە بۆ بەرپابوونى ئەم كۆبوونەوەيەى نێوان گەردەكانى يەك بەش.

زاناى ماتماتيكى سويسرى (چارلز يۆجين جاى) هەستا بە هەژمار كردنى هەموو ئەم هۆكارانە، بۆى دەركەوت كە هەلى پێكهێنانى پرۆتين بە رێگەى رێكەوت بە رێژەى (١) بۆ (١٠)^١٦٠ يە، يان بەرێژەى ١ بۆ ١٠و ١٦٠جاريش جاران بكرێتەوە،ئەمە ژمارەيەكە ناتوانين بيدركێنين‌و بە وشە پەى پێ بەرين، رێژەى ئەم ماددەيەش كە پێويستە بۆ بەديهاتنى ئەم كارلێكە بە رێگەى رێكەوت بۆ پێكهێنانى يەك بەش، ئەو مەودايە دەبێت زۆر لەقەوارەى ئەم گەردوونە بەرفراوانتر بێت.

(ليكۆنت دى نوى) دەڵێت: پێويستە قەبارەيەكى زۆر گەورەتر لە گەردوونى ئەنيشتاينى بخەملێت بە سكستيليۆن سكستيليۆن جار، جا پێكهێنانى ئەم بەشە لەسەر رووى زەوى لەرێگەى رێكەوتەوە بەلايين ساڵى نەژمێردراوى دەوێت، زانا سويسرييەكە بەوە لێكى داوەتەوە كە ٢٤٣جار ژمارە ١٠جارانى خۆى بكەيت، ئەوەندە ساڵە:(١٠)ى^٢٤٣ دەوێ .

پرۆتينەكان لە زنجيرەى درێژى ترشەڵۆكى ئەمينى پێك دێن، ئەدى چۆن گەردەكانى ئەم بەشانە هاوتاو تەبا دەبن؟ ئەگەر بە هەر رێگەيەكى تر يەكانگير ببن مەرجى ژيان‌و زيندەگييان تيادا نايەتەدى، بەڵكو لە هەندێك حاڵەتدا كوشندەو ژەهراويش دەبن.

زاناى ئينگليزى "ج.ب ليتز" ئەو رێگايانەى ژماردووە كە رەێى تێدەچێ گەردەكانى يەك بەشى سادەى پرۆتينەكان يەكانگير بێت، لێرەدا بۆى دەركەوت ژمارەيان دەگاتە مليۆنەها (١٠)^٤٨؛ بۆيە بەپێى پێوانەى ژيرى مەحاڵە بە رێكەوت ئەم هەموو بەشە يەكانگير ببن بۆ پێكهێنانى يەك بەشى پرۆتينى)).

جا ئەم پەرەگرافەمان بۆ ئەوە باس کرد تا ببێتە وەڵامی ئەو کەسانەی کە دەڵێـن: ئەوەی کە لە یەك لەرینەوەدا دروست نابێت رەنگە لە یەکێك لـە مـەلایین لەرینـەوەدا بێتـە دی، تا بۆمان روون بێتەوە کە چ زەمەنێکی درێژی دەوێت بۆ پێکهێنانی یەك بەش کە هەر پێنج رەگەزەکەی تێدا بێت، دەبێ ئەو تێبینیـەشمان لەبـەرچاو بێـت کـە کۆنـترین مـاوەی تەمەنی گەردوون (٥) بلیۆن ساڵە.

پێنج رەگەز لە یەك بەشدا رێی تێ دەچێـت پێکهاتەکـەی (١٠)[٤٨] جـۆر بێـت، ئـەی سەبارەت (٢٨) پیتی هیجائی ئەبێ هەڵوێستمان چی بێت کـە هۆنراوەیـەك پێـك بـهێنن لـە (١٢٥) هەزار وشە پێك هاتبێ و سەرجەمی پیتەکانی (٥٠٠) هەزار پیت بێت، بە شێوازی بـە دواداهاتنێکی دیاری کراوو بیرێکی ئاشکراو رێکخستنێکی تەواو.

-٣-

لەژێر رۆشنایی ئەوەی باسمان کردووە وا لێرەدا وتـەی زاناکـانی یەکتاپەرسـتی لـە ئیسلامدا دەخەینە روو، چونکە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە بیردۆزی ئەگـەرەکان تـا لـە کۆتاییدا بە مەبەستەکەمان بگەین:

زانایانی یەکتاپەرستی دەربارەی گەردوون بە جۆرێك دەدوێـن وەك بـاس کردنیـان دەربـارەی هـەموو بووەکـان کـە شایسـتەی بوونـن، ئـەم رێتێچوانـەش بـەم جـۆرە لێـك ئەدەنەوە:

| | |
|---|---|
| الممكنـــــاتُ المتـــــقابلاتُ | وجودُنـــا والعـــدمُ الصفـــاتُ |
| أزمنـــةٌ، أمكنـــةٌ، جهـــاتُ | كـــذا المقـــاديرُ روى الثقـــاتُ |

| | |
|---|---|
| بـــووە بەرانبـــەرەکان | بوونمـــانو نـــەبوون، ســـیفات |
| کـــات، شـــوێن، رووگـــە | هەروا پێوانەکان، گێڕانەوەی متمانـە |

جا ئەگەر ئەم گەردوونە یەکێك بێت لـە بووەکـان، ئـەوا هـەموو بوویـەك شایسـتەی هاتنـەدیو بوونـە،و رێی تێدەچـێ عـەدەمیش بوایـە. رێشـی تێدەچـوو لەسـەر شـێوەی سیفەت بوایە، دەشبوو لەسەر چەند جۆرە سیفاتێك بوایـە، رێی تێدەچـوو لـە زەمـانێکدا بوایە، یاخود لە زەمانی تردا.. رێشی تێدەچوو لە شوێندا بوایە، یاخود لە جێگایانی تردا، رێی تێدەچوو بە پێوانە بێت یان بە پێوانانی دی بوایە، هەر بەم جۆرە هەموو بەشێك لـە بەشەکانی ئەم گەردوونە ئەم واتایانەی بەسەرا دێتە دی.

جا گەر لەم هەموو بوونەدا تەنیا یەکێکیان هەڵبژێرین ئەوا ئەوەیانە کە لە هـەمووی پتـەوترو باشـترو بەیاسـاترە، ئەگـەر نـا هـەر یـەکێکی تـر بوایـە ئـەوا دەبـووە نـارێکیو گەرەلاووژە، کەواتە دەبێت ئیرادەو توانایەکی مەزن تر هەبێت، کە یەکێك لـەو ئەگەرانـەی بەرەندە کردبێت.

-٤-

پاش ئەم راستییانەو بۆ ئـەوەی لـە شـێوەی کۆتـاییدا باسـەکەمان دابڕێژیـن ئـەوا دەڵێین:

کێشەی باس کردن لە گەردوون زۆر ئاڵۆزترە لە باسکردنی دوو نموونەکەی پێشوو: ئەوا لە نموونەی منداڵو دەرزییەکەو نموونەی چاپخانەو پیتەکان دا.

دەرزییەکان بە کـون کـراوی ئامـادەن، گـەردەکانیان لەگـەڵ یـەکا یـەکانگیر بـوون بەشێوەیەکی دیاری کراو، لـە کانزایـەکی دیـاری کـراو، منداڵەکـەش بوونـی هەیـەو توانـای هاویشتنی هەیە، تواناشی هەیە بۆ ئاراستە کردنی هاویشتنەکەی تەنانەت ئەگـەر کوێریـش بێت!، هەروەها پیتەکانی چاپخانەکە بوونیان هەیە، ئەوە فلان پیتەو ئەوی تریان پیتێکی تر... گەردەکانیشیان کۆبوونەتەوە لە پێکهێنانی ئـەو پیتـەدا، بـە تەنیشـت یەکـەوە ریـز بوونو لە سنووقدا دانراوون، پاشان بوومەلەرزەیەك لە ئارادایە کە یاسایەکی تایبەتی خۆی هەیە.

بەڵام سـەبارەت بابـەتی گـەردوون، هێنـدە ئـاڵۆزترە، بـە پلەیـەك: ژیـریو هۆشـی مرۆڤ پەی پێ نابات، ئەمەش وامان لێ دەکات ئەگەری هاتنە دی رێکەوت لە تێڕوانینماندا بسڕینەوە.

-٥-

ئێستاش با لە داڕشتنی کێشەکە بدوێین!

ئەم گەردوونە لە یەك جۆرە ڕەگەز پێکهاتووە، هەر لە ئەستێرەو خۆرو مەجەڕەو زەویەوە.....، کە ئەم ڕەگەزانە ژمارەیان دەگاتە (١٠٠) ڕەگەز، ئەم ڕەگەزانەش بۆ خۆیان بریتین لە هێزو وزەی کارەبایی، هەندێکی موجەبو هەندێکی تریشی سالیب، هەندێکی تریش مام ناوەندی، بە موجەبەکە دەگوترێ پرۆتۆن، سالیبەکەش ئەلیکترۆن، مام ناوەندییەکەش نیوترۆن.

ژمارەی ئەلکترۆنەکان لەهەر خولگەیەکی دەرەکی گەردێکا یەکسانە بە ژمارەی پرۆتۆنەکانی ناوکەکەی، جا گەر لە ناوکەکەیدا یەك پرۆتۆنی تێدابێت ئەوا لە خولگەکەیشیدا یەك ئەلکترۆنی تێدا ئەبێت هەروەك لە هایدرۆجیندا هەیە، وگەر لە ناوکەکەیدا دوو پرۆتۆنی تێدا بوو ئەوا لە خولگەکەیشیدا دوو ئەلکترۆنی تیا ئەبێت، بەم جۆرە ژمارەکان پلە پلەیی وەردەگرن کە لە یەکەوە دەست پێ دەکات کە سووکترین ڕەگەزە لە کێشدا تا قورسترینی کە ئۆرانیۆمە، جا بەم یەکسانە گرنگییەی نێوان ئەلکترۆنە سالیبەکانو پرۆتۆنە موجەبەکان کارەبای گەردەکان هاوتاو بەرانبەر دەبن، بەڵام نیوترۆنە بێ لایەنەکان ئەوا ژمارەی لە ناوکی گەرددا –کەم بێ یا زۆر– یەکسان نیە بە ژمارەی ئەلکترۆنەکان.

جیاوازی لە ڕەگەزەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە ژمارەی پرۆتۆنو ئەلکترۆنەکانی هەر گەردێك، بۆ نموونە جیاوازی نێوان هایدرۆجینو ئۆرانیۆم ئەوەیە کە یەکەمیان یەك ئەلکترۆنی تیایە بەڵام ئۆرانیۆم ٢٣٨ پرۆتۆنو ٢٣٨ ئەلکترۆنی تیایە.

جا گەردوونیش هەر لەم ڕەگەزانە پێك هاتووە، هەر ئەو ڕەگەزانەشن لە هەموو تەنە ئاسمانیەکاندا هەن، هەمان ڕەگەزی پێکهاتەی زەمین لە خۆریشدا هەیە، هەروەها لە هەموو هەسارەیەکی تری ئەم ئاسمانە بەرینەش دا.

کەواتە بۆ پێك هێنانی ئـەم تەنانـە سـەرجەم ئـەم رەگەزانـە کۆ دەبنـەوە، هـەموو تەنێکیش هەمان یاسای تەنەکانی تری هەیـە، هـەموو ئـەو تەنانـەش خولگـەی رێکوپێکـی خۆیان هەیە، هەر یەکەو لە خولگەی خۆی دایەو بەر تەنەکانی تـر ناکـەون، هەرچـەندە بـە خێراییەکی زۆریش دەڕۆن، تەنانەت ئەگەری لێکدانی دوو ئەستێرە وەك ئەگـەری لێکدانـی دوو کەشتی وایە: یەکێکیان لـە ئۆقیانووسـی هینـدی بێـتو ئـەوی تریـان لـە ئۆقیانووسـی ئەتڵەسی.

ئەم خۆرەی ئێمەش یەکێکە لەو تەنانەی کە هەمان تایبەتمەندیو سیفەتی یاسـایی هەیە، جـا ئـەم خـۆرەی ئێمـە چـەندان ئەستێرەی گـەڕۆکی لـە دەور دەسـووڕێتەوە، کـە یەکێکیان ئەم زەویەیە کە ئێمەی لەسەر دەژینو ژیانی تێدایە.

-٦-

پاشان:

١- ئەگەر توێکڵی زەوی بە رێژەی چەند پێیەك لەمـەی ئێسـتا ئەسـتوورتر بوایـە، ئەوا دووەم ئۆکسیدی کاربۆنو ئۆکسجینی هەڵئەمژیو ژیان بەرپا نەدەبوو.

٢- ئەگەر بەرزایی هەوا لەمەی ئێستا کەمتر بوایە، ئەوا ئەو هەموو نەیزەکانەی کـە لەبـەرگی دەرەوەدا بـە مـەلایینیان لێ دەسـووتێت، بـەر زەوی دەکـەوتنو هـەموو شـتێکی دەسووتاند کە ئاگر بیگرتایەتەوە.

٣- ئەگـەر خـۆر نیـوەی ئـەم تیشـکەی ئێسـتەی بدایـە، ئـەوا لەسـەرما رەق دەبووینەوەو دەیبەستین، گەر بـە رێـژەی نیوەشـی زیـاتر بوایـە، ئـەوا لـەمێژە دەبووینـە خۆڵەمێش.

٤- گەر مانگ (٢٠.٠٠٠) میل لێمان دوور بوایە لە بری ئەم دوورییەی ئێستای-ئـەی بۆ نا! خۆ مانگی مەریخ (٦٠,٠٠٠) میل لێوەی دوورە-، ئەوا ئەو کاتە کـرداری هەڵکشـانی

مانگ بۆ ئاوەکان بە رادەیەك دەبوو کە سەرزەوی لە رۆژێکدا دووجار ئاو دایدەپۆشــیو تـا سەر شاخەکانیش دەچوو.

٥- گەر شەویشمان دە هێنــدەی ئێسـتا درێـژ بووایـە، ئـەوا خـۆری گـەرمی هـاوین هەموو رووەکەکانی دەسووتاند لە رۆژدا، لە شەویشدا هەموو شتێك دەیبەست.

٦- ئەگەر رێژەی ئۆکسجین بە لە ٥٠٪ بوایە لە هەوادا، لە بـری ٢١٪، ئـەوا هـەموو ئەو شتانەی سیفەتی سـووتاندنیان تێدایـە، لـە جیـهانـــــدا دەسـووتان؛ بـە جۆرێـك یەکەم پریشك لە بروسکەوە بەرپابێ‌و بـەر دارێـك بکـەوێ لـە دارسـتانێکدا ئـەوە هـەمووی ئەتەنێتەوە. گەر رێژەی ئۆکسجینیش ١٠٪ بوایە ئەوا شارستانێتی سەر زەوی بەم جۆرەی ئێستا نەدەبوو.

٧- گەر باران نەبوایــە ئـەوا زەوی دەبـووە بیابـانێکی بـێ ژیـان، گـەر بـاو دەریـاو ئۆقیانوسەکانیش نەبونایە، ژیان نەدەهاتە دی، یان گەر بە هــەڵم بوونـی ئـاو بـە جۆرێکـی جیاواز لە مەی ئێستا بوایە، دووبارە ژیان مەحاڵ دەبوو، یان گەر هەڵم لە هەوا سـووك تـر بوایە ژیان نەدەهاتە دی.

٨- گەر ئاوی ئۆقیانوسەکان شـیرین بوونایـە ئـەوا بۆگـەن دەبـوونو ژیـان لەسـەر زەوی مەحاڵ دەبوو، چونکە خوێ‌و سوێری، ئۆقیانووسەکان لە تێك چوونو بۆگـەن بـوون دەپارێزێ، گەر کلۆریش لەگەڵ سۆدیۆمدا یەکی نەگرتبایە خوێ پێك نـەدەهاتو هـەر بـە هەمان جۆریش ژیان نەدەبوو.

٩- گەر چەقی زەوی مام ناوەند بوایە لەبری ئەم لارییەی ئێستا هەیەتی بـە پلـەی ٢٣° لەگـەڵ وەسـتاوی زەوی دا، ئـەوا تنۆکـی ئـاوە بەهـەڵم بووەکـان کـە لـە ئۆقیـانوسو دەریاکـان بـەرز دەبنـەوە کۆ دەبوونـەوەو لـە دوو جـێی جیـاوازی تـەوەرەی بـاکوورو باشووری گۆی زەوی دادەبارین، ئەوسا کیشـوەری بەسـتەڵەکیان پێك ئـەهێناو هـاوین بـە هەتا هەتاییو زستانیش بە هەتا هەتایی دەمایەوە، ئەوسـاش خـەڵك وژیـانو زینـدەوەران لەنێو دەچوون.

١٠- یان گــەر زەوی وەکــو عطــارد بوایــە تــەنیا بەیــەك لادا بــەدەوری خــۆردا بسوڕایەتەوەو تەنیا بەیەك جۆر بە دەوری خولگەکەیدا بسوڕایەتەوە، لە کاتی ئەنجام دانی سوڕانەوەیەکی تەواویدا بە دەوری خۆردا. یان بە واتایەکی تر گەر بەشێکی زەوی هەمیشە شــەو بێتو بەشــەکەی تریشــی هەمیشــە ڕۆژ بێــت، کــەس نــەیدەتوانی لــە کــاتی شــەوی بەردەوام یا ڕۆژی بەردەوامدا بژی، ئەو کاتەش ژیان نەدەبوو.

١١- گەر ئەو یاسای کێشندەی ئێستا هەیە نەبوایە، چــۆن گــەردەکانو بەشــەکانی گــەردەکان بەیــەك دەگەیشــتن؟ ئــەو کاتــە چــۆن خــۆر دەبــووە ئــەم خــۆرەو زەویش بــەم زەوییە؟ گەر وا نەبوایە زەوی لەم جێگەیەیدا نەدەبوو، گەر بشمایەتەوە ئەوسا ژیان چــۆن دەبووو مرۆڤ چۆن دەڕۆیشت؟.

١٢- بە بوونی یاسای کێشندە گەر زەویش وەك مانگ بچووك بوایــە یــان تیرەکــەی چارەکی تیرەی ئێستای بوایە، ئەوسا نــەیدەتوانی پارێزگــاری بــەم بەرگــە هــەواو ئاوییــەی ئێســتایەوە بکــات کــە دەوری داوە، ئەوســا پلــەی گــەرماش بــە جۆرێــك دەبــوو هــەموو گیانەوەران دەمردن.

١٣- یان گەر ئەلکترۆنەکانی ناو گەردەکان بە پرۆتۆنەکانــەوە پەیوەســت بونایــە، گەردەکانیش پێکەوە پەیوەست بونایەو بۆشاییان لە نێواندا هەبوایــە، ئەوســا گــۆی زەوی وەك هێلکەیەکی لێ دەهات، ئەوسا مرۆڤو گیانەوەرانی تر حاڵیان چۆن دەبــوو؟ گــەر بــەم جۆرەش بێت هەموو ئەو شتانەی ئێستا دەیانبینی لەو شێوەیەوە دەگــۆڕان کــە هــەن،ئــەو کاتە گەردەکانی تەنێك بە قەوارەی گۆی زەوی بێ بۆشایی بوایە!

١٤- یا گەر ڕەگەزەکان لەگەڵ یەکدا یەکانگیر نەبونایە ئەوسا نە خــاك دەبــوو، نــە ئاو،و نە درەختو نە ئاژەڵو ڕووەکیــش، شــوێنی ئەلکترۆنــەکان لەبــەرگی گــەردەکاندا بــە شێوەی هەشت ژمارەیی ڕێك خراون. جا گەر ژمارەی ئەلکترۆنەکان لە خولگــەی دەرەوەی گەردا هەشت بوایە باری سەرەوە کۆتایی پێ ئەهات بە پڕ بوونی هەشت ژمارەکە، ئەوسا جێی یەك ئەلکترۆنی تر نەئەبۆوە. یــا گــەر هــەر ڕەگــەزێك (٩) ئــەلکترۆنی ببوایــە، ئەوســا نۆیەم ئەلکترۆن دەبووە چەق لە خولگەی دووەمداو لەبــەرگی گەردەکــەدا، بــەم جــۆرە تــا هەر هەشت دانەکە لە خولگەی دووەمدا پڕ دەبوو، پاشان لە خولگەی ســێهەمو چوارەمو

تـا کۆتـایی. هەشـت هەشـت، یـەکگرتنی توخمـەکانیش لەگـەڵ یــەکدا هــەر لەگــەڵ ئــەم ڕێکخستنەدا دەڕوات لەسەر ڕووەکەیدا، چونکە یەکگرتنی توخمــەکان بـە هـۆی یـەکگرتنی نێوان ئەلکترۆنەکانەوە دەبێت. جا گەر ژمارەی ئەلکترۆنـەکانی هـەر ڕەگـەزێك لـە هەشـت کەمتر بێت لە سەر ڕووی دەرەوە، ئەوا دەتوانرێت توخمێکی تر وەربگرێت،بەڵام ئەوەی لە بەرگی دەرەوەیدا هەشت ئەلکترۆن بێت ئەوا ناتوانێ هیچ توخمێکی تر وەربگرێت، ئەوەی لە بەرگی دەرەوەی حەوت کارەبا هەبێت ئـەوا دەتوانێت لەگـەڵ یـەك توخمـی تـردا یـەك بگرێت لە چینەکەی خۆیدا، بەڵام ئەوەی لە چینی دەرەوەیدا شەش ئەلکترۆنی هەبێت ئەوا دوو ئەلکترۆن لە چینی دەرەوەیدا لەگەڵی یەك دەگرێت،و بەم جۆرە....

١٥- یاخود گەر یاسـاکانی گـەرمی نەبوایـە، ئـەوا سـەر زەوی سـارد نەئـەبووەوەو بەکەڵکی ژیان نەدەهات.

١٦- گەر شاخەکان نەبونایە؛ زەمین پـەرت دەبوو، ئەوسا ئەو بەرگەی نەدەبوو کـە بەکەڵکی ژیان بێ.

١٧- یاخود گەر لەسەر زەویدا ڕزق و ڕۆزی پێویستی تیـا نەبوایـە، ئـەوا ژیـانی تیـا بەردەوام نەئەبوو..

-٧-

ئەمانە هەموو پێشەکییەکن بۆ ژیان، ئەو سەرەتایانەی دەمانگەیەننە ئەنجام، هــەر پێشەکییەکیش لەم پێشەکییانە ڕێی تێ ناچێت بە ڕێکەوت بێت، مەگەر بــە ڕێـژەی ١ بـۆ ژمارەیەکی زۆر خەیاڵی نەبێت!، دەشبینین هەموو سەرەتایەك لە سەرەتایەکانی ژیان لەم گەردوونەدا، ڕێی تێ دەچێت لەسەر مەلایین شێوەی تر بوایە، بەڵام تەنیا یەك لەو هەموو ڕێ تێچووەمـان وەرگرتـووە، هـەرواش دووەم پێشـەکی ڕێی تـێ دەچـوو لەسـەر مــەلاین ئەگەری تر بوایە، بەڵام تەنیا یەك دانە وەرگیراوە، جا بە بەرەندەبوونی ئەو هەڵبژێرراوانــە لە نێوان ئەو هەموو ڕێتێچووانەدا کەشی گونجاوی ژیان هاتۆتە دی، ئایا دەکــرێ شـرۆڤەی ئەو هەمووە بە بێ ئیرادە بکرێ؟ ئـەو ئیرادەیـەی کـە بوونێکـی مومکـین بەسـەر بوونێکـی مومکینی تردا ئەدا؟



-٨-

**ئەمە بە تەنیا ئیرادەیە.**

جا با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر وتەی زانا پێشینەکانمان:- هەر شتێك لەم بوونەدا دەگونجێت لەسەر سیفەتێك بێتو دەشگونجێ لەسەر سیفەتی تر بێ، ڕێی تێدەچێت لە شوێنێك بێت، ڕێشی تێدەچێت لە جێگەی تر.. یان ڕێی تێدەچێ لە ڕووگەیەکەوە بێت، یاخود بە ڕووگەی ترەوە... دەگونجێت بە ڕێژەیەك بێتو دەشگونجێت بە ڕێژەی تر بێت، تەنیا توانستو ئیرادەی خوداوەندە دەتوانێ شیتەڵی بەرەندە کردنی یەکێك لەو ئەگەرانە بکات، تا گەردوون یەك پارچە بۆتە یاسایەکی ڕێكو پێكو هەموو شتێك تیایدا لەسەر قەشەنگترینو ڕازاوە ترین شێوەیە.

-٩-

**لە کۆتاییدا:-**

ئەوانەی کە دەڵێن بەرپابووەکانی ئەم گەردوونە هەمووی لە دایك بووی ڕێکەوتە، ئەوا زانیارییەکی وا دەبەخشن بەو ڕێکەوتە کە توانستی تەواوو هێزی ڕەهای هەبێت، بەجۆرێك کە بزانێت، بیەوێت، پێوانە ساز بێت، ئالەمەشدا لە ژیری هەموو مرۆڤایەتی زیاتر بەکار لەجێیی ئیش دەکات، بەشێوەی زیرەکییەکی بێ کۆتا.

ژیریی خاوەن زیرەکی، هەر زوو بڕیار لەسەر ئەوە ئەدات کە لە کوێ حوکم هەبێت، ئا لەوێش زانستو ئیرادەو هێزو ژیان دەبێت، کەی ئەم سیفاتانەش هەبوون، ئەوا زاتێك دەبێت کەوا بەم سیفاتانە هەستا بێت.

ئەو پێنووسەی کە پێی دەنووسین وا هەست دەکەیت بۆ مەبەستی نووسین ئامادە کراوە، هەروەها عەمباری مەرەکەبیش تێیدا بە مەبەست تیایدا سازێندراوە، هەروەها بەرگی پاندانو ئەو کونەی تێیدایە ئەرکی خۆیان هەیە؟ هەروەها ئەو دەسکەی بە

گیرفانتـەوە تونــدی دەکــەیتو وشــك بوونــەوەی دەرزیو نووســینیو ناوەڕۆکــە خــەت خەتەکـەی ,هـەموو ئەمانـە سـوودی تایبـەتی خۆیـان هەیـە، ئـەو پێنووسـەی هـەموو ئـەو شتانەی تێدایە، ئەگەر یەکێك بیـەوێت قەناعـەتت پـێ بکـات کـە لـە خۆیـەوە بـە ڕێکـەوت دروست بووە نەك بە هۆی زانستی مرۆڤو تواناو هێزو ژیانو زاتی مرۆڤەوە، ئەوە بێگومان تۆ ئەو کەسە بە نەفامو گێژ دادەنێیت؛ چۆن دێـت بـە خـەیاڵتدا کـە مـرۆڤ: ئـەم ئـامێرە گەورەو کارگە گرانەو خاوەنی ئەندامی هەرسو ئەندامی سـووڕانەوە بەڕێکـەوت بێتـە دی؟ یان دارو درەختی خاوەن ڕەگو ریشەو لقو پـۆپو خـاوەنی قـەدو بـاڵای بـەرزو نـزم، کـە هەناسـە دەداتو کارلێکـەری تیـادا روو ئـەداتو شـێوەی جۆراو جۆرو بـەرو بـووەو گـوڵ دەگرێ، هەر لە خۆڕا بە ڕێکەوت بێتە دی؟ (کارگەیەك لە هەموو دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ ئاڵۆزتر بێت؟) هەروەها جیهانی گەردیش کە وزەو جوڵەو پێکهاتە لە خـۆ دەگرێـتو ئەو کارلێکانەی لێوەی دروست دەبێت،و هـەزاران نموونـەی دی لـەم بـارەوە، ئایا هـەموو ئەمانە کاری ڕێکەوتن؟ ئایا ژیریەك ئەم بیر کردنەوەی هەبێت شایستەی ئەوەیە بە زانسـت-پەروەر ناوی بێنین؟ لە کاتێکدا بەرەنگاری هەموو ڕێسایەکی زانست دەوەستێت.

﴿قتل الإنسان ما اكفره﴾عبس/١٧.

واتە: با بکوژرێ مرۆڤ کەچی ها سپڵەو نا سوپاسە؟ (قتل الإنسان بە فــەرموودەی زەمەخشەری خراپترین نەفرینە ئەوەندەی مەرگ بووبێ).

﴿أو لم ير الإنسان أنا خلقناه من نطفة فإذا هو خصيم مبين﴾ يس/٧٧.

واتە: ئایا مرۆڤ نەیدی (نازانێ) کە بەڕاستی ئەومان لە تـۆو خولقـاند، جـا ئـەو (وا بەهێز بووە کە) ئێستا بۆتە دوژمنێکی دیار.



# دیاردەی سێهەم

## دیاردەی ژیان

-١-

مەبەست لە لێکۆڵینەوەی ئەم دیاردانە گەیشتنە بە (اللّٰه)ی پەروەردگارو بڕواهێنان پێی، بە حوکم دانی عەقڵ بەسەریدا، کاتێك لە دیاردەیەکی وا دەکۆڵینەوە ئەوا ئەمانەوێ ئاماژە بەو لایانانە بکەین کە ئامـاژەی پەروەردگارمان بۆ دەکەن، چونکە لە هەموو دیاردەیەکدا چەندان لایەنو بوار هەیە کە نایەنە هەژماردن، ئیسپاتی(اللّٰه)ی بەدیهێنەر دەکەن.

لەسەرەتای ئەم دیاردەیەدا دەڵێین: چونکە هەندێ کەس وا گومان دەبەن کە بیر کردنەوە لە گەردوونو لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی بە قووڵیو ڕێکخستنی پێشەکییەکان لەسەر بەرەنجامەکانو گەیشتن بە ڕاستییەکانو فڕیدانی ئەفسانەو خەیاڵو زاڵ بوون بەسەریانداو دەست گرتن بەو یاسایەی کە تەجروبەو ئەزموون بۆی سەلماندوون... ئەوانەی وا دەڵێن ئەوا لەگەڵ بیر کردنەوەی ئایینیدا ناگونجێن.

ئەگەر ئەمە لە ناو ئایینە هەڵەو ڕێچکــە پووچــەکاندا هــەبێت، ئــەوە لـە نـاو ئـاییـنی ڕاستیدا جێی نابێتەوە،و هەرگیز ناشبێت، چونکە ڕاستی لەگەڵ ڕاستیدا بەرەنگار نابێت. جا گەر ئایین حەق بێت، کەواتە دەبێت هەموو ڕەسەنایەتییەکی تیا بێت،و هەموو لقێك لە لقەکانی تیا بێت، تەواو لەگەڵ ئـەو ڕاستیيانەدا یـەکانگیر ببێـت کـە بەڵگـە سـەلماندونی، ئەگەر ناتەواوییەك هەبێت یا خود دەقێك لە دەقــەکانی ئـایین لەگـەڵ ڕاسـتی تـەواودا یـەك نەگرێتەوە، بەسە بۆ ئەوەی بڕوا بەو ئایینە لەق بێت.

-٢-

کـاتێك لەمــەڕ هــەندێك بـواری دیاردەی ژیـان، گوتـن‌و بەرپــەرچی ڕوودەدات، ئــەوا پێویستە لەمەڕ هەندێك یاسا بدوێین کە سەبارەت ڕاستی ئیسلامەوە بێت، تـا تووشـی بـێ سەروبەری نەبین، لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەی کە ئەم لایەنانە هیچ پەیوەندی بـە بابـەتی بەڵگەی دیاردەی ژیانەوە نیە لەسەر خوای گەورە، ئەوا دەڵێین:–

١– ئیسلام بیر کردنەوەو لێکوڵینەوەی لەسەر مرۆڤ پێویست کردووە، ئایەتەکانی قورئانیش لەم واتایەدا زۆرن:

﴿أولم يروا في ملكوت السموات والأرض وما خلق الله من شيء﴾الأعراف/١٨٥.

واتە: ئایا لە حوکومەتی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئــەوەی لـە هــەر شـتێك خـوا خـەلقی کردووە ناڕوانن (تا پەند بگرن). ﴿قل انظروا ماذا في السموات والأرض﴾يونس/١٠١.

واتە: بڵێ بڕواننە ئەوەی وا لە ئاسمانەکان‌و زەویدایە. ﴿أولم يتفكروا في أنفسهم؟ ما خلق الله السموات والأرض وما بينهما إلا بالحق وأجل مسمى﴾الروم/٨.

واتە: ئایا ئەوانە لە دڵی خۆیان بیریـان نەکردۆتـەوە کـە خـوا ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و ئەوەی لە نێوان ئەو دوانەدایە، تــەنیا بـە هــەق‌و نـەزم بـۆ ماوەیـەکی دیـاری کـراو خـەلقی کردووە.

٢- ئیسلام زانست لەسەر مرۆڤ پێویست دەكات، بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرە، ئایەتیش هەیە ئاماژە بەوە دەكات كە زانایانی گەردوون زیاتر خوداوەند دەناسن ﴿ومن آياته خلق السموات والأرض، واختلاف ألسنتكم، إن في ذلك لآيات للعالمين﴾الروم/ ٢٢.

واتە: و لە نیشانەكانی ئەوە بەدی هێنانی ئاسمانەكانو زەویو تەفاوتو جیاوازی زمانەكانتانو رەنگەكانتان، بەڕاستی لەمەدا نیشانەگەلێك بۆ جیهانیان هەیە. ﴿ألم تر إن الله أنزل من السماء ماءً، فأخرجنا به ثمرات مختلفاً ألوانها، ومن الجبال جدد بيض وحمرٌ مختلف ألوانها، وغرابيب سود، ومن الناس والدواب والأنعام مختلف ألوانه، كذلك إنما يخشى الله من عباده العلماء﴾فاطر/٢٧-٢٨.

واتە: ئایا نەت دی كە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی نارد بە هۆی ئەوەوە میوەی جۆراو جۆرمان (لە زەوی) رواند بە رەنگی جۆراوجۆر لە كێوانیش جادەگەلێكمان سازدا بە رەنگی سپیو سورو رەنگی جیاجیا،و جارجارەش بە رەنگی رەشی پڕ رەنگ،و لە مرۆڤو جولّندەكانو ئەنعام (وشترو مەڕو بزنو گایش) بە رەنگی جیاجیاوە (بەدیمان هێناون)، بەڕاستی لە نێو بەندەكانی خوادا تەنیا زانایان لەو ئەترسن.

٣- لێرەوە ئاشكرا دەبێت كە ئەوەی فیكرو زانست گەیشتویەتێ پێویستی دەكات لەسەر موسوڵمان كە دانی پیا بنێتو پێچەوانەكەی نەڵێت، رەنگە هەندێ موسوڵمانی نەفامۥتەنانەت ئەوانەی خۆیان بە زانستخواز لە قەڵەم دەدەن بەرەنگاری هەندێ راستی زانستی بكەن، بەڵام لەم حاڵەتەدا تەنیا رای تایبەتییان دەردەبڕنو تیایشیدا هەڵەنو لەمەشدا زۆربەی موسوڵمانو زاناكان راستییەكان هەست پێ دەكەن.. پێشەوا غەزالی لە كتێبی (تهافت الفلسفة)دا سەبارەت زانایانی ئایین لەوانەی نكۆڵی راستییە زانستییەكان دەكەن وەك: زانینی كاتی خۆر گیران، مانگ گیران و... هتد، پێیان دەڵێ:-

(ئەوەی وا تێدەگات مونازەرە بكات لە ئاییندا بەوەی كە ئەمانە لە ئاییندا نینو پووچن، ئەوە نا حاڵییە لە ئایینو لاوازی دەكات، چونكە ئەم شتانە بەڵگەی ئەندازەییو ماتماتیكی لەسەر هەیەو هیچ گومانێك ناهێڵنەوە، ئەوەی پێیان بزانێو لەڕاستی بەڵگەكان

بکۆڵێتەوە، پاشان پێی بگوترێت: ئەمە بە پێچەوانەی شەرعەوەیە، ئەوا گومان لە زانست پەیدا ناکات، بەڵکو لە ئاییندا پەیدای ئەکات، زیان دەگەیەنێت بە شەرع لە بری ئەوەی سوودمەند بێت بۆی، بەم بۆچوونە هەڵانە، زیاد لەو کەسەش زیان دەگەیەنێت کە تانەو تەشەر لە ئیسلام دەدات، ئەمە وەك ئەو کەسە وایە کە سەبارەتی دەڵێن: (دوژمنی زانا لە دۆستی نەزان باشترە).

ئەوە جێی بڕوا نیە کە خوای گەورە فرمانمان بە گەڕانو بینینو مەعریفەو زانست پێ بکات، پاشان بەرئەنجامی ئەم زانستو لێکۆڵینەوەیەو مەعریفەیەمان لێ حەرامو قەدەغە بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە گەر فرمانمان بە بیر کردنەوە پێ بکات ئەوە ئیمانمان بە وەرگرتنو رازی بوون بەو بیر کردنەوەیە پێ دەکاتو هتد...

٤- بەڵام گەر ئیسلام ئاینێکی زانستی بێت، موسوڵمانیش بیر کردنەوەو ئاراستەکانی زانستییانە بێتو ئامانجی ئەوە بێت کە بگاتە راستییە زانستییە خەستو چڕەکان، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بە گومانیش رازی بێتو رەتی نەکاتەوە. یان گریمانو بیردۆزەکان بە راستی زانستی تێ بگات. موسوڵمان پێویستە لەسەر زەمینەیەکی بەردینی بیر کردنەوەدا بوەستێ، خوای گەورە کە حەرامی کردەووە لەسەرمان بەرپەرچی راستی نەدەینەوە، رازی نیە شتێکیش بێ بەڵگە وەرگرین، یاخود گریمانو بیردۆزیش بەڕاستی وەرگرین، وەك شتێکی بێ بەڵگە!

﴿ولا تقف ماليس لك به علم، إن السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسؤولاً﴾ الإسراء/٣٦.

واتە: و لەوەی نایزانی پەیڕەوی مەکە، بە هەقیقەت گوێ و چاوو دڵ هەموویان لەو (کرداوانە) بەرپرسن.

﴿إن يتبعون إلا الظن وإن الظن لا يغني من الحق شيئاً﴾ النجم/٢٨.

واتە: ئەوانە پەیڕەوی ناکەن مەگەر لە گومان،و بەڕاستی گومان (مرۆڤ) لە هەق بێ نیاز ناکاو جێی ئەو ناگرێ.

﴿أمن يبدأ الخلق ثم يعيده ومن يرزقكم من السماء والأرض أإله مع الله قـــل هـــاتوا برهانكم إن كنتم صادقين﴾ النمل/٦٤.

واتە: یا کەسێ کە ئافەریدیش دەس پێ دەکاو لە پاشان دەیانگێڕێتەوە، و کەسێ کە لە ئاسمانو زەوی رسقو رۆزیتان ئەدا، ئایا مەعبودێ لەگەڵ خودا هەیە؟ (نا نیە) بڵێ: بەڵگەتان بێنن ئەگەر راست بێژن؟.

﴿قل أرأيتم ما تدعون من دون الله أروني ماذا خلقوا من الأرض أم لهـــم شـــرك في السماوات ائتوني بكتاب من قبل هذا أو أثارة من علم إن كنتم صادقين﴾ الأحقاف/٤.

واتە: بڵێ: ئایا دیوتانە ئەوانەی کە بێجگە لە (اللّٰه) بانگی دەکـەن بـە مـنی نیشـان بدەن چییان لە ئەرزدا خولقـاندووە؟ یا لەبـەدی هێنـانی ئاسمانـەکاندا چ بەشـداریێکیان هەبووە؟ کتێبێ کە بەر لە قورئان هاتووە یا شوێنەواری عیلمێ لە رابردووان بـۆ مـن بێنـن ئەگەر راست بێژن (تابەڵگەی راست بێژیتان بێ).

﴿إن يتبعون إلا الظن وما تهوى الأنفس، ولقد جاءهم من ربهم الهدى﴾ النجم/ ٢٣.

واتە: ئەوانە پەیڕەوی ناکەن مەگەر لە گومانی بێ پایەو هەوای نەفسی خۆیـان، بـە هەقیقەت لە لایەن پەروەردگاریانەوە ڕێنوێنییان بۆ هاتبوو.

ئەمە ئەو جیاوازییە گەورەیەیـە لـە نێـوان عەقڵییـەتی ئیسـلامیو ئەقڵییەتـەکانی تردا.. عەقڵییەتی ئیسلامی عەقڵییەتێکی زانستی جێگیرە، هیچ شتێ بێ بەڵگە وەرناگرێ، هیچ شتێکیش ناخاتە ڕێزی راستییەکانەوە گەر بەڵگەی یەکلا کەرەوەی لەسـەر نـەبێ، بـە پێچەوانەی عەقڵییەتەکانی ترەوە کە زۆر جار گومڕاکەر دەبێت، شتێکی زانستی نەبێت بـە زانسـتی دادەنـێو بـڕوای پـێ دەکـاتو وەك شـتێکی کۆتـاییو بـڕاوە تەماشـای دەکـات، هەرچەندە بەڵگەکانیش لاوازو هەڵـە بـن، عەقڵییـەتی موسـوڵمان وەك چـۆن ڕەفـزی ئـەوە دەکـات دژی زانسـت بێـت، هـەرواش ڕەفـزی ئـەوە دەکـات کـە: بـەهرەیی (حـدس)، یـا گوماناویو خەیاڵاویو ئەفسانەیی بیر بکاتەوە.

-٣-

لەو کاتەوەی ئاینی ئیسلام هاتووە داوای فراوانبوونی عـەقڵی موسـوڵمان دەکـات بەسەر ژیانو زانستو تەجروبەدا، لەو کاتەوە دەسـتی کـردووە بـە شـیکارکردنی گرێکـانی گەردوون بە عەقڵییەتێك کە بیەوێت هەموو شتێك بزانێتو گەردوونیش هەمووی بخاتە ژێـر هـەوڵی ئەزموونکارییـەوە، ئەوسـا یاسـاکانی لێ هـەڵدەهێنجێ کـە تیـایدا هەیـە، ئیـدی شارستانی ئیسلامی سەری هەڵدا، کە بە گەشاوەترینی شارسـتانیەت دادەنرێ، هەمیشـە لە هەوڵی زیاتر دایە بۆ زانستو پشکنینی زیاتر، ئەوەش کە گومانی تێدا نیـە ئەوەیـە کـە لوقاحی بـیری ئیسـلامی ئـەزموونکاری، بـووە هـۆی لـە دایك بوونـی عەقڵییەتی رۆژاوایـی ئـەزموونکاری، کـە لەبــەرەنجامیدا –وەك بــەرووبومێکی– ژیــاری زانســتو پیشەســازی رۆژاوایی لێوەی بـەرپا بـوو، جـا گـەر ئـەم لێکدانـەی نێـوان ئـەزموونو ئـاین لـە جیـهانی رۆژئاوادا بەرپا بووبێ، ئەوا تاوانی ئاینێکی هەڵگەڕاوە و شێواوە، کە بەرانبەر راستییەکان خۆی ناگرێ.

بەڵام ئەو شتەی لەوێ رووی دابوو، نە لە کۆنو نە لە نوێدا لای ئێمە رووی نەداوە، جێـی هاتنـە دیش نیـە، چونکـە راسـتییەك بـەرەنگاری راسـتییەکی تـر نابێتـەوە، بـەڵکو پشتیوانی دەکات، راستـرین ئاینیش ئاینی پەروەردگارە، گەردوونیش بـەدی هێـنراوی خوداوەندە، کەواتە رێی تێ ناچێ کە ئەوەی خوا دروستی کردووە بەرهەڵستی ئـەو شـتە بکات کە لە بارەیەوە هەواڵی پێداوین.

بۆیە سەیرترین دیاردە کە جیهان بە خۆیەوە بینیوە، ئەوەیە کە ئایەتێکی قورئان کاتێك باس لە شتێك دەکات هـەموو راستییە زانسـتیەکانی لـەو کێشـەیەدا دەرخستووە، هەرچـەندێکیش راسـتییەکان زیـاتر روون ببنـەوە ئـەوا لـەو ئایەتانــەدا دەبینرێنــەوە، لــە ئیعجازەکـانی قورئانیشـدا کـە دێینـە سـەر بـاس کردنـی، ئـەم واتایـە بـە روونوئاشـکرایی دەخرێنە روو، ئەو کاتـە لامـان ئەچەسپێنێ کـە چـۆن حـەق بـەرەنگاری حـەق نابێتـەوە،

ئەمەش ئەوە ناگەیەنیت کە هەموو کاتێك مرۆڤ هەستیو شتێك بلێت، مەرج نیە لە قورئاندا هەبێت، یان قورئان لە بەرژەوەندی ئەو قسەیە لێك بدەینەوە، قورئـان زۆر دوورە لەوەوە کە شوێن کەوتوو بێت، بەڵکو خوا ناردوویەتی کە شوێنی بکەوین، نەك ئـەو شـوێن کەوتە بێت، قورئـانو راستییە زانستییەکان پێچەوانـەی یـەکدی نـین، بـەڵکو کـاتێك راستییەکی زانستی بە شێوەیەکی تەواو چەسپا، ئەوا دەقـی قورئـان کـە پـەیوەندی بـەو راستییەوە هەبێت بە پێی ئەو تێ دەگەین، بەڵکو لەم حاڵەتانەدا دەقی قورئان پێش ئـەو ئامارەیە دێت، هەر چەندە بە درێژایی چەندان سەدە مرۆڤەکان لێی بـێ ئاگـا بـن؛ بـەهۆی کەمی زانستییانەوە بە گەردوون.

-٤-

بۆیە ئەم پێشەکییەمان باس کرد چونکە لێکۆڵەرەوەی دیـاردەی ژیـان داوای ئـەم روونکردنەوانەمان لێ دەکات لە بیردۆزی گەشەکردندا، وەك بیردۆزی شیتەڵ کردنـی جـۆراو جـۆر بوونـی زینـدەوەران،و سـەر هـەڵدانی مـرۆڤ، سـەبارەت ئـەم بابەتـەش ئـەم خاڵانـە پێویستن:

١- ئەو رایەی دەڵێ مرۆڤی ئێستا کە لـە دایكو بـاوك بـووە لـە بنـەڕەتدا مـەیمون بووە، ئەمە هەڵەیەو هیچ گومانێکی تێدا نیە، ئەمە بە هـەردوو زمـانی زانستو قورئـانیش دەڵێین:

سەرەتا، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ ﴿إن مثل عيسى عند الله كمثـل آدم خلقه من تراب ثم قال له كن فيكون﴾ آل عمران/٥٩.

واتـە: بەڕاسـتی مەسـەلی عیسـا لای خـوا، هـەروەکو مەسـەلی ئادەمـە کـە لـە خـاك بەدیهێناوەو لە دواییدا پێی فەرموو ببە، ئەویش هاتە بوون.

هەروەها دەفەرموێ ﴿بدأ خلق الإنسان من طين﴾ السجدة/٧.

واتە: و سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤی لە گڵ دەست پێ کرد.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ ((إن الله عز وجل خلق آدم من قبضة قبضها من جميع الأرض، فجاء بنو آدم على قدر الأرض، فجاء منهم: الأحمر والأسود وبين ذلك، والسهل والحزن، والطيب والخبيث)) قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

هەروەها دەفەرموێ: ((لما خلق الله آدم ونفخ فيه الروح، عطس، فقال: الحمد لله، فحمد الله بإذنه، فقال له ربه: رحمك الله يا آدم، إذهب الى أولئك الملائكة - الى ملأ منهم جلوس- فقل: السلام عليكم... فقالوا: وعليك السلام ورحمة الله، ثم رجع الى ربه فقال: إن هذه تحيتك وتحية بنيك بينهم))

بەڵام بە زمانی زانست:

١- سەرجەم مێژوو، لەهەموو تۆمارو گەشتو بەسەرهاتەکانیدا،و هەموو بەردێك لە بەردەکانی، هەموو گێڕانەوەکانیش کە نەوەکان لە بابو باپیریانەوە دەیگێڕنەوە ناوی ئادەم دێنن وەك باوکی مرۆڤایەتی.

٢- ئەو جیاوازییە زۆرانەی لە نێوان مرۆڤو مەیمونو ئاژەڵەکانی تردا هەیە، دەری دەخات کە هیچ پەیوەندییەکی لە دایك بوون نیە لە نێوان مرۆڤی ئێستاو هیچ جۆرە ئاژەڵێك، ئەو جیاکارییانەی لە بواری لاشەییەوە دەست پێ دەکاتو لە رەوشتدا دوایی دێت، لەو نێوانەشدا بیرو زانستو توانا هەیە.هتد....

هەر ئەم کێشەیە وای لە هەندێك لایەنگرانی (داروین)یش کردووە وەك (کوالدس) کە بڵێت (گەشەو پێشکەوتنی هەڵبژاردنی سروشتی جێی باوەڕ نیە لای مرۆڤ، هەر دەبێت یەکسەر بگوترێت بەدیهاتووە، هەروەها (فرخۆ) دەڵێ (لە باری واقیعەوە جیاوازی نێوان مرۆڤو مەیمونمان بۆ دەردەکەوێ، رێی تێناچێ کە بڵێین مرۆڤ لە رەچەڵەکی مەیمونو ئاژەڵانی ترە، باشیش نیە ئەوە بدرکێنین).

٣- دۆزینەوەی کرۆمۆسۆمەکان (الصبغيات) کە هۆکاری گواستنەوەی سیفەتە رەچەڵەکییەکانە، وای لە زانایان کردووە تووشی نارەحەتی ببن بە گوتنی ئەوەی کە مرۆڤ لە پشتی مەیمونە، چونکە ئەم رەگەزو ریشاڵە رەنگاو رەنگانە (العرى الملونة)

ژمارەیەکی چەسپاوی هەیە لە هەموو جۆرێکی مرۆڤ و ئاژەڵدا، کە بە هۆیەوە جۆرو جنسەکان جیا دەکرێتەوە.

جا گەر قورئان و زانست ئەمە بدرکێنن کە گوتمان، ئەوا هیچ گوتنێکی تر نامێنێتەوە، بەڵکو گەر زانست بە گومان بێت و قورئان بیدرکێنێت ئەوا هەموو مرۆڤێکی ژیر لەگەڵ قورئاندا دەبێت، چونکە ئەو پەروەردگارەی مرۆڤی بەدیهێناوە باشتر دەزانێ چۆن دروستی کردووە.

﴿ما أشهدهم خلق السموات والأرض ولا خلق أنفسهم﴾ الكهف/٥٠.

واتە: لە کاتی بەدیهاتنی ئاسمانەکان و زەویدا حازرم نەکردن و هەروەها لە کاتی بەدیهاتنی خۆیان (حازرم نەکردن).

بەڵام جۆرەکانی تری ژیان، ئەوا رەنگە ئەو زانایانەی کە پشتی داروینیان گرتووە زیاتر نەبن لەو زانایانە کە بەرپەرچیان داوەتەوە، جا مادام باسەکە بووە جێی مشت و مڕو گوتن و بەرپەرچ دانەوە، ئەوا ئەو شتە تەنیا لە سنووری بیردۆزدا دەمێنێتەوە، و ناگاتە ئاستی زانستی بەهێز.

ئێستاش هەندێك لە وتەی زانایان لەم رووەوە دەخەینە روو، بۆ نموونە (وولتر أدوار لامبرتس) تایبەتمەندی زانستی رەچەڵەك دەڵێ: (زۆر لەراستییەکانم بۆ ئاشکرا بوون، لەوانە بۆ نموونە زانستی رەچەڵەکناسی هیچ بەڵگەیەکی پێشکەش نەکردووین لەسەر ئەو دوو ئەگەرەی کە(چارلز داروین) بیردۆزەکەی لەسەر بنیات ناوە لە گەشەی جۆرەکاندا، ئەو دووانەش:-

١- ئەندامە بچووکەکانی هەر نەوەیەك لە نەوەکان بەلای ئەوەدا ئەچێت کە هەندێك جیاوازی کەمی لەگەڵ باووباپیرانیدا هەبێت لە هەموو رووگە رێتێچووەکانەوە.

٢- گۆڕانکاریە باش و سوودمەندەکان لە نەوەکانی داهاتوودا رەچەڵەك دیاری دەکات، بەرەنجامەکەشی کەڵەکە دەبێت، تا ئەگاتە ئەوەی کە گۆڕانکاری لاشەیی بەرپا بکات.



لەواقیعدا گەورەترین گۆڕانکاری بەسەر گیانەوەران و رووەکدا دێت، رێی تێدەچێت زوو بێتەدی بەهۆی هەڵبژاردن و پەروەردەوە، کوتانی خودییش (التلقیح الذاتي) لە رووەک و زاووزێی نزیکان لە گیانەوەراندا بەڕادەیەکی زۆر ئەبێتە هۆی بەرهەم هاتنی تاکی لاواز، ئەم گۆڕانکارییە لە هەموو رووەکانەوە روونادەن وەك داروین دەڵێت! تەنیا مەگەر هەندێك بازدانی تووش بێت، ئەمەش زۆر کەم روودەدات.

ئەم بازدانانە وێڕای کەمی روودانیان، کەچی زاناکانی گەشەکردن راڤەی دیاردەی گەشەسەندنی لەسەر بنیات دەنێن، بەڵام ئایا ئەم بازدانانە دادەنرێت بە هۆکارێکی پێشکەوتن؟ لە لێکۆڵینەوە درێژەکاندا کە پەیوەندی بە بازدانەوە هەیە لە زۆربەی بەدیهاتووەکاندا، بەتایبەتی لە مێشوولەی میوە کە ناودەبرێت بە (درۆسۆفیلا میلانۆجیستەر)، ئەوە دەگەیەنێت کە زۆرینەی ئەو بازدانانە بە شێوەی (مرینەر) دوایی دێت، بەڵام جۆرە نامرینەرەکان ئەوا ئەو گۆڕانکارییانەی کە هاوشانیەتی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی تێکچوون و ناقۆلابوون (تشویه)، یان بەلایەنی کەمەوە ئەو جۆرە یەکسانەیە کە کارتێکەری فسیۆلۆجی بەجێدێڵێ و لە هێزی تاك کەم دەکاتەوە، کەواتە زۆر گرانە کۆبوونەوەی ئەم بازدانە رەچەڵەکییانە ببێتە هۆی بەرپابوونی گۆڕانکاری پێویست بۆ بەدیهاتنی جۆری نوێ، کە زۆر پێشکەوتووتر و لەپێشتر بێت لە پێشینەکەی، بازدان لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی و شازدا دەبێتە هۆی چاککردنی سیفەتێ لە سیفەتەکان، وەك چۆن لە باڵی (درۆسۆفیلا) روودەدات، بەڵام کۆبوونەوەی ئەم سیفەتە لەگەڵ هەندێ سیفەتی تردا، کە بەسەر باڵەکەدا دێت ئەبێتە هۆی پێك هاتنی زیندەوەری تەمەن کورت و کەم توانا لەسەر ژیان دا.

با بۆ جەدەل، دان بنێین بەوەدا کە بازدانی دەگمەن روودەدات و لەگەڵ خۆیدا ١٪ گۆڕانکاری چاك بەرپا دەکات، جا ئەم بازدانانە چەند نەوە دەخایەنێت، تا کۆبێتەوە و بەرەنجامەکەی دەرکەوێت و ببێتە هۆی بەدیهاتنی جۆرێکی نوێ؟

(باتو) لە کتێبی (التحلیل الریاضي لنظریة التطور) روونی کردووەتەوە کە: گشتگیر کردنی سیفەتێك لە سیفەتەکان، لەرێگەی بازدانەوەو لەپشتێ لە پشتەکان، لەیەك ملیۆن نەوەی کەمتر ناوێت بۆ ئەم مەبەستە، تەنانەت ئەگەر پێشکەوتنی کایە جیۆلۆجییەکانیش لە پێش چاو بگرین وەك جیۆلۆجیناسەکان دەیخەملێنن، هێشتا گرانە ئەو بۆ چوونە تەوەقوع بکەین (بۆ نموونە): ئاژەڵێکی نوێی وەك هێستر لە ئاژەڵی پێش خۆیەوە دروست بووە، کە ژمارەی پەنجەکانی پێی (پێنج پەنجە) بوون، لەماوەی چاخی بەردینەوە تاکو ئێستا.

(لیکۆنت دی نوی) دەڵێت: وشەی ئەڵقە وشەیەکە زۆر گرنگی هەیە لە مێژووی بوونەوەرە زیندووەکاندا، چونکە ناتوانرێت ئەوە بسەلمێندرێت کە شێوەیە لە شێوەی بوونەوەران ئەڵقەیەکی راستەقینەی پێك هێنابێت، ئەمە رەنگە لە هەندێك حاڵەتدا رێی تێبچێت، بەڵام جەختی لەسەر نەکراوە، هەر چۆنێك بێت دەتوانین بڵێین: هیچ شێوەیەك نیە کە ئێستا بە شێوەیەکی راستەوخۆ شوێنی شێوەکەی تری گرتبێتەوە، مرۆڤ لە مەیمون دروست نەبووە، بەڵام لە نێوان بە جوڵەخراوەکاندا (المستحاثات)، ئەوا زۆربەی شێوەکان کە بە شێوەی مامناوەندی ناوزەد دەکرێن چەند هەوڵێکی ناسەرکەوتوون بۆ چۆنایەتی، رەنگە هاوچەرخ یان پێشین یان دوای شێوە گوێزراوە حەقیقەتییەکان بێت. أه

گرنگترین ئەڵقەش وەك ئەڵقەیەکی تەواوی ئەڵقەکانی گەشە کردن کە هەندێك وای دەبینن ئەڵقەیەکی پێکەوە بەستنی زنجیرەییە لای هێستر، کە بۆ ئەمەش شەش شێوەی مامناوەندییان پێشکەش کردووە، لە (الهیراکوثیریومو الایوهیبوس)ەوە دەست پێ دەکات لەسەردەمی (ایوسینی) ەوە کەنزیکەی پێش (٥٠ ملیۆن) ساڵ دەکاتو بەم شێوە هێسترەی ئەمڕۆ دوایی پێ دێت، بەڵام ئەم شێوە مام ناوەندییە وا دەردەکەوێت لە پڕێکا دەرکەوتبێت، تا ئێستاش پردی پەیوەندی نێوان ئەم شێوە مامناوەندییانە نەدۆزراوەتەوە بە هۆی کەمی (بەجوڵەخراوەکان–المستحاثات)ەوە، بەڵام تەنانەت لە کاتی چەسپاندنو

هاتنەدی ئەمەشدا، ئەوا هیچ بەڵگەیەك نادەنە بۆ چوونەکەی داروین، چونکە هێستر هەر بە هێستریماوەتەوە، ئەگەرنا با بەڵگەی ئەوەمان بداتێ کە هێسترێك بوویێت بە حوشتر!

هەروەها (لیکونت دی نوی) دەڵێ (هەر لەسەرەتاوە تێبینی پەیوەندیو جیاوازی بنەڕەتی نێوان ئاژەڵانو ڕووەکدا کراوە، بۆ نموونە شلەی خۆراکدەر لە ئاژەڵاندا خوێنە، خوێنی ئاژەڵە پێشکەوتووەکانیش لەماددەیەکی بنەڕەتی پێك دێت کە بریتییە لە بۆیەیەکی سوورو بە هیمۆگلۆبین دەناسرێت، بە ڕێژەیەکی زۆرو ئاڵۆز تیایدایە، پێکهاتەی ئەمەش لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی تر جیاوازە، کەمترین کێشی گەردیی (٦٩٠٠٠)ە، پێکهاتەی کیمیایی هیمۆگلۆبین نزیکە لەوەی کە لە ڕووەكو قەوزەکاندا (الأشنيات) هەیە، کە بەسەوزە پێکهاتن دەناسرێت، کێشی گەردیشی (٩٠٤)ە، بەڵام هیمۆگلۆبین بەوە دەناسرێت کە ئاسن لە گەردەکەیدا هەیە، بەڵام سەوزە پێکهاتن جەوهەری مەگنیسیۆمی تیادایە، ئەوەش کە کێشەکە زیاتر ئاڵۆز دەکات ئەوەیە کە خوێنی هەندێك لە جومگەکانی پێو کرتێنەو زیندەوەرە خاوەکان (الرخويات)و ئاژەڵانی نەرم لە بۆیەیەك پێك دێت کە کێشی گەردییان تێدا جیاوازە بە پێی جۆرەکان، لە نێوان (٤٠٠,٠٠٠)و (٦,٧٠٠,٠٠٠)دا، هەروەها لە جەوهەری مس پێك هاتووە لە بری ئاسنو مەگنیسیۆم (وەك هەندێ لە جۆری لوولپێچەکان-الحلزونيات-) کەواتە چۆن گواستنەوەی کیمیاوی لە بۆیەکارێکەوە بۆ یەکێکێکی تر ڕوویدا؟. دەبێ بەڕاشکاوی ئەوە بڵێین کە مەحاڵە بتوانرێت ئەمە ڕوون بکرێتەوە).

(هەندێك لە قەوزە شین باوەکان لە عەنبکبۆسپانین (العنبكبوسبانين) پێك دێ، کەچی قەوزە سەوزەکان لە کلۆرۆفیل پێك دێ، هیچ کەسیش ناتوانێ ئەوە بسەلمێنێ کە قەوزە سەوزەکان لە قەوزە شین باوەکانەوە پێك هاتوون، چونکە جیاوازی نێوان ئەم دووانە زۆر گەورەیە، هیچ شتێکیش نیە کە بتوانێ ئەم ڕاگواستنە لێك بداتەوە، چونکە ئەو ژینگەیەی ئەم دووانەی تیادایە:هاوبەشە، کەواتە شیتەڵ کردنەکە بە گۆڕانکاری ژینگە لێك نادرێتەوە).

(با ئەو لە خۆبایی بوونە بخەینە ئەو لاوە کە دەڵـێ: شـتێکی زۆر لـە مـاوەی (١٠٠) ملیۆن ساڵـدا روودەدات، جا گەر هیچ شتێك لە ماوەی یـەك سـاڵدا رووی نـەدا، ئـەوا هیـچ شتێك نیە وا پێویست بكات بە جاران‌و زەرب كردنێك كە بە ملیۆن یان بە (١٠٠) ملیۆن جار روویدات، بۆ ئەوەی بڵێین شتێك لە كۆتایی ئەم زەمانەدا روو ئەدات ئەوا پێویستە هەمیشە خاڵێك هەبێت رووی دابێت هەرچەندە بچووكیش بن، بۆ ئەوەی كێشەكە جێی بڕواو هاتنـە دی بێت)أه.

بۆیە ئەم وتارەمان هێنایەوە تـا بەڵگـە لەسـەر بـیردۆزی گەشـە كـردن بهێنینـەوە، چونكـە لـە راسـتیدا تـەنیا گریمانـــەو هیـــچ بەڵگەیـــەكی تـــەواوو یەكلاكـــەرەوەی لەســـەر نەهێنراوەتـەوە، ئەگـەر سـەهیۆنیەتی جیـهانی‌و شـیوعییەتی جیـهانی پڕوپاگـەندەیان بـۆ نەكردایە هەر زوو لە زەمەنەكەی خۆیدا دەپووكایـەوە، لـە ئـەنجامی ئـەم هـەموو شـاڵاوە زانستییە چڕوپڕەی كە هەزاران زانا كردیانە سەری، لە پڕۆتۆكۆلاتی حاكمەكانی جولەكەدا هـاتووە كـە ئـەوان یارمـەتی سـەركەوتنی داروینیـان داوە، مەبەسـتیشـیان لەمـە شـكاندنی هەموو ئایینێكە لە دەروونی مرۆڤایەتیدا جگە لە ئایینی یەهودی نەبێت!.

هەروەها شیوعیش پەنا بەم بیردۆزە دەگرێ ئەگەر بشزانێ چەوتە، بۆ چەسپاندنی بیردۆزی ماددییەتی جەدەلی، بەڵام هەڵوێسـتی ئێمـەی موسـوڵمان لـەم بابەتـەدا هـەر ئـەو هەڵوێستەیە كە لەمەوپێش باسمان كـرد سـەبارەت بـە هـەموو كێشـەكان، شـتێك بەڵگـەی لەسەر هەبێت وەری دەگرین،و گەرنا لەسـەری رادەوەسـتین ئەگـەر هـاتوو دەقـی قورئـان ئیحتمالی بۆ دابنێت، بەڵام گەر دەقی قورئانی لەسەر هەبوو زانستیش لێی بـە گومـان بـوو ئەوا ئێمە هەمیشە لەگەڵ دەقەكەدا دەبین.

خوای گەورە فەرمانی پێ كردووین كـە بـەدوای دروسـت بوونـی ژیـاندا بگـەڕێین:-

﴿قل سيروا في الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق﴾ العنكبوت/٢٠.

واتە: بڵێ بە زەویدا بگەڕێن‌و بنواڕن كە چۆن خودا بەدیهێنانی دەس پێكردووە.

﴿أو لم يروا كيف يبديء الله الخلق ثم يعيده﴾ العنكبوت/١٩.

واتە: ئایا ئەوانە نەیانزانیوە کە خوا چلۆن ئافەریدیش دەس پێ دەکـاو لـە پاشـان دەیان گێڕێتەوە (زیندوویان دەکاتەوە).

هەروەها فەرمانیشمان پێ دەکات کە تەماشا بکـەین چـۆن گیانـەوەران هاتوونەتـە بوون؟ ﴿أفلا ينظرون الى الإبل كيف خلقت﴾ الغاشية/١٧.

واتە: ئایا بە وشتر ناڕوانن کە چلۆن خەلق کراوە.

تەواوی زانستی یەقینیش لای پەروەردگارە ﴿قال فما بال القرون الأولى؟ قال علمها عند ربي في كتاب لا يضل ربي ولا ينسى﴾ طه/٥١–٥٢.

واتە: وتـی: ئـەی بـارودۆخی پێشـینانمان چلـۆن دەبـێ؟! وتـی: زانیـنی ئـەوە لای پەروەردگارم لە پەڕاوێکدا، پەروەردگارم قەت بزری ناکا و لە بیری ناباتەوە.

ئەوەی کە پەروەردگار هەواڵی پێداوین جگـە لـەوە راسـت تـر دەرناچـێ زانسـتیش بێجگە لەوە شتێکی تر نادۆزێتەوە، ئەوەی لەم بابەتەدا گرنگ بوو باسمان کـرد، ئێسـتاش کـاتی ئەوەیـە کـە دەسـت بکـەین بـە لێکۆڵینـەوەی دیـاردەی ژیـان، تـا پـەروەردگای تیـا ببینینەوەو مەبەستیش لەم لێکۆڵینەوەیە هەر ئەمەیە.. ئیدی دەڵێین:–

دیاردەی ژیان لە چوار لایەنەوە دەبێتە بەڵگەی پەروەردگاریەتی خوای گەورە، بەم جۆرە:

١– دروست بوونی.

٢– هەمەڕەنگیو جۆراو جۆریی.

٣– مرۆڤ.

٤– رەوشتو ئاکار.

هەر لایەنێك لە لایەنەکانی واتای ئەم زاراوانـە بـە مانایـەکی تـەواو بەڵگـەن لەسـەر خوای گەورە، هەرچەندە زۆریش هەوڵ دراوە تا ئەم واتایانە جگە لە خوا بگرێتەوەو ئـەوە دەربخات کە خوا بەدیهێنەر نیـە، لەگـەڵ ئەمەشـدا راسـتی هـەردەم شـەکاوەیە کـە (ﷲ) بەدیهێنەرە.

-٢-١-

**دروست بوونی ژیانو جۆراو جۆرێتی:**

بێ باوەڕان دەڵێن: ژیان لە خانەیەکی سادەوە دەستی پێکردووە، یان لە چەند خانەیەکەوە، ئیدی زۆربوونو گەشەکردن کاری لەسەر کردووە تا ژیان بەم قۆناغەی ئێستا گەیشتووە، بەڵام ئایا بۆ ئەم وتەیە هیچ بەڵگەیەکیان هەیە؟ گەورەترین بەڵگە ئەگەر هەبێ ئەوەیە کە بتوانن ژیان دروست بکەن؛ بەتایبەتی ئەو رەگەزانەی کە زیندەوەرە ناسراوەکانی لێ پێك دێت، لەکاتێکدا پشتو رەچەڵەکیان زانراوە، هەروەها ئامێرو ئەندامەکانیان؛ هەموو شتێك تیایاندا زانراوە، هەموو چەرخێکیش کە ژیانی پێویست بێت دەتوانرێت لە کارگەدا بەرهەم بهێنرێت، هەر ئەو بارودۆخە یەکەمەی کە ژیانی تیا بەرپا بوو ئەگەر بتوانین پێوانەی بکەینو بارودۆخی هاوتای بڕەخسێنین، ئەوا ئەگەر ئەمەش رووبدات ئایا ئەوەی کە دروستی کردووە دەڵێت: بەبێ هیچ شتێكو لە خۆوە هاتۆتە بوون؟ یان دەڵێ: بەهۆی زانستو تواناو هێزو ئیرادەی مرۆڤەوە هاتۆتە بوون؟.

پەروەردگاری مەزنو دلۆڤان بەرەنگاری ئەوانە دەبێتەوە کە خوایەکی تر دەپەرستنو دەسەوسانیان دەکات، ئیدی جۆری ئەو خوایە هەر شتێك بێت، ئەگەر سروشت بێت، یا مرۆڤ بێت، یاخود بت بێت. ئەگەر راست دەکەن با ئەو خوا درۆزنانە مێشێك دروست بکەن؟.

﴿يا أيها الناس ضرب مثل فاستمعوا له، إن الذين تدعون من دون الله لن يخلقوا ذبابا ولو اجتمعوا له، وإن يسلبهم الذباب شيئاً لا يستنقذوه منه، ضعف الطالب والمطلوب، ما قدروا الله حق قدره﴾ الحج/٧٣-٧٤.

واتە: ئەی خەڵکینە مەسەلەیەك هەیە گوێ بدەنێ، بەڕاستی کەسانێ کە هاواری بۆ دەبەن، بێجگە لە خوا قەت ناتوانن مێشێك بەدی بێنن، هەرچەند بۆ ئەو کارە دەست بدەنە دەستی یەکتر،و هەر کاتێکیش مێشێك شتێکیان لێ بڕفێنێ ناتوانن لێی بستێننەوە (طالب

"عابید"و مطلوب "مەعبود"، هەردوو کزو زەعیفن)، ئەوانە بەو جـۆرە کـە پێویسـتە خـوا بناسن، نەیان ناسیوە.

مرۆڤ لەم ئاقارەدا هەوڵی داوە لەم بەرەنگار بوونەوەدا رۆڵی هەبێت، نەوەك تـەنیا مێشێك دروست بکات بەڵکو زۆر لەمەش بچووکتر، بەڵام ئایا ئەنجامەکەی چۆن بووە، بەڵێ بەم جۆرە بووە:-

رووسیا هەوڵیدا بەڵگە بۆ ئەوە بێنێتەوە کە ژیان بە هۆی کارلێکردنی کیمیاوییـەوە رووی داوە -بە پێی بانگەوازی خۆیان- بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر رێچکەی بێ بـاوەڕیی، بۆ ئەمەش سەرۆکی پەیمانگای کیمیاوی رووسی (أوبارین)یـان راسـپارد، داواشـیان لێ کـرد کە تەنیا بۆ یەك لێکۆڵینەوە دەست بەتاڵ بێت، ئەویش ئەمەیە کە ئایا تا چ رادەیەك رێی تێدەچێت ژیان لە رێگەی کارلێکردنی کیمیاوییـەوە بـەرپا بێـت، دوای نزیکـەی (٢٠) سـاڵ هـەوڵو مـاندوو بـوون، لـە سـاڵی ١٩٦٢ ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکـەی ئاشـکرا کـردو ئـەو ئەنجامەش کە پێی گەیشتووە، لە راپۆرتێکی رەسمیدا کـە ئـەو کاتـە هـەموو دەزگاکـانی راگەیاندنی جیهان بڵاویان کردەوە. ئەویش ئەوەبوو کە زانستی کیمیاوی دەستەوسـانە لـە دروست کردنی ژیان لە تاقیگەدا، زانستیش هیچ توانسـتێکی نیـە تـەنیا لـە بـواری ماددەی هەست پێکراودا نەبێت.

لە بری ئەوەی کە دان بنێت بەوەدا کە (ﷲ) بەدیهێنەری ژیانە، بەم جۆرە وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە:

ئایا کارلێکردنی کیمیاوی لەسەر مادده نەبێتە هۆی بەرپا بوونی ژیـان؟ وەك چۆن یەکەم ژیان پێش مەلایین ساڵ سەری هەڵداو بەو جۆرەی کە ئەرنست هیگڵ بانگەوازی بۆ دەکات؟.

-ئەمـە رێی تێدەچێـت بـەڵام لەسـەر ئەسـتێرەکەی ئێمـە نـا، بـەڵکو لەسـەر ئەستێرەکانی تر!. -

ئەمە هەڵهاتنێکی ئاشکرایە لە پرسیارەکە تاکو تووشی تەنگەتاویی نەبێت، ئەگەرنا بۆچی نـەمانتوانیوە کـە ژیـان بەدیبـهێنینو لـە کاتێکـا هـەموو شـتێکیش لەبەردەسـتماندا بوونی هەیە؟.

لـە راسـتیدا زۆربـەی ئەوانـەی بـاوەڕ بـە خـوا نـاهێنن لـەم بابەتــە هــەڵدێن، بــەم بیانووانە!.

ژیـان لـە هـەندێك ئەسـتێرەی تــرەوە لــە شـێوەی (جرثومــە)یــەكدا جیابۆتــەوە کەوتووەتە ســەر زەوی، بێ ئـەوەی هیـچ لـەناو چوونێکـی تـووش هـاتبێت، دوای ئـەوەی ماوەیەکی نادیار لە ئاسماندا ماوەتەوە، لە ئـەنجامدا لەسـەر زەوی جێگـیر بـووە، پاشـان ژیان لەو جرثومەیەوە زنجیرەی بەسـتو شتەکانی لێ پێك هـات، یـاخود دەڵێـت: لـەرێی کلکدار (نیزك)ێکەوە ژیانمان بۆ هاتووە کە کاتی خۆی بەر زەوی کەوتووە.

ئـەم قسـانە جگـە لـەوەی هیـچ راڤەیـەکی زانسـتییانەیان نیـە –بـە پـێی یاسـای بۆماوەیی– لە هیچ بوونەوەرێکیشدا نابینینەوە، کەواتـە ئەمـەش ناماقووڵە. ئەگـەر نـا! چـۆن ئـەم جرثومەیـە توانـی لـە پلـەی خـوارووی سفردا لـەئاسماندا بمێنێتـەوە؟ ئەگــەر توانیبێتیشـی بمێنێتـەوە چـۆن لـەو تیشـکە چرانـە رزگـاری بـووە کـە بـە شـەپۆلی کــورت دەردەچنو هەموو هاونموونەکانی دەکوژێت، ئەگـەر لەگـەڵ ئەمەشـدا هـەر بـە زیندوویێتـی مایەوە چۆن جێگەی شیاوو گونجاوی خۆی دۆزییەوە؟ ئـەی چـۆن ئـەم رێکەوتنـە سـەیرە روویـدا لـەم بارودۆخـــەدا؟ ئەگــەر ئەمــەش روویــداو ژیــان دەســتی پێکــرد، ئایـا ئــەم کۆچە(گەشت) چەندان ساڵی خایاند هەتا گەیشت؟ لە حاڵەتی دووەمیشدا ئەگــەر بـەهۆی کلکدارەوە بووبێت– چۆن بە ساغیو سەلامەتی گەیشتۆتە سەر زەویی؟ دوای ئـەوەی کـە کلکدارەکان تووشی سووتاندن دەبن لە بەرگەهەوادا.

ئەگەر بڕواشمان بە هەموو ئەمانە کرد، ئەوا پرسیارەکەمان بێ وەڵام دەمێنێتـەوە، کەچۆن ژیان لەسەر یەکەم ئەستێرە دەستی پێ کرد؟.

یەك خانە هەر چەندە ساکار بێت، دەبێت بـە هـەموو ئەرکـەکانی ژیـان هەسـتێت: هەر لە خواردنەوە تا هەناسەدان‌و دەردان‌و گەرمایی دیاریکراوو گەشەو زۆربـوون‌و دابـەش بوون‌و جوڵەو کاریگەری‌و رژانی رژێنەکان‌و گونجان لەگـەڵ دەورووبـەردا. کەواتـە خانـەش ئاڵۆزەو لە زیندەوەرانی تر کەمتر نیـە، لـە دان پیانانـە دەگمەنـەکانی زانسـتیش وتەکـەی (بخنر)ە، کە دائەنرێت بە دیـارترین پاڵپشـتی بیردۆزی گەشـە کـردن، ویەکێکـە لـە هـەرە ماددییە رۆچووەکان‌و داروینی تاوانبار کـردووە بـەوەی کـە هـۆی دروسـت بوونـی پیـاوانی ئایینی بووە. دەڵێت:

(لە دایك بوونی خودیـی، یەکـەم خڕۆکـە کـە یەکـەم رەگـەزی لێـوە دروسـت بـووە شتێکی ئاسان نیە، چونکە لـە بـاری گونجـانی زەمـین بۆتـە هـۆی دروسـت بوونـی یەکـەم خڕۆکە بە دروسـت بوونێکی خودیـی نـەزانراو. خڕۆکـەش هەرچـەندە سـادەو سـاکار بێـت بنیادو پێکهاتەکەی بە جۆرێکە رێ نادا بەوەی راستەوخۆ لە شتی بێگانـەوە هاتبێتـە دی، بـەڵکو دروسـت بوونـی لـە بـێ گیانـەوە لـەتێڕوانینی زانسـتدا دائـەنرێ بـە موعجـیزە، کـە سەبارەت بە ژیری وەکو ئـەوە وایـە کـە زینـدەوەرە باڵاکـانیش راسـتەوخۆ لـە شـتی بـێ گیانەوە بەدی هاتبن).

هەندێك جاریش تروسکەیەکی هیوا لای زاناکان دەرئەکـەوێ، کـە زۆریـەیان خـەیاڵ کۆیان دەکاتەوە، کاتێك دەڵێن وا خەریکە ئێمە ژیان دروست کەین، کەچی لە پاشدا جگـە لە تراویلکە (سەراب) هیچ شتێکی تر نادۆزنەوە؟!، دواترین شت کە لەم بـارەوە بیسـتمان ئەو وتەیەیان بوو کە کاتێك ترشەڵۆکی (D.N.A.)یان دۆزییـەوە: گوتیـان ئیـدی نـهێنی ژیان بــە دەسـتمانەوەیە، کـەچی دوای ژاوەژاوو گاڵـە گـاڵێکی زۆر، گەیشـتنە ئـەو وەڵامـە یەکلاکەرەوەیەی کە ژیان لە دروستکردنی (ﷲ)یە. ئەمەش درێژەی بەسەرهاتەکەیە:

هەندێك نەخۆشی تووتن بە هۆی (حماتی ئاوێتـەوە) دروسـت دەبـن لـە هیۆلینـاتی ناوکی، کە بەرەنگاری دژە جرثوم دەبنەوە، و هەندێك سیفەتی تایبەتی زیندەگیشی هەیە کە رێی زۆربوون‌و نوێنەرایەتی‌و رێ نیشاندان دەدات، بــەڵام لـەم چـەند ساڵەی دواییـەدا

راستییەکی تر ئاشکرا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە ئەم حومەیاتە لە ترشەڵۆکی ناوکییەوە پاڵفتە بوو کە ماددەی هیۆلینی دەورەی داوە، ترشەڵۆکی ناوکیش کە پێکی هێناوە یەکێکە لەم دوو جۆرە: یا (D.N.A.)ەیە یاخود (R.N.A.)ەیە، بەڵام ئێستا بونیاتی ئەم دوو ترشەڵۆکە زانراوە بە شێوەیەکی تەواو، هەرچەندە دوو پێکهاتەی زۆر ئاڵۆزن، ئەمەش بە هۆی بەکار هێنانی تیشکی ژوور وەنەوشەییو زەڕەبینی ئەلەکترۆنییەوە بوو، و زۆر هۆکاری کیمیایی تریش .

دەرکەوتووە کە ئەم ترشەڵۆکە لە سێ رەگەزی سەرەکی پێك دێتو یەك پارچەی بچووك پێك دێنێت بە شێوەی بەدوای یەکدا هاتنو دووبارەبوونەوە لە شێوەی(گوریس) زنجیرێکی درێژدایەو ئەم زنجیرەیەش زنجیرێکی تر بەرانبەری دەوەستێ، ریز دەبێو یەکێکیان خۆی لەوی تر دەئاڵێنێ لە شێوەی لولپێچ دا، ماوەیەکی یەکسان نێوانی ئەم دوو زنجیرەش پێکەوە دەبەستێتەوە، پێوەندی گرێدانی هیدرۆجینی وا دەکات دوا شێوەی بە جۆری پەیژەی لوول خواردوو (لولبی) بێت، یاخود پەیژەی دوانگە (مأذنة) هەروەها هەردوو زانا (واتسۆنو گریك) ئەوەیان روون کردۆتەوە کە ژمارەی خوولانەوەی هەردوو شریتە لوول پێچەکە (الحلزونیة) لە ترشەڵۆکەکەدا لە (١٠٠٠) خوولو سووڕان زیاترە، درێژی هەردوو شریتەکە یان درێژی ترشەڵۆکەکەش لە (٣٠) ئەنگسترۆم تێناپەڕێت. زاناکان وای دەخەملێنن ئەگەر بێتو هەردوو شریتەکە درێژ بکەینەوەو کۆتایی یەکێکیان بکەین بە کۆتایی ئەوی ترەوە، ئەوا درێژییەکەیان لە دەرەوەی ناوکەکەدا (١,٥)مەتر دەبێت. جا بۆ ئەوەی درك بە ئاڵۆزی ئەو ترشەڵۆکە بکەین ئەوا پێویستە بزانین کە کێشی گەردی (الذري) جۆرێك لە (R.N.A): ($١٠^{٦}\times١,٥$)یە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ترشەڵۆکە دۆزراوەتەوە، (أوشوا)ی زانا توانی ئەمە پێك بهێنێو لە ئەنجامیشدا پاداشتی نۆبڵی لەسەر وەرگرت.

ئەم ترشەڵۆكو بلوورە بەجۆرێك داڕێژراوە، کە ترشەڵۆکەکە نەتوانێ زۆر ببێت وەك ترشەڵۆکی (D.N.A.) کە لە تووتنو حوماتدا هەیە، داڕشتەی هەردوو ترشەڵۆکەکە هەر

یەکە، لەگەڵ ئەمەشدا جیاوازی نێوانیان زۆر گەورەیە، وەك جیـاوازی نێـوان ژیـانو مـردن وایە، ئەمەش وەك جیاوازی نێوان بتی بێ گیانو لەشی زیندووی خاوەن گیان وایە.

کەواتە دوای ئەمە دەگەینە ئەم ئەنجامە:

مادده هیچ لـە یاسـا تێناگـات، تەنانـەت ئەوانـەش کـە خـۆی جێبـەجێی دەکـاتو لەسەری دەڕوات!، گەردیش ملکەچی یاساکانی یەکگرتنە کیمیاوییەکانەو یاسای کێشندەو کاریگـەری پلـەی گەرمایـە. بـەڵام سـەبارەت بـە ژیـان ئـەوا ئـەو نهێنیـە سـەیرەیە کـە لـە کونییەکەیەوە(کونهە) هیچ شتێك نازانین جگە لە شوێنەوارەکانیەوە نەبێت.

﴿ویسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي وما أوتيتم مـــن العلـــم إلا قليـــلا﴾ الإسراء/٨٥.

واتە: و لە بابەت ڕۆحەوە لە تۆ دەپرسن، بڵێ: ڕۆح شتێکە تەنیا پەروەردگارم لێی ئاگایە، لە زانست مەگەر کەمێك نەبێ (لە بابەت ڕۆحەوە) بە ئێوە نەدراوە.

❁❁❁

(لیـتن) دەڵێـت: هـەر خانەیـەکی پرۆتـین لـە زنجیرەیـەك پێـك دێـت کـە چەندسـەد ئەڵقەیـەکی تێدایـە، هـەر ئەڵقەیـەکیش تیـایدا لـە پێکهاتـە گەردییـەکان پێـك دێـت، کـە سەرچاوەکەشـیان ترشـێکە لـە ترشـە (نەشـاردیەکان) (الأحمـاض النشاردیـة) ئـەم ترشەلۆکانەش نزیکەی سەد جۆریان لێ زانراوە، شوێنی هەریەکەشـیان بـە پـێی جیـاوازی ڕێژەو تـەرتیبیان دیاری دەکرێت، بـەڵام لـە هـەندێك شـانەدا (نسیج) تـەنیا لەسـەر یـەك تەرتیبو بەیەك ڕێژە دەیانبینیت، بەبێ هیچ شازو جیاوازییەك، ئیدی ئایا دەتوانین پلـەی وردەکارێتی پێکاندنی ئەگەرە هەڵـەکان پـەی پـێ بـەرینو بێـت بـە خـەیاڵماندا کـە ژمـارە ئاساییەکانی ئێمە ناتوانن بیانژمێرن!؟.

بۆ نزیك کردنەوەی ئەم وردەکارییە لە ئەندێشەوە، پێویستە باسی ئەوە بکەین کـە پیتە ئەبجەدییەکانی ناو هەموو زمانەکانی مرۆڤایەتی لە (٣٠) پیت بەدەر نیـە، کـەچی لـە لێکدانە جیاوازەکانی ئـەم پیتانـەوە هـەموو زاراوە جیاجیاکـانی وشـەو ڕسـتەی ئاخـاوتنی

نەتەوەكانی لیٚ پیٚك دیٚت، جا گەر خانەی پرۆتین لە قەبارە شارراوەكەیدا ریٚی تیٚبچیٚو شایستەی چەندجاركردنی ئەم دووبارەبوونەوەیە بیٚت، پاشان هیچ شتیٚكی تیا نەبینینەوە جگە لە یەك وشە نەبیٚت، لەیەك تەرتیبی نەگۆڕدا، ئەوا بە شیٚوەیەكی نزیك كراوە مانای ئەو پیٚكاندنە ئەزانین لە هاوتا بوونو داڕشتندا. بۆ نزیك كردنەوەی ئەم خەیالە دەلیٚین: خۆر لە (٣٠٠,٠٠٠) سالدا تیشكەكەی لە لایەكی مەجەڕەوە دەگاتە لاكەی تری، جا گەر بمانەویٚت پیٚكاندنی خانەكان (إصابة الخلية) لە پیٚكهاتنیدا بەم نموونەیە بچویٚنین، ئەوا ئەم پیٚكاندنە وەك پیٚكاندنی گوللە وایە كە لەسەر زەوییەوە ئەتەقیٚنریت بەرەو رووی ئامانجیٚك كە رووباریٚك بیٚت لە مەجەڕەیەكی تردا بە قەبارەی چاوی مانگایەك، و هیچ جاریٚكیش هەلە دەرنەچیٚت، ئەمە لەگەل ئەوەدا كە ئەلقەی خانەكان تەنیا پەنجا دانەیەنەك بە سەدان دانە!

لەگەل ئەمەشدا، پرۆتین هەموو شتیٚك نیە، بەلكو بەشیٚكە لە خانەیەك، خانەش بەشیٚكە لە ئەندامیٚك، ئەندامیٚكیش بەشیٚكە لە ئامیٚریٚك، ئەندامیٚكیش بەشیٚكە لە لەشو لەشیش هەمووی هەر لە پرۆتینەكانەوە تا خانەكانو ئەندامو ئامیٚرەكان لە ناو یەكدا تیٚهەلكیٚشن، زۆر بە تەواوی لەگەل یەكدا هاوكاریو كارلیٚكەریان هەیە.

جا لەشی زیندوو كە هەموو ساتیٚك ئەم موعجیزانەی تیا دووبارە دەبیٚتەوە، هیٚشتا زۆر سەراسیمەی تیٚدایە، كە لە هەموو ئەمەی باسمان كرد زیاتر جیٚی سەرسوڕمانە، ئەوەش ئەوەیە كە ئەو گەردە شارراوەو ونانە بە شیٚوەیەك یەكدەگرنو جیا دەبوونەوە: ئەگونجیٚنو پەرت ئەبن كە نویٚ بوونەوەیان مسۆگەر بیٚت، یاخود بەردەوامی بۆ ژیان دەستەبەر بكات، هەموو بەشیٚكی زیندوو لە دوانەیەك پیٚك دیٚت، لە هەردووكیشانەوە یەك خانە دەردەچیٚت كە دانەیەكی تری زیندووی لیٚ بەرهەم دیٚت، ئەم دوو خانەش هەندیٚ جار بە شیٚوەی دوانەنو هەندیٚ جاریش بە شیٚوەی تاك، بە پیٚی بارو قۆناغی دیاری كراو، ژمارەشیان لە هەر جۆریٚك لە جۆرە زیندووەكاندا بە بیٚ كەمو زیاد ئەگونجیٚت، هەموو دانەیەكی زیندووش خو و عاداتو غەریزەی تایبەتی بە جۆریٚك هەیە كە لە كاتی

دیاریکراودا رێی جووت بوونی نیشان دەدات، جا گـەر باڵندە بـوو ئـەوا پێویسـتە پـووش پێکەوە بنێن پێش جووت بوون، گەر ماسی دەریاکان بوو ئەوا دەبێ ئـاوی سـوێری دەریـا جێ بهێڵێ بۆ رێڕەوی رووبارەکان یا تەنکاوەکان پێـش ئـەوەی زاووزێ بکـات، بـەو پـەڕی شەوقەوە پێش دانانی زاووزێ دەڕوانێتە هاوەڵەکەی هەرچەندە جۆرەکەشیان جیاواز بێت.

ئاڵۆز بوونی گەورەی دیـاردەی ژیـان هاوتاییـەکی مـەزنی تێدایـە، و دانـانی هـەموو شتێ لە شوێنی خۆیدایە، بەڵگەی ئاشکراو روونن لەسەر بوونی زانستو ئـیرادەو توانـا کـە لە پشت هەموو شتێکەوەیە، لـە کـاتێدا لای مرۆڤـی نـەخوێندەوار زۆر نامۆیـە، بـەڵام لای مرۆڤی زانا بە شێوەیەکی زانستی بڕوا پێهێنە.

دروست کردنی ماددەو بەخشینی خۆی بۆ گوێو چاوو دڵ، شتێکە مـرۆڤ ناتوانـێ بێ راڤە کردن بڕوای پێ بکات، هەرچیەکیش گوتـراوە لەنـەبوونی سەرسامی لـە پێکـهاتنی لەشی زیندوو، ئەوەیە: کە ئێمـە ئـامێری مـاددی ئـەبینین بـە رێکو پێکـی ئـیش دەکـاتو کارەکانی بە شێوەی مەبەستـداری زانراو دابەش دەکات، ئامانجە زانراوەکە دائەنرێت بـە خاڵی سەرسامی. جا سەرسامی لە لێك چوونی ئامێرو لەشە زیندووەکاندا ئەوەیە کە ئامێر بە بێ بوونی دروستکار ساز نابێت، شـیتەڵ کردنـی کارەکانیـان بـەپێی یاسـای گـەرمیو جوڵە هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێ لە جێ هێشتنی یاساکانەوە بـۆ توانسـتی ئـەندازیارێك کە رامی ئەو یاسایانە بێت.

ئادەمیزاد بە چاوێکی رووتەوە تەماشای ئەندامـەکانی لەشـە زیندووەکـان دەکـات؛ سەرسام دەبێ لەوردەکاری توانـاو کاریـانو پاڵپشـتی ئەندامـەکان بـۆ یـەکتریو هاوکـاری نێوان هەردوو بەشەکانیان،و تێپەڕبوونی هۆکارەکانی گەشەکردن تیایدا بە پـێی پێوانـەی پێویست، بە گوێرەی تەمەنو جۆرو پـۆل، ئیـدی ئەگـەر لـە لاشـەی مـرۆڤ یـا ئـاژەڵو یـا زیندەوەری بچووكو یا رووەکدا بێت، دەبێ زۆر سەرسام تر بن دوای ئەوەی بە زەرەبـینو میکرۆسکۆپو کارە شیتەڵکارییەکان بۆیان دەردەکەوێت ئەو ئەندامانە لە چی پێك دێـن؟، و چۆن کۆمەکی لەو ئەرکانەدا ئەکەن؟، بۆمان دەردەکەوێت ئەو ئەندامە دیارانە بریتین لـە

چەندان گەردی ورد کە بە چاوی ئاسایی نـابینرێن، هـەر گـەردێکیش دەکەوێتـە شـوێنێکی لەشەوەو سەرجەم گەردەکانی تـر هاوکاری دەکـەن تیـایدا، وەك ئـەوەی ئاگایـان لیّ بـێ‌و بزانن چی دەوێت، هیچ یەکێکیشیان بە هۆی نەخۆشی‌و کـەم توانایـیـەوە دەسـت بـەرداری کارەکەیان نابن، مەگەر یەکسەر ئەوانی تر هەڵسن بە چاك کردنەوەو کۆمەکی کردنی.

❁❁❁

لەسـەر زەویـدا بـەلایین زینـدەوەر هەیـە، لـە هەریەکێکیشـیاندا هێنـدە سەرسامی تێدایە کە دواییان پیّ نایـەت، ئەمـەش نموونەیەکە ئـەو زۆرییـەمان بـۆ دەسـت نیشان دەکات:-

(لیستەر جون زمرمان) تایبەتمەندی خاك، دەڵێت:

(خـاکی بەرهـەم هێـنی پیتـدار دائـەنرێت بـە خـاکی زینـدوو، کـە لـە ژمـارە بـەدەر زیندەوەری وردی لەسەر دەژی، لـە ئـاژەڵ‌و رووەك، رێـژەی ئـەو زیندەوەرانـەی لەسـەری دەژین تـەنیا نزیکەی لە ٢٠٪ی ماددەی زیندەگی پێـك دەهێنـن، لـە کـاتێکدا ژمـارەی ئـەو زیندەوەرانە دەگاتە چەند بەلایینێك تـەنیا لە یەك گرامی خاکدا).

جا ئەم بەلایینە مەزنە لە زیندەوەران دابەش دەکرێن بۆ هەزاران جۆرو رەگەز، هەر جۆرو رەگەزێکیش جۆرە تایبەتمەندییەکی هەیـەو سیفەت‌و تایبەتمـەندی‌و شـێوەو وێنـەو رێگەی خۆراك‌و رێگای ژیانی جیاوازیان هەیەو هەر دانەیەك لە دانـەکانی رەگـەزێك، جـۆرە تایبەتمەندییەکی ئەو رەگەزە لە خۆ دەگرێت لە هەموو رووە ئاڵۆزەکانی ژیانەوە.

﴿وما من دابة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم﴾ الأنعام/٣٨.

واتە: و هیچ جوڵندەو جفۆکێك لە زەویدا نیەو هیچ باڵندەیـەك نیـە کـە بـە دوو بـاڵ بفڕیّ، مەگەر جگە لەوەی کە ئەوانیش ئۆمەت گەلێکن وەکو ئێوە.

هەریەکەیان رزق‌و رۆزی‌و خواردنی تایبەتی خۆی هەیەو جـۆرە غەریزەیـەکی هەیـە کە وای لیّ دەکات بە دوای رزق‌و رۆزیدا بگەڕیّ، و کۆئەندامەکانیشـیان کـە خـواردن هـەرس دەکات لە یەکتری جیاوازە.

﴿وما من دابة في الأرض إلا على الله رزقها ويعلم مستقرها ومستودعها كل في كتاب مبين﴾ هود/٦.

واتە: و هیچ جولّندەیەك لە زەویدا نیە، مەگەر ئەوەی رۆزییەکەی لەسەر خوایە ئەو قەرارگاو جێی نەقلّو بزووتنەوەیان دەزانێ، هەموو ئەوانە لە کتێبی ئاشکرا (تەتەڵەی زانستی خوا) دایە.

﴿ما من دابة إلا هو آخذ بناصيتها﴾هود/٥٦.

واتە: هیچ جولّندەو جفۆکێك نیە مەگەر ئەوەی کە خوا نێو چاوانی گرێ داوە.

﴿والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ومنهم من يمشي على أربع يخلق الله ما يشاء﴾ النور/٤٥.

واتە: و خوا هەر خزۆك و جولّندەیەکی لە ئاو بەدیهێناوە، جا هەندێ بە زگ دەخشێن، هەندێ لەسەر دوو پێ دەڕۆن و هەندێ لەسەر چوار پێ دەڕۆن، خوا هەرچی بیەوێ خەلّقی دەکا، بەڕاستی خوا دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿وبث فيها من كل دابة﴾ البقرة/١٦٤.

واتە: زیندوو کرایەوەو هەمووجۆرە گیانلەبەرێکی تێدا بلاّو کردەوە.

تاکە لۆجیکێکی ماقوولّ ئەوەیە کە (ﷲ): خوداوەندی زیندووی تاكو تەنیاو بەدیهێنەری ژیانەو ﴿والذين يدعون من دون الله لا يخلقون شيئاً وهم يخلقون، أموات غير أحياء وما يشعرون أيّان يبعثون﴾ النحل/٢٠-٢١.

واتە: کەسانێ کە بێجگە لەخوا هاواری بۆ دەبەن، شتێ خەلق ناکەنو بەلّکو خۆشیان خولقێنراون، ئەوانە مردوونو زیندوو نین (و ئەو بتانە) نازانن کەی حەشر دەکرێن.

هەروەها لە لۆجیكو ژیرییدا ئەو دوو شتە وەك یەك نابن (کە پەروەردگار توانای بەدیهێنانی هەبێو ئەو هاوەلاّنەی کە بۆی دادەنرێت توانایان نەبێ، کەچی وەك یەك تەماشا بکرێن) ﴿أفمن يخلق كمن لا يخلق أفلا تذكرون﴾ النحل/١٧.

واتە: جا ئایا کەسێ کە بەدی دێنێ وەکو کەسێ وایە کە بەدیناهێنێ؟ جا ئایا بیر ناکەنەوە؟.

هەروەها بەپێی پێوانەی ژیریش وەك یەك نابن ئەو دوو کەسەی یەکێکیان ژیان بداتە پاڵ رێکەوتو ئەوی تریشیان ژیان بداتە پاڵ پەروەردگاری تاكو تەنیا.

﴿ولقد ذرأنا لجهنم كثيراً من الجن والإنس؛ لهم قلوب لا يفقهون بها، ولهم أعين لا يبصرون بها، ولهم آذان لا يسمعون بها أولئك كالأنعام بل هم أضل أولئك هُم الغافلون﴾ الأعراف/١٧٩.

واتە: و بە هەقیقەت زۆرێ لە جنۆکەو ئینسمان بۆ دۆزەخ خولقاند، بۆ ئەوان دڵگەلێ هەیە کە پێی تێ ناگەن،و چاویان بۆ هەیە کە پێی نابینن،و گوێیان بۆ هەیە کە پێی نابیستن، ئەوانە هەر وەکو مەڕو ماڵاتن، بەڵکو لەوانیش گومڕاترن، هەر ئەمانە غافڵن.

ئینجا لەم چیرۆکە رابمێنە، چیرۆکی بچووکترین بەدیهاتن،و ساکارترین بوونەوەر، تا بۆت دەربکەوێ کە لە پشت نهێنی ژیانەوە (ﷲ)هەیە، لەسەرەتاو کۆتاییەوە، چ دروست کردن بێت یا خود سەرجەم جۆرەکان بێت. ئەو بوونەوەرەش (ئەمیبا)یە؛ ئەگەر بچینە کارگەیەكو یەك دڵۆپ ئاوی گۆلاو (زۆنگاو) لە ژێر زەرەبینی تایبەتیدا بپشکنین تا گیانەوەرانی ناو دڵۆپەکە ببینین، ئەوا یەکێك لە عەجایباتەکانی ئەم گەردوونەمان بۆ ئاشکرا دەبێت: ئەوە ئەمیبایە زۆر بە هێواشی دەجوڵێت، رووەو زیندەوەرێکی بچووك دەچێتو دەوری ئەدات، هێندەی پێ ناچێ دەچێتە ناو لەشییەوەو هەرسی دەکاتو لە ناو لەشیدا خۆی دەنوێنێت، بەڵکو دەشتوانین پاشەڕۆکەی ببینین کە لە لاشەی ئەمیباکەوە دەردەچێت پێش ئەوەی چاومان لەسەر زەرەبینەکە هەڵگرین، جا گەر بۆ ماوەیەکی درێژ تێبینی ئەم گیانەوەرە بکەین ئەوا دەبینین کە چۆن لەشی دەبێت بە دوو پارچەوە، پاشان هەر یەك لەم دوو بەشەوە گەشە دەکاتو سەرلەنوێ دەبێتەوە بە گیانەوەرێکی نوێی تەواو (هەروەها دەڵێن: هیچ خانەیەك دابەش نابێت گەر بێتو خانەیەکی تری

بەرنەکەوێت؛ کەواتە کرداری پێك هاتن هەیە لەنێوان نێرو مێدا) ئەوە تەنیا یـەك خانەیـەو هەڵدەستێت بە هەموو ئەرکەکانی ژیان کە بوونەوەرە گەورەکانی تر لە جێبەجێ کردنیـدا پێویستیان بە هەزارەها خانەو ملیۆنەها هەیـە. بێگومـان دروسـت کردنـی ئـەم گیانـەوەرە سەیرە کە لە بچووکیدا دوا پلەی وەرگرتووە زۆر لەتوانای رێکەوت بەدەرە، لەگەڵ تێبینـی کردنی ئەوەی کە لە هەموو جێیەکی جیهانیشدا بوونیان هەیە، ئێستاش هەروەکو ئەو کاتە وایە کە لەسەری دروستکراوە.

جا گەر ورد بینەوە لەو گیانەوەرە سادەیە، لـە نـاو پێکهاتەکـەیدا (پرۆتۆپلازمـا)ی پێکهاتەی ئاویی دەبینین، کە زیندووەو لە جوڵەی بەردەوامدایە، مەڵبـەندو چـەقی جوڵـەو ژیانە لە هەموو بوونەوەرێکی زیندوودا، بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەجوڵێت. ئەمیبا لـە نـاو ئاودا مەلە ناکاتو ناشچێتە سەر رووی دڵۆپـە ئـاوێكو نـاو قووڵاییـەوە، بـەڵکو بـە جۆرێك دەجوڵێت وەك ئەوەی برژێت یا لە بەری بڕوات. بەڵام سەبارەت بە لەشـی ئـەمیبا بریتییـە لە یەك پارچەی رووت لە (پرۆتۆپلازم)، و جیاوازی هەیە لە خانەی رووەکیی، بەوەی کە لە بەرگی دەرەوەیدا هیچ دیوارێکی رەق نیە، بەڵکو تەنیا پەردەیەکی ناسـکە لەشـی دەسـت نیشان ئەکات، هەرچەندێکیش ئەو پرۆتۆپلازمە بەرەو رووگەیەك لە رووگـەکان بجوڵێتـەوە، ئەوا ئەو بەرگە گوێڕایەڵی دەکات،و لەگەڵیدا بە هەمان ئاراستە دەجوڵێت.

ئا بەم جۆرە شێوەی گیانەوەرەکە دەگۆڕدرێت، هـەندێك زیـادەیی هەیـە کـە پـاش کەمێك شێوەکەی دەگۆڕێت، ئا بەم جۆرە گیانلەبەرەکە دەجوڵێت، پشت بـەو زیادەییانـە دەبەستێت کە وەکـو شـێوەی پـێ وایـە، هـەر بۆیـە بـە (گـەندە پـێ -الأقـدام الكاذبـة-) دەناسرێ.ڕیشی تێدەچێ کە ئەو پەڕی هێزی مەزنی زەڕەبینەکـە بـەکار بێنـی بـۆ بینینـی زیادەی (سایتۆپلازم)ەکە، لە کاتی پاڵەپەستۆیی لەسـەر گـەندە پێکـان،و تـا بزانیـت کـە لەشی گیانەوەرەکە لە دوو چینی پێکهاتەی (پرۆتۆپلازما) ی جیاواز لە چڕیـدا پێك دێت. یەکێکیان پارچەیەکی تەنکی ئاوییە، کە هەمیشە لە جوڵەدایە، بەڵام ئـەوی تریـان شـێوەو

پارچەیەکی هولامی نا دەست نیشان کراوە، نیوە رەقە کە دەوری چینەکەی پێشووی داوە بە شێوەیەکی تەواو.

ئەمیبا چۆن دەجولێت؟ ئەو هۆکارانە چین دەبنە هۆی خۆراك پێدانی؟ هەر چەندە وەڵام بدەینەوە هێشتا هەر دەیمێنێت بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکان، زۆر هۆکار ئەبنە هۆی کارلێکردن لەسەر جوڵەی پێکهاتووەکانی ناو خانە (الجبلّة)، بەڵام هەموویان کارلێکی رووکەشی سادەن، کە ناتوانن ئەوەمان بۆ دەست نیشان بکەن بۆچی جوڵەی بەردەوامی زیندەوەرەکە کۆتایی پێ نایێ؟، تەنانەت کاتێکیش کە کاریگەری ئەم کارلێکانەش نامێنن!.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەلایەنی کەمەوە هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ خودی (جبلّة)کە، کەواتە مەحاڵە راڤەی دیاردەی ژیان وا بکەین کە تەنیا وەڵامدانەوەی هەندێك لە کارلێکە دەرەکییەکان بێ.

بەم بۆنەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کاتێك خانەیەکی زیندوو دەبێت بە دوو بەشەوە، بە رێگەی هەڵوەشاندنێکی پڕ وردەکاری، بە جۆرێکی وا کە ناوکەکە دەکەوێتە بەشێکیانەوە، نەك هەردوو بەش! جا ئەو بەشەی کە ناوکەکەی تیا نیە پاش کەمێك دەمرێت، گەر هەر چەندێکیش هەوڵ بدات بۆ لەناو نەچوونی، کەواتە بەم جۆرە دەردەکەوێ کە ناوکەکەیە هەڵدەستێت بە رێکخستنی کرداری زیندەگییەکان لە خانەکانداو زاڵ دەبێ بەسەریاندا، جا ئەگەر ئەم سەرپەرشتیکارییە نەما ئەوا ژیان رادەوەستێ.

هەر بەم جۆرەش لە خانەیەکدا کە ساکارترین گیانەوەر لە خۆ دەگرێت هێزو توانای پەروەردگار دەبینینەوە، وەك چۆن لە ئاڵۆزترین زیندەوەریشدا دەیبینینەوە.

﴿أيشركون ما لا يخلق شيئا وهم يخلقون﴾الأعراف/١٩١.

واتە: ئایا ئەو شتانە ئەکەنە هاوبەشی خوا کە شتێ خەلق ناکەن‌و خۆیان بەدی هاتوون.

گەردوون بەدیهێنراوە نەك بەدیهێنەر، جا هەر کەسێك سیفەتی بەدیهێنان بداتە پاڵ گەردوون، یاخود سروشت، ئەوا بە شێوەیەکی نەزانانەو نەفامی هـاوەڵ بۆ پـەروەردگاری تاكو تەنیا دادەنێت.

جا دروست بوونی ژیان تەنیا بە پەروەردگار لێك دەدرێتـەوە، بوونـی جۆرەکـانو رەگـەزەکانیش هـەر بـە پـەروەردگار لێـك دەدرێتـەوە، هـەموو سەرسـامییەکیش لـە گیانـەوەراندا هەیـە هـەر بۆ پـەروەردگار دەگەڕێتـەوە، هـەر بەشـێکیش لەمانـە نیشـانەو بەڵگەیەکن لەسەر بوونی (ﷲ).

-٤-٣

مرۆڤو رەوشت

مرۆڤ گەورەترین دروست کـراوی (ﷲ)یـە بۆیـە بـە قەشـەنگترین بەدیـهاتووەکانی دادەنرێت، جا مرۆڤ هەر بەو رێژەیەی خوا دەناسـێت هـەر بـەوەندەش خـۆی دەناسـێت، چەندێکیش لە خـۆی بـێ ئاگـا بێـت ئـەوا ئـەوەندەش لـە خـوا بـێ ئاگـا دەبێـت، بۆیـە لـە حیکمەتێکدا هاتووە دەڵێت: (ئەوەی خۆی بناسێ، خواش دەناسێ) ئەمـەش راسـترین وتەیە کەوا ژیریی مرۆڤ دایڕشتووە.

گرنگترین شتیش لە مرۆڤدا بریتییە لە سیفەتە سەرەکییەکانی کە ناتوانین لێکیـان بدەینەوە، تەنیا بەوە نەبێت کە بڵێین بەشێکن لە فەرمانی خودا، وەك خوڕەوشتی مرۆڤ، سیفەتە سەرەکییەکانی مرۆڤ وەك: زانست، ئیرادە، تواناو هێز.

مادده خۆی ناناسێت هیچ شتێکیش جگە لـە خـۆی هۆشمـەند ناکـات، مـادده هیـچ هەڵبژاردنێکی لەبەردەما نیە، توانـاو هێزیشـی زۆر سـنووردراوە، بـەڵام مـرۆڤ تێدەگـاتو ویستی هەیە بە پێی زانستەکەی خۆی، هێزەکەشی بـە پـێی ئـەو توانایـەی کـە هەیـەتی دەیخاتە گەڕ، جـا ئامـادەگی مـرۆڤ بـۆ زانسـت: دیاردەیەکـە لـە گـەورەترین دیاردەکـانی بوون، چونکە مرۆڤ بە تـەنیا لە نێـوان ئـەو بەدیهاتووانـەی دەیـانبینین ئامـادەگی ئـەوەی

هەیە هەموو شتێك بزانێت، هەروەها كاری شیتەڵكاریو لێكدانو پێوانە كردنو هۆكارێتی دەزانێو پێیان هەڵدەستێت، كاری رەفز كردنو وەرگرتن ئەنجام ئـەدات، توانـای وێنـاندن (تصور)ی هەیە، دەتوانێ بیر بكاتەوەو تەنانەت شـتە نـەزانراوەكانیش لـە ژێـر رۆشـنایی شتە زانراوەكانەوە بناسێتەوە، هەروەها رێگەش بۆ ژیانی دەكێشێو دەتوانێ شارستانێتی بنیات بنێو هەروەها تێكیشی بدات.

لەگەڵ دیاردەی زانستدا دیاردەی دەربڕین دێت، كاتێك مرۆڤ لەم شتانە دەدوێت: هـەندێك جـار بـە رەوشـتو ئەدەبـەوە، هـەندێك جـاریش بـە وشـە، هـەندێك جـاریش بـە فەلسەفە، جارانێكیش بە لۆجیك، بـەبێ دەنگـی یـان بـە توورەیـی، بـە سـۆز یـا بـە بیـرو هزر.

زانستو روونبێژیو ئاشكرایەتی مرۆڤ بەڵگەی راسـتەوخۆن لەسـەر بوونـی (ﷲ): ﴿الرحمن علم القرآن خلق الإنسان علمه البيان﴾الرحمن/١–٤.

واتە: (خودای دەهندە) بەخشـەر، قورئـانی فـێر كـرد، مرۆڤـی خـەلق كـرد، زمـانو قسەی بەو فێر كرد.

﴿إقرأ وربك الأكرم الذي علم بالقلم علم الإنسان ما لم يعلم﴾ العلق/٣–٥.

واتە: بخوێنە بە ناوی پەروەردگارت كـە (دنیـای) خولقـاندووە، مرۆڤـی لـە خوێـنی مەییو خولقاندو گوڕواندی، بخوێنە،و پەروەردگارت بەخشندە ترینە، خوایـێ كـە بـە هـۆی قەڵەمەوە فێركردنی سازدا، مرۆڤ لەوەی نەیدەزانی فێری كرد.

بەڵام ماددە ویستی نیە، بەڵكو گەردن كەچی توانایە. رێو شـوێنی ئـەو توانایـەش گۆڕانی بەسەردا نایەتو جێگۆڕكێ ناكات. گەر ئاژەڵ ویستی هـەبێت ئـەوا ویسـتەكەی بـە شێوەیەكی غەریزییە لە سنوورێكی دیاری كراودا. سـنووری ژیـانو مـردن، سـنووری رزقو كرداری زۆربوون (السفاد)، ئەوا جگە لەمانە ئەوی تـری ئـاڵۆز ونـەزانراوە، تەنانـەت واتـای توانستیش نازانێت لەو شتەی كە دەیەوێت.

بەڵام مرۆڤ وزەو تواناو ئیرادەی هەیە، لە نێوان دوو شـتی بەرانبـەردا هـەڵبژاردنی پێ دەکات، لەنێوان دوو شتی دژ یەکدا بەکرداری هەڵبژاردن هەڵدەسـتێت، قسـەکردنی بـە توانستی خۆیەوە پابەندە، جووڵاندنی بە توانا دەبێت.هەروەها کارکردنیشی، تەنیا مرۆڤـە سەربەستی هەڵبژاردنی هەیە. بە جۆرێکی بـێ وێنـە لـە نێـوان هـەموو بەشـەکانی جیهـانی هەست پێکراواندا. ئەگەر بیەوێت درۆ بکات درۆ دەکات، ئەگەر راستییش هەڵبژێرێت راست دەڵێت، وێرانکاری هەڵبژێرێ بـەکاری وێرانکـاری هەڵدەسـتێ، ئـاوەدانیش هـەڵبژێرێ ئـەوا ئاوەدان دەکاتەوە، هێزێکی گەورەی لەویست تێدایە، هاوشانی وزەیەکی زۆر لەتوانا .

چەندێك مرۆڤ وزەی ئیرادەی پێ دراوە ئەمـەندەش هـێزێکی گـەورەی پـێ دراوە، ئەم هێزەش ئەوەیە کە ئەتوانێت شتەکان بـۆ خـۆی رام بکـات.و سوود لـە هـەموو شـتێك وەرگرێت. دەتوانێت زەوی بچێنێت ئەگەر هیچی لێ نەڕوابێت، و بەرهەم بدوورێتەوە ئەگەر زەوی چاندبێ، و دەتوانێ لە دووتوێی ئاو و با دا بڕوات.و گۆشتی باڵندەو ماسـی بخـوات، لە هەموو شتێك ئەوەی سوودی پێ دەگەیەنێت دەری بێنێت، لە هـەر شـتەش چـی زیـانی پێ بگەیەنێت لێی دوور کەوێتەوە.

زانستی مرۆڤ.و ئیرادەی مرۆڤ.و هێزو تواناکەی بـە شـێوەیەکی بـەرچاو لـە مـاددە جیای کردۆتەوە، چونکە ماددە ناتوانێ زانست.و درك کردن.و هـێزو ویسـتی پـێ ببەخشـێ، بەڵکو تەنیا پەروەردگار دەتوانێ ئەمانە بە مرۆڤ ببەخشێ:

﴿وعلم آدم الأسماء كلها﴾ البقرة/٣١.

واتە: ئەوسا خوا هەموو ناوەکانی بە ئادەم فێر کرد.

﴿هو الذي خلق لكم مافي الأرض جميعاً﴾ البقرة/٢٩.

واتە: هەر ئەو خوایەشە کە ئەوەی لە زەویدایە بۆ ئێوەی بەدی هێناوە.

﴿هو أنشأكم من الأرض واستعمركم فيها﴾ هود/٦١.

واتە: ئەوە کـە ئێـوەی لـە زەوی بەدیـهێناو ئـاوەدان کردنـەوەی ئـەوێی لـە ئێـوە ویستووە.

﴿وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلاً ما تشكرون﴾ الملك/٢٣.

واتە: بڵێ: ئەو زاتێکە ئێوەی بەدیهێنا،و بۆ ئێوە گوێو چاوو دڵی داوە، بەڵام کەمتر شوکرانە بژێری دەکەن.

﴿ألم نجعل له عينين ولساناً وشفتين وهديناه النجدين﴾ البلد/٨-١٠.

واتە: ئایا دوو چاومان بۆی ساز نەداوەو زمانێكو دوو لێو؟و ئەوم بۆ (دوو رێگای) چاكەو خراپە رێنوێنی کرد.

بەڵام رەوشت ئەو هەستەیە کە رەفتاری لێ بەرهەم دێت، مەڵبەندو جێگای ئەم هەستانەش جیهانی دەروونە لای مرۆڤ، ئەو جیهانە تەواوەی تەنیا شوێنەوارەکەی دەزانین کە لە ناخمانەوە هەستی پێ دەکەین، هەندێك جاریش لە سەر رووپەری روخسارمان خۆی دەنوێنێ، یاخود لەسەر دەستو زوبانمان خۆی وەدیار دەخات.

هەستەکانی بە زەیی‌و دڵڕەقی، لێبووردنو تۆڵە سەندنەوە، زەلیلیو عیززەت، دادو ستەم، ترسو دڵنیایی، جەنگو ئاشتی، توڕەییو ئارام، ترسنۆکیو ئازایەتی، خۆبەزل زانینو تەوازوع، توندیو نەرمی، رێپیشاندانو گومڕایی، گرتنەوەو بەخشین، بڵندیو نزمی، کۆبوونەوەو پەرتوبڵاوی، رقو خۆشەویستی، بوغزو کینە، کورهاندنو حەسەد، هەستی جوانیو دڵسۆزی بۆ خوو باوو رەوشتی بەرز، هەروەها ئەو هەستانەی شەپۆل ئەدەن بەسەر دەروونا وەکو شەپۆلەکانی دەریاوان.

ئەگەر خراپمان تووش بێ دەگرین، شادمان بین پێدەکەنین، خۆشەویستی دەردەبرینو رقیشمان دەبێت، تکامان هەیەو بێ هیواش دەبین، ئەمانە کاری دەروونن کە ئاڵۆزترین بەشن لە مرۆڤدا، چونکە کۆبوونەوەی پرۆتۆنەکان یان ئەلکترۆنەکان هەست دروست ناکەن ﴿ويسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي﴾ الإسراء/٨٥.

واتە: و لە بابەت رۆحەوە لە تۆ دەپرسن، بڵێ: رۆح شتێکە تەنیا پەروەردگار لێی ئاگایە،و لە زانست مەگەر کەمێك نەبێ (لە بابەت رۆحەوە) بە ئێوە نەدراوە.

﴿ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها﴾ الشمس/٧-٨.

واتــە: و بـە نـەفسو ئـەو کەسـەی چاکو بــە تــەکوز ئــەوی ســازدا، جــا چاکــەو خراپەکەیشی پێ ئیلهام کردووە.

دەبێت مرۆڤ خۆی هەڵنەخەڵـەتێنێو گـەر بـە قووڵـی بـیر بکاتـەوە، بەویژدانـەوە تەماشای دەروونی خۆی بکات -گەر زانـا بێـت یـاخود نـەفام! - چـی دەبینێـت؟. خـوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا مرۆڤ ئەدوێنێت:

﴿وفي الأرض آيات للموقنين وفي أنفسكم أفلا تبصرون﴾ الذاريات/٢٠-٢١.

واتە: و بۆ یەقین داران لە زەویـدا نیشـانەو پەندگـەلێ هەیـە،و لـە وجـودی خۆتـاندا (نیشانە هەیە)، ئایا نابینن (و بیر ناکەنەوە). کەواتە لە دەرووندا زۆر نیشانەو بەڵگـە هـەن کە هەموویان ئاماژەی ئەوەمان بۆ دەکەن پەروەردگارو بەدیهێنەرەکەی (اللّٰه)یە.

بوونی دەروون؛ خۆی لە خۆیدا نیشانەیە، هەموو سیفەتێکی خێرو شـەڕیش تێیـدا هەر نیشانەن، جگە لەمەش؛ لە دەرووندا ئایەتانێکی تری تێدان بەڵگەن لەسەر ئەوەی لەم گەردوونەشدا چەندان شتی سەرسوڕهێنەری ناماددیشی تێدایە، مرۆڤ زۆر نزیک دەکاتەوە لە جیهانی ئەو دیوی ماددە. تەنویمی موگناتیسیو دەرکردنـی گیـان (التلبـاثي)و زانینـی شت پێش ڕوودانی، هەروەها ڕووداوە وەرزشیەکانی ڕۆح کە خاوەنەکانی بێ چاوو تەماشا کردن شت دەبینن، ئەمانـە هـەموو ئـەوە دەردەخـەن کـە شـتانێك لـەم گەردوونـەدا هـەبن نامـاددی بـن، هـەروەها ڕووداوی خوێندنـەوەی بـیری مـرۆڤـو ئـەوەی خولیایـەتی ئـەوە دەردەخات کە مرۆڤ تەنیا ماددە نیە، بەڵکو کاتێ مرۆڤ دەمرێـت نـەك تـەنیا بەشـێك لـە بەشە ماددییەکانی پـەکی دەکـەوێت، بـەڵکو لەگـەڵ ئەمەشـدا مـرۆڤ شـتێکی تریشـی لـە دەسـت دەرئـەچێ، ئـەو شـتە بـزرەش بریتییـە لـە خـودی مرۆڤەکـە، و خاکەکـە بـۆ خـاك دەگەڕێتەوە.

لە کۆتاییدا؛ دروست بوونی ژیان بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا، هەروەها ئاڵۆزییەکانی ژیانیش هــەر بەڵگـەن لەسـەر بوونـی (اللّٰه)، جـۆراو جۆرێتـی زینـدەوەران بەڵگـەن لەسـەر بوونـی خـوا، هـەروەها شـوێنو مەڵبـەندی مـرۆڤ لـەم گەردوونـەدا بەهــەموو سـیفەتە بەرزەکانیەوە بەڵگەیـە لەسـەر (اللّٰه)، لـە دەروونـی مرۆڤایەتیشـدا - چ ڕەوشـتی بـێ یـان

سەراسیمەییەکانی بێت- بەڵگەن لەسەر بوونی خودا، ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی پەروەردگار بناسیت، ئەی چی دەبێت گەر لەگەڵ ئەمانەشدا سروش (وحی)یشـی لەگەڵدا بێـت کـە لـە لایەن خواوە نێردراوەو موعجیزاتی وای تێدا بێت کەس لە توانایدا نەبێت؟ ئەی چی دەبێت لەگەل ئەمانەشدا پێغەمبەرانی راستگۆو باشخوازانو پارێزگارانی زیرەکو چاکەکار هەبن؟.

ئایا لە دوای ئەمانە بێ باوەڕان هیچ بەڵگەیەکیان بـە دەسـتەوە دەمێنێـت؟ تـەنیا بەڵگەی نەفامیو رێگای شوێن ئارەزوو کەوتن نەبێت؟ کە ئەبێتە هۆی بەدبـەختیو پاشـان دۆزەخ؛ نەفرەتی پەروەردگار لەسەر بێ باوەڕان بێت.

# دیاردەی چوارەم
# دیاردەی وەڵامدانەوە

لەم دیاردەیەدا هەر یەك لە ئێمە ئەزموونی تایبەتی خۆی سەبارەتی هەیە، هیچ یەکێك لە ئێمە نیە بە باوەڕدارو بێ باوەڕەوە لە ژیانیدا ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕ نەبووبێ لە نارەحەتیو ئازارو دوو دڵیدا نەبووبێت، ئەوساش بە دڵێکی شکاوو تکاو هیواوە رووی کردۆتە خواوەند. پاشان دەبینیت خەمەکەی دەڕەوێتەوەو نارەحەتییەکەی تەواو دەبێت، خوای گەورەش لە دوای تەنگیی فراوانی بۆ دەڕەخسێنێ، خۆشی لە دوای ناخۆشی دەهێنێت!. بەڵام دڵانێك دەمێنێتەوە بە سوپاسگوزاریو یادکاری پەروەردگارو بەتوێشووی باوەڕەوە، بەڵام هەندێکی تریان بە بێ ئاگاییو لە یاد چوویی دەمێنێتەوە بۆ ئەو کاتەی لە نارەحەتیدا بوون.

ئەوەی ئاشکراو روونە هەموو دەروونێك لە کاتی نارەحەتیدا پەنا دەباتە بەر خوای بەدیهێنەر، قورئانی پیرۆزیش لە زۆر جیگادا ئاماژەی بەم واتایە داوە،بۆ نموونە:

﴿قل أرأيتكم إن أتاكم عذاب الله أو أتتكم الساعة أغير الله تدعون إن كنتم صادقين، بل إياه تدعون فيكشف ما تدعون إليه إن شاء وتنسون ما تشركون ﴾ الإنعام/٤٠-٤١.

واتە: بڵێ: ئایا هیچ بیرتان کردۆتەوە کە ئەگەر عەزابی پەروەردگار بتانگاتێ یا رۆژی حەشر دابێ، ئایا بێجگە لە خوا هاوار بۆ کەسی تر ئەبەن؟! ئەگەر راست ئەڵێن، (نا)

بەڵكو تەنیا هاوار بۆ خوا ئەبەن‌و ئەو ئەگەر بیەوێ كەندو كۆسپێك كە لەبەر ئـەو هاوارتـان بۆ خوا بردووە لای ئەبا،و ئەوەی (وا ئـەمڕۆ) ئەیكەنـە هاویـەش (بـۆ خـوا لـەو ڕۆژەدا) لـە بیری دەبەنەوە.

﴿وإذا مس الإنسان الضر دعانا لجنبه أو قاعدا أو قائما فلما كشفنا عنه ضره مر كأن لم يدعنا إلى ضر مسه كذلك زين للمسرفين ما كانوا يعملون﴾ يونس/١٢.

واتـە: و كاتـێ كـە بـە ئینسـان زیـان (و نارەحەتییـەك) دەگـا، لـە حـاڵێكدا كـە بـە تەنیشتەوە خەوتووە یا دانیشتووە یا ڕاوەستاوە، ئێمە بانگ دەكـا، جـا كاتـێ نارەحـەتی ئەومان لابرد بە جۆرێكی وا دەڕوا وەك ئەوە كە (مێش نەیگەستووەو) قەت (بۆ كردنەوەی گرێ كوێرەی ژیانی) هاواری بۆ ئێمە نەهێنابێ، ئا بەم جۆرە بۆ زیـادەڕۆیـان كردەوەیـان ڕازاوەتەوە.

﴿وإذا مسكم الضر في البحر ضل من تدعون إلا إياه فلما نجاكم إلى البر أعرضتـــم وكان الإنسان كفوراً﴾الإسراء/٦٧.

واتە: و هەر كاتێ لە دەریادا توشی كەندو كۆسپ ببن بێجگە لە خوا هەموو ئەوانەی كەهاواری بۆ دەبەن لە بیرتان دەچێتەوە، جا كاتێ ڕزگارتان دەكاو دەتانباتـە (وشـكایی) بەژ، مل دەسوڕێنن،و مرۆڤ (هەمیشە) ناسوپاس بووە.

﴿هو الذي يسيركم في البر والبحر حتى إذا كنتم في الفلك وجرين بهم بريح طيبـــة وفرحوا بها جاءتها ريح عاصف وجاءهم الموج من كل مكان وظنوا أنهم أحيط بهم دعـــوا الله مخلصين له الدين لئن أنجيتنا من هذه لنكونن من الشاكرين، فلما أنجاهم إذا هـــم يبغـــون في الأرض بغير الحق﴾ يونس/٢٢-٢٣.

واتە: ئەو كەسێكە لە بەژ(وشكایی)و دەریادا ئێوە دەگێڕێ تا لە گـەمی(كەشـتی)دا ئارام بگرن‌و بای موافیق ئەوانە (بەرەو مەقصەد) دەباو شاد ئەبن، لـە ناكـاو بـاو تۆفێكـی سەخت دێ‌و شەپۆلیش لە هەر لایەكەوە بۆیـان دێ‌و گومـان دەكـەن كـە تیـا دەچـن، لـەو دەمەدا پڕ بە دڵ لە ڕووی بڕواوە هاوار بۆ خوا ئەبەن كە بەڕاستی ئەگـەر ڕزگارمـان بكـەی

بە هەقیقەت لە شوکر بژێران دەبین، جا کاتێ ئـەوانی ڕزگـار کـرد دووبـارە لـە زەویدا بـێ ئەوەی مافیان هەبێ ستەم ئەکەن.

﴿قل من ينجيكم من ظلمات البر والبحر تدعونه تضرعا وخفية لئن أنجانا من هـــذه لنكونن من الشاكرين، قل الله ينجيكم منـــها ومـــن كـــل كـــرب ثم أنتـــم تشـــركون﴾ الأنعام/٦٣٦٤.

واتە: بڵێ: چ کەسێ ئێوە لە تاریکایی بەژو زەریا ڕزگار دەکا؟ هاوار لە خوا دەکەن بە ئاشکراو بە نهێنی کە ئەگەر ئێمە لەم مەترسییە ڕزگار بکـەی لـە سوپاسـکاران دەبـین، بڵێ: خوا ئێوە لەوەو لە هەر غەمو خەفەتێك ڕزگار دەکات، (کەچی) لـە دوایشـدا هاوبـەش بۆ خوا دائەنێن.

سوننەتی پەورەردگاریش بە جۆرێکە کە وەڵامی نارەحەتیو پەرێشانان دەداتەوە، ئەگەر هەرچییەك بێت! تەنانەت بێ باوەڕیش بێت بە مانـای زاراوە مـادام ڕووی کردۆتـەوە پەروەردگار.

﴿أمن يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء﴾ النمل/٦٢.

واتە: یا کەسێ کە وەڵامی هەژاران ئەداتەوە، کاتێ هاواری بۆ بەرێ کەندو کۆسـپی بۆ لادەبا.

ئەو کەسانەی لەم بارەوە بەسەرهاتی خۆیان گێڕاوەتـەوە نایەتـە هـەژماردن، هیچ مرۆڤێك نیە لەم بارەیەوە چیرۆکو بەسەر هاتی نەبێت، منو تۆو ئەو ..... وا لـێرەدا چـەند نموونەیەك دەخەینە ڕوو لەو هەزاران نموونانەی ڕوویانداوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی مرۆڤ بە تەنیا نائژی، خوا سەرپەرشتی دەکات، ئەگەر مرۆڤەکە ئەهل بێت بـۆ سەرپەرشـتی کـردن، یاخود دەگاتە فریای گەر بە دڵێکـی پـەرۆش داوای لێبکـات، دەیداتـەوە دەست دەروونـی خـۆی، چـەندێك ئـەوەش زیانمەندییـە کەسێك خـوا بیداتـە دەسـت خـۆی؟ لـە هـەموو حاڵەتەکانیشـدا سەرپەرشـتییەکی چاوەڕوان نـەکراو دەبینینـەوە یـان وەڵام دانەوەیـەکی نائاسـایی، مرۆڤیـش لـەم حاڵەتانـەدا ئامـاژەی شـوێنەواری هـێزو توانـای (ﷲ)و وەڵام

دانەوەی هەست پێ دەکات، لە هەموو ڕووداوێکی لەم جۆرانە بەڵگەمان لەسەر بوونی خـوا زیاتر لا گەلاڵە دەبێت.. ئەمانەش کە باسیان دەکەین پەیوەندییان بەم باسەوە هەیە:-

١- گۆڤاری المختار (ریدر دایجست) لە ژمارەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٤دا لە ژێر ناونیشانی (ئایا بڕوات بە نوێژو پاڕانەوە هەیە) ئەم ڕووداوەی گێڕاوەتەوە:

(ئەمڕۆ لێشاوی ئەم بەڵگانە بە ڕووماندا دێن کە لە هەموو بوارەکانەوە پلەو توانـای پاڕانەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، شتێکی سەیریش نیە مرۆڤ لـە کـاتی تەنگانـەو پێویستیدا پەنا بۆ هێزێکی دەرەکی ببـات، بـەڵام تاکە شـتێکی سـەرنج ڕاکێشو خۆش ئەوەیـە کـە بزانین چۆن سەربازو دەریاوانو فڕۆکەوانەکان دەپاڕێنەوە، وەك ئـەوەی کـە (لنکۆڵن) لـە تاڵترین ڕۆژەکـانی جـەنگی نـاوخۆدا بەسـەری داهـاتووە کـە دەڵـێ: " بـەبێ کۆمـەکی پەروەردگار کە هەمیشە لەگەڵمدایـە نـاتوانم سـەر بکـەوم، بـەو کۆمەکییـەش مەحاڵـە ژێـر بکەوم".

هیچ بوونەوەرێك لەسـەر زەویـدا نیـە گـەر لـەژێر سایەی تاسـەی گیـانیدا، یـاخود هەستێکی ناوەکی شاردراوەدا نەژی،بەوەی کە بزانێت هێزێك هەیـەو ئـەمیش بـە فیطـرەی ڕووی تێ دەکاو پەنای بۆ دەبات.

ئەمە لەو بەسەرهاتەدا دەبینینەوە کە ماجور (ألن لیندبرج) کـە خـەڵکی ویلایـەتی نیوجێرسیو شاری ویست فیڵد بوو لێی ڕوو دا بـوو، کـاتێك پێشـەوایەتی لایـەکی فڕۆکـەی دەکـرد لـە دابـەزین بـۆ نـاو ئـاودا کـاتێك بـەرەو ئوسـترالیا دەچوو، وا دەزانـرا ئـەوو نـۆ نەفەرەکەی هاوەڵی بزر بوون. لەم بارەوە ماجور دەڵێ:

توانیمان بە دوو چوپی بەلەمی لاستیك ڕزگـار بـینو هێنـدەی نـەمابوو لـەناو چـین، تەنانەت لەتێ نانو دڵۆپێ ئاویشمان پێ نەبوو، سەرنشینەکان هەموو لە دڵەڕاوکێدا بوون، تەنیا (ألبرت هرناندس)ی سەرباز نەبێت! کە تۆپەوانی پشتەوەی فڕۆکەکـە بـوو، یەکسـەر دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوەو دڵێ ئێمەی دایەوە وەك ئەوەی بزانێـت کـە خـوای گـەورە پاڕانەوەکەی بیستووەو دێتە هانامان، لە ژێـر ئـەو خـۆرە بەتینـەدا ماینـەوەو لێوەکانمـان

وشك بوو بووە زمانمان دەرهاتبوو، بۆیە دەستەوسان بوون لە هاوکاری کردنەکەی (هەرناندس) لە زیکرو تەسبیحاتدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەپاڕانەوە، دوای سێ ڕۆژو پێش هاتنی شەو، شێوەی دوورگەیەکی بچووکیان هاتە پێش چاو، پاش کەمێك شتێکیان بینی کە نەدەهات بە خەیاڵیاندا، ئەویش سێ بەلەم بوون کە سەر نشینەکانی زەلامی رووتوقووت بوون، پاشان بۆیان دەرکەوت کە ئەم رزگارکەرانەیان خەڵکی راستەقینەی ئوستورالیا بوون، راوچی رەشپێستی قژ بژو ئاڵۆسکاو بوون، لە شارەکەیانەوە سەدان میلیان بڕیبوو، گوتیان بە پاڵنەرێکی زۆر سەیر رێڕەوی خۆیان گۆڕیبوو، و بەلەمەکانی خۆیان هێنابوو بۆ ئەو کەنارە مەرجانییانەی هیچ دانیشتوانێکیان تێدا نەبوو، لەوێ (لیندبرج)و هاوڕێکانیان بینیەوە.

٢- رادیۆی دیمەشق لە ١٩٦٥/١/١٠ کاتژمێر ٢,٤٥ خولەکی پاش نیوەڕۆ هەواڵێکی خوێندەوە کە لە گۆڤاری (الأبحاث الطبیة)ی ئینگلیزیەوە دەرچوو بوو، ئەم رووداوە لەم گۆڤارەدا بڵاو بوبۆوە بە ئیمزای ئەو پزیشکەی رووداوەکەی بینی بوو، بەسەرهاتەکەش ئەوەیە: گەنجێك بە درێژایی ١٣ ساڵ بە نەخۆشییەکی کوشندەوە دەیناڵاند،و لای هیچ پزیشکێك چارەسەری دەست نەدەکەوت، دوا پزیشك کە چووە لای، ئەم پزیشکەیە کە بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی کە فەحسی کرد هیچ هیوایەکی لە چارەسەر کردنیدا نەبینیەوە، لەم کاتەدا نەخۆشەکە بە شێوەزارێکی بێ هێواییەوە لێی پرسی: هیچ هیوایەکم لەبەردەمدا نیە دکتۆر؟.

پزیشکەکەش گوتی: تەنیا یەك هیوا هەیە ئەویش لە ئاسمانە، هەوڵ بدە تاقی بکەرەوە، ئایە دەزانیت نوێژ بکەیت؟

یەکەمجار بوو ئەم نەخۆشە بپاڕێتەوە دوای ئەوەی بە درێژایی ١٣ ساڵ نەخۆش بوو، دوای هەفتەیەك پزیشکەکە سەردانی کرد، بینی نەخۆشەکە چاك بۆتەوە، کە هیچ پزیشکێك نەیتوانی چارەسەری بکات.

٣- لاوێکی میسری بۆی گێڕاینەوە، لەوانـەی بەشـداری بـەرەنگاری نـهێنی قـەناتی سوێسی کردبوو لە سـاڵانی ١٩٥١-١٩٥٤دا: کـە سـێ کـەس بـوون ویسـتیان بچـن هێڵێکـی ئاسن لە شوێنێکی لەبەرچاودا بتەقێننەوە ، شەوێکی مانگەشـەو بـوو، ئاسمـان سـایەقە بـوو، زەوییەکـەش بیابـان بـوو، لـە دوورەوە هـەموو جوڵەیـەکێ دیـار بـوو، ئەمـەش ئەبووە هۆی تیر بارانکردنیان لە لایەن دوژمنانــەوەو شـوێن کـەوتنیان!، یـەکێك لـەو سـێ کەسە لە کاتی ڕۆیشتندا گوتی: ئەی پەروەردگارا هیچ هەورێك بەڕووی ئاسمانەوە نیە!... هێندەی پێنەچوو پەڵە هەورێکیان بینی بەری مانگی گرت، دنیا تاریك بوو، ئەمـەش بـووە هۆی یارمەتی دانیان بۆ ئەنجامدانی کارەکەیاندا.

ڕەنگە هەمووش ئەوەمان بیستبێت کە کاتێك هێرشە سێ قۆڵییەکە بۆ سـەر میسـر دەستی پێ کرد، ئاگر لە بۆر سەعید کەوتەوەو خەڵك زۆر تەنگـەتاو بـوون، بەدڵسـۆزییەوە لە خوا دەپاڕانەوە، ئیدی باران باریو هەر لەو ڕۆژەدا ئاگرەکانی کوژاندەوە.

٤- خەڵکی لە هەموو لایەکەوە دەدوێن، هیچ موسـوڵمانێکیش نیـە گـەر ئـەزموونی تایبـەتی لـەم بـوارەدا نـەبێت. کـاتێك ڕێگـەی لەبـەردەمدا تەسك بۆتـەوە بـە شـێوەیەکی پەرێشان پەنا دەباتە بەر پەروەردگار، ئیدی وەڵام وەردەگرێتەوەو ڕزگار بوون دێتـە دی. دیارترین واتاش لەم ڕووەدا بەسەرهاتی باران نەبارینە، کاتێك موسـڵمانان دووچـاری وشـك هـەڵاتن دێن، لـەم بارەیەشـدا ئـادابی تایبـەتی هەیـە، لەوانـە: تـەوبە کـردن، نوێـژ کـردن، پاڕانەوە. لـە سـەردەمی پێغەمبەریشـەوە ﷺ موسـڵمانان لـەو سەراسـیمەیە دەدوێـن کـە ڕووی داوە، هــەروەها لــەبارەی کەســانێکەوە کــە پاڕانــەوەکانیان وەڵام دراوەتــەوە، کەسێکیش بەدوادا چوونی ئەم ڕووداوەی هەبێت بۆی دەردەکەوێت کە ڕاستەو بـەرەنگاری وردترین پێوانەی ڕەخنەی مێژووش دەبێتەوە.

دیـاردەی وەڵام دانـەوە دیاردەیەکـە هەمیشـە دووبـارە دەبێتـەوە، هـەچ کـاتێك مەرجەکانی بێنە دی، ئەمەش بە شێوەیەکی بڕاوەو یەکلا کەرەوە بەڵگەیـە لەسـەر بوونـی زاتێکی پایە بەرزو بڵند ، کە هاوارو دادو ناڵەی بـانگخوازانو پەرێشـانان دەبیسـتێ، گـەر

بیەوێ وەڵامیان دەداتەوە، هەر چۆنێك بێت‌و لــە هــەر كوێیــەك بێـت، گـەر موسـڵمان بێـت یاخود بێ باوەڕ. هەموو كاتێك پەروەردگار وەڵامی موسـڵمان دەداتـەوە گـەر مەرجەكانی پاڕانەوەی تیا بێتە دی، وەڵام دانەوەش نیشانەی خێرە بۆ موسڵمان، هیچ شتێكیش لەمە خێر تر نیە بۆی ﴿وإذا سألك عبادي عني فإني قريب أجيب دعـــوة الداعِ إذا دعــانِ فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون﴾ البقرة/١٨٦.

واتە: كاتێ بەندەكانم لە بارەی منەوە لە تۆ پرسیار ئەكەن (بڵێ كـە) مـن نـێزیكم، پاڕانــەوەی دوعـا كـەران لـە كاتـێ بـانگم بكـەن، وەڵام ئەدەمــەوە، جـا ئــەبێ ئــەوانیش دەعوەت‌و فەرمانەكانم وەڵام بدەنەوەو بڕوام پێ بێنن، بەڵكو رێ پەیا بكەن.

﴿وقال ربكم ادعوني أستجب لكم﴾ المؤمن/٦٠.

واتە: و پەروەردگارتان وتی: بانگم بكەن تا وەڵامتان بدەمەوە.

گوێ رایەڵی پەروەردگار بكە پەروەردگاریش وەڵامی پاڕانەوەكانت بداتەوە.

كەسێك بیەوێت زیاتر ئەم باسە تاو توێ بكات ئەوا با كتێـبی (الفـرج بعـد الشـدة)ی قاضی التنوخی بخوێنێتەوە.

ئەمە بەسە لەمبارەیەوە، ئێمەش لێرەدا بە كورتی بڕاندومانەتــەوە بـە هـۆی زۆری رووداوو دەركەوتنیانەوە، هەروەها چونكە لە دووەم بەشی ئەم زنجیرەیەدا (الرسـول) ﷺ نموونەی زۆری تێدایە.

# دیاردەی پێنجەم

## دیاردەی ڕێپیشاندان

ئێمە کاتێك لە گەردوون دەکۆڵینەوە هەست بەڕێپیشاندانێکی تەواو دەکەین، لە بچووکترین گەردەوە تا گەورەترین تەنەکانی، لە ساکارترین شێوەیەوە تا ئاڵۆزترینیان، ئەی چۆن شیتەڵی ئەم ڕێپیشاندانە بکەین و لێکی بدەینەوە؟ چۆن بەرپا بووە؟ چۆن بەردەوام ئەبێ؟ چۆن چەسپاوەو ماوەتەوە؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارانەوە ژێری تەنیا یەك وەڵامی هەیە بیداتەوە، ئەویش بوونی زاتێکی ڕێپیشاندەرە.

١- چ کاتێك ماری ئاوی گەشەی خۆی تەواو کرد، لە هەموو کانیو ڕووبارەکانەوە بۆ ماوەی هەزاران میل ڕێ دەبڕن بەرەو ئۆقیانووسەکان، بە مەبەستی گەیشتن بە قوڵاییە سەختەکانی باشووری (بەرمۆدا)، چونکە لەو شوێنەدا سەرجەم مارە ئاوییەکانی جیهان کۆ دەبنەوە، لەوێش هێلکە دەکەنو دەمرن، بەڵام مارە گچکەکان کە هیچ هۆکارێك نابیننەوە تا شتەکانی پێ بناسنەوە، تەنیا ئەوە نەبێت کە لە ئاوی کەمدایەو بە دوای خۆیدا ئەگەڕێتەوە، تا ڕێگەی ئەو کەنارە دەدۆزێتەوە کە دایکەکانی لێوە هاتووە،

لەوێشەوە بۆ رووبارو دەریاو کانیە بچووکەکان. بۆیە هەموو جێیەکی ئاوەکان مار ماسی تێدایە، کەچی هەرگیز ئەوە رووی نەداوە مار ماسی ئەمەریکی لە ئاوی ئەورووپیدا راو بکرێ و بە پێچەوانەشەوە.

٢- زەردەواڵە راوی وشترالووك (کوللەی گەورە) دەکات، بە دەرزییەکەی لە شوێنی لەشی دەدات و بێهۆشی دەکات بەڵام هەر بە زیندوویتی دەمێنێتەوە، وەك جۆرە گۆشتێکی پارێزراو، بەڕادەیەکیش ژەهری تێ ناکات کە بیکوژێت، یاخود ببێتە هۆی ژەهراوی بوونی گۆشتی بێچووەکانی کاتێك لە گۆشتەکەی دەخۆن، هێندەشی ژەهر تێ ناکات کە بێهۆشی نەکات و هیچ کاری لێنەکات و هەڵبێت، پاشان چاڵێکی لە زەوی بۆ هەڵدەکەنێت، ئیدی مێینەی زەردەواڵە دێت و گەراکەی خۆی لە شوێنێکی گونجاودا دادەنێت، پاشان چاڵەکە دادەپۆشێتەوە ئیدی بە بێ باکی بەجێی دێڵێت، دوای ئەوەی کە دڵنیا بوو هۆکاری ژیانی بۆ بێچووەکانی فەراهەم هێناوە بۆخۆی دەمرێت، بێچووەکانیش بچووکن ناتوانن بجوڵێن. بێگومان زەردەواڵە هەر لەسەرەتای یەکەم رۆژی دروست بوونیەوە بەم کارە هەستاوەو ئێستاش هەر لەسەری بەردەوامە، گەر وا نەبووایە هیچ زەردەواڵەیەك لەسەر رووی زەویدا نەدەمایەوە.

٣- لە ویلایەتی نیو ئینکلاند جۆرە کوللەیەکی لێیە کە تەمەنی دەگاتە ١٧ ساڵ، پاش ئەم ماوەیە ژێر زەوی جێ دێڵێ لە کاتێکا لە قوڵایی تاریکییەکانیدا ژیاوە، لەگەڵ گۆڕانێکی کەم لە پلەی گەرمادا، بۆیە بە مەلایینیان لێ دەردەکەوێ دوای ٢٤/مایۆ/ی ساڵی حەڤدەهەمین، ئەم دەرکەوتنەش بەم وردەکارییە لەو رۆژە دیاری کراوەدا بە ڕێپیشاندانێکە کە مرۆڤ لێی حاڵی نابێت گەر "رۆژمێر" بەکار نەهێنێت.

٤- زانایەکی ئەمریکی ویستی هێلکە بتروکێنێ بێ پەروەردەی مریشکەکەی، بەشێوەیەك کە هێلکەکە لە هەمان پلەی گەرمادا دابنێ کە مریشکەکە دەیبەخشێت بە هێلکە بۆ هەڵهێنان، کاتێك هێلکەکانی کۆکردەوە بۆ خستنە ناو ئامێری هەڵهێنانەوە، جوتیارێك ئامۆژگاری کرد کە هێلکەکانی ئەم دیوو ئەودیو پێ بکات چونکە مریشك وا

دەكات، زاناكە گاڵتـەی بـەم قسـەیە هـات، بۆشـی ڕوون كردەوە كـە مەبەسـتی مریشـەكە لەمەدا ئەوەیە گەرمایی ببەخشـێ بـە بەشـی ژێـرەوەی هێلكەكـە، كـە لـە گـەرمایی لەشـی مریشكەكە بێ بەش بووە، بەڵام زاناكە سوور بوو لەسەر ئـەوەی هێلكەكـە بـە شـێوەیەكی چەسپاو دابنێتو گەرماییەكە بە شێوەیەكی چەسپاو بە هێلكەكە ببەخشێت.

زاناكە بەم كـارەوە خـەریك بـوو تـا كـاتی هەڵهێنان تێپـەڕیو هیـچ هێلكەیـەكیش هەڵنەهات، بۆ جارێكی دی تاقی كردنەوەكەی بە ئەنجام گـەیاندەوەو ئـەمجارە بـە قسـەی جوتیارەكەی كرد، یان با بڵێین لاسایی مریشـكەكەی كـردەوە، بۆیـە لـە كـاتی هەڵهێناندا هێلكەكانی ئەم دیوو ئەودیو پێ دەكردو بەم جـۆرە لـە كـاتی هـاتنی كـاتی دیـاری كـراودا جوچكەكان سـەریان هەڵهێنا، دوا لێكدانـەوەو شـیكاری زانسـتییانەش بـۆ هەڵگێڕانـەوەی هێلكەكان ئەوەیە كە كاتێك جوچكەكە لەهێلكەكەدا دەخولقێـت مـاددە خۆراكییـەكانی لـە بەشی خوارووی لەشیدا دەمێنێتەوە ئەگـەر گـەدەی نـەجوڵێنرێت، بۆیـە دەبینـین مریشـك تەنیا لە یەكەم ڕۆژو دوا ڕۆژدا هێلكەكە ئەم دیوو ئەودیو پێ ناكات.

بەم جۆرەو ئا بەم ڕێپیشاندانە تەواوە بۆ كرداری مانەوەی ڕەگەز، تۆوی مریشك لە جیهاندا نافەوتێت، چونكە بە تـەواوی دەزانێت كە پێویستە چی بكـات. ئەمـەش بێگومـان؛ دەبێت یەكەم مریشك بەم كارە هەستابێت تا ڕەگەزی مریشك گەیشتۆتە ڕۆژی ئەمڕۆ.

٥- ئـاژەڵی (ئیكسـیۆكۆپ) بـە تـەنیا لـەوەرزی بـەهاردا دەژیو كـاتێكیش هێلكـە دائەنێت بۆ خۆی دەمرێت، ئیدی دایكەكان بێچووەكانیان نـابینن تـا لـە خـۆراك پێدانیـاندا یارمەتیان بدەن یاخود لە بەرگری لێكردنیاندا یارمەتییان بدەن، بێچووەكانیش بۆ مـاوەی یەك ساڵ ناتوانن خواردن دەست خەن، بۆیە دایكەكە پەنا دەباتە بەر پارچـە تەختەیـەكو چاڵێكی لاكێشـەیی تیـا دروسـت دەكـات، پاشـان هـەندێك لقـی گـوڵو گـەڵای شـەكریی دەهێنێتو سـەری چاڵەكـەی پـێ دەگرێـت، پاشـان هێلكـە دەكـاتو تـۆزی تەختەكـە دەهێنێتو دەیكاتە هەویرو ئەیدا لە سەقفی چاڵەكەو پاشان چاڵێكی تر دروست دەكات،

بۆیە کـاتێك هێلکەکـە دەتروکێـت ئـەو کرمانـەی کـە هـەڵدێن بـۆ مـاوەی یـەك سـاڵ تـێری بێچووەکان دەکات.

٦- رەگی دارخورما رەگـەزە خۆراکییـەکان بـە هـۆی موولولـەی ریشـەییەوە لـەناو خاکدا دەمژن، ئیدی خۆراکاوەکان بە پاڵەپەستۆی موولولەیی (ئەزمۆزی) بـەرەو سـەرەوە دەچێت، رەگی دارخورماکە بەمـە پتـەو دەبێـت، بـەلام پاڵفتەکـە بـۆ بەشـەکانی سـەرەوە دەچێت تا لەوێ خۆراکیان پێ بـدات، خۆراکـە شـلە پوختەکـە بـەرووبوومی لێ پێـك دێـت. (قمع البلحة)ش ئەو جێگەیە لە خورمادا کـە بـە ئـەرکی پاڵفتـەکردن هەڵدەستێتو رێ بـە ماددە خۆراکییـەکان ئـەدات بچنـە بەشـەکانی نـاوەوەو بەمـەش توێکڵـی شـیرینی خورماو ناوکە تاڵەکـەی پێـك دێـت، ئـا بـەم جـۆرە لـەو خۆراکـە پارچـەی نـەرمی خورمـاو شێوەی رەقی ناوکەکـەی دەخوڵقـێ، لـەنێوان پارچـە شـیرینو تـاڵو رەقو نەرمەکانیشـدا بەرگێکی تەنك هەیە کە بە چاو نابینرێت. هەرگیز ئەو حاڵەتەش رووی نەداوە دارخورمایەك ئەو رێیەی لێ تێك بچێت، بە جۆرێك ناوکی خورماکە لە دەرەوە پێك بـهێنێو پێشەکەشـی لە ناوەوە، یاخود پێشەکەی رەق بێتو ناوکەکەشی نەرم!..

٧- ئاژەڵی مەنەوی لە جوڵەدا بە تۆپارە دەکـات، سـەرێکی رووتـی هەیـەو ملێکـی کورتو کلکێکی درێژ، بە هۆی چەماوەیی کلکییەوە دەجوڵێت، بە جۆرێـك هـێزی بـەرگری هەیە، لە کەشو شوێنی ناگونجاودا ژیـانی تێـدا دەوەسـتێو دیـاردەی چـالاکی نـابینرێت، کاتێکیش دەوروبەرێکی گونجاو هەست پێ بکات زیندەگیو چالاکییەکانی بۆ دەگەڕێتەوەو چەند رۆژێك بەردەوام ئەبێت لە ژیانو لە چاوەڕوانی ئەو هێلکەیـەدا دەبـێ کـە هێلکـەدانی مێینە دەری دەکات -ئەمەش بە ئامێری زاووزێ دەژمێردرێ- تا بیگرێتەخۆو گەشەی پـێ بکات، ئەمەش بە ڕێپیشاندانێکی کەم وێنە دێتە دی، چونکە هیـچ توانایـەکی -کیمیـاویو زیندەگیو ژیری وئیدراکی- تێدا نیە تـا ڕێپیشـاندانی ئـاژەڵی مەنـەوی بـدات بـۆ هێلکـەی مێینە.

٨- لە کرداری شیر پێداندا هەموو شتێك بەڕێپیشاندان دێتە دی.

ئەو رژێنانەی شیر دروست دەکەن لە کاتی سك پڕیدا بـەجۆرێك گەشە دەکـەن کـە بەهۆی ئەو ماددانەوە دەبێت کە هەردوو هێلکەدان دەری دەدەن، لـە کۆتـایی سـك پـڕیو سـەرەتای منـداڵ بوونـدا، ئـەم رژێنانـە لـە رژێنی (النخامیـة) فرمـان وەردەگـرن کـە لـە قاعیدەی جومجومە دایەو فرمان بە دروست کردنی شیر دەکات، کاتێکیش منداڵ لـە دایـك دەبێ بە شێوەی ڕێپیشاندانێکی بێ سنوور بـە شـوێن مـەمکی دایکیـدا دەگـەڕێ، کـرداری شیر خواردنیش زۆر گرانە، پێویستی بە کشـانی یـەك لـە دوای یـەکی ماسـولکەکانی دەمو چاوی کۆرپەلە هەیە، هەروەها زمانو گەرووشی، زارۆکیش بەهۆی ڕێپیشاندانەوە بەهەموو ئەم کارانە هەڵدەستێت لە یەکەم کاتژمێری شیر خواردنیەوە تا کاتی دەرچوونـی لـە شـیر خواردن، تەنانەت گوتوویانە: پیاویش ناتوانێ بـەو جـۆرە شـیر بخـواتو لاسـایی کۆرپـەلـە بکاتەوە کەتەمەنی لە چەند سەعاتێك تێپەڕی نەکردووە !.

مەبەست لەم نموونانە:سـەرنج راکێشـان بـوو بـۆ دیـاردەی ڕێپیشـاندان، کـاتێکیش ژیری هۆشیار بێتەوەو بە قوڵی لە بوون بکۆڵێتەوە ئەوا ئـەم دیاردەیـە لـە هـەموو شـتێکدا دەبینێتـەوە، ئـەم دیاردەیـەش هەڵدەسـتێت بـە ڕێکخسـتنی کاروبـاری گـەردوون هـەر لـە ئەلەکترۆنی ناو گەردەوە تا گەردەکەو تا سەرجەم رەگـەزەکانی پێکهاتـەی ژیـانو زەویو خۆرەکانو مەجەڕڕەکان بە هەمۆو گۆڕانکاریو رووداوەکانییانـەوە، لـە هـەموو شـانەیەکی لەشی گیانەوەرانەوە تا هەموو ئەندامەکانی لەشی و، لە هەموو گیانەوەرێکی یەك شـانەوە تا دەگاتە هەنگو مرۆڤ...

:﴿قال ربنا الذي أعطى كل شيء خلقه ثم هدى﴾ طه/٥٠.

واتە: وتی: پەروەردگاری ئێمـە کەسێکە کەبەهـەر بونـەوەرێك ئـەوەی پێداویسـتی بەدیهێنانیەتی، پێی داوە ئەوسا ڕێنوێنیشی کردووە.

ئەمـە وتـەی قورئانـەو ئـەوەش وتـەی ژیریـی، هـەروەها ئـەوەش وتـەی زانسـتە، ڕێپیشاندان بێ بوونی ڕێپیشانـدەر نەژیرییو نەزانست دانی پیا نانێت.



ناوی ڕێپیشاندەر (الهادي)ی پەروەردگار لە هەموو شتێکدا ڕەنگی داوەتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا بێ باوەڕان گومڕا بوون‌و دڵی خۆشیان گومڕا کردووە، ئەوانیش لەناو گومڕاییەکەیاندا ڕێپیشاندراون بۆ ڕێگەی گومڕایی‌و لاڕێ بوون، چونکە مرۆڤ بەو تواناو هەڵبژاردنەی پێی دراوە، هەروەها بەو تاقیکردنەوانەی لەم ژیانەدا هاتوونەتە ڕێی کە لە شوێنەواری ئەم توانایەوە سەرچاوەی گرتووە، بە شێوەیەك پێکهاتووە: کە ناوی (الهادي) پەروەردگاریی بە جۆرێك تیادا ڕەنگی داوەتەوە کە لەگەڵ ئەم سەربەستی توانایەیدا بگونجێ بۆ ئەم تاقی کردنەوەیە.

﴿ونفس وما سواها، فألهمها فجورها وتقواها، قد أفلح من زكاها، وقد خاب من دساها﴾ الشمس/٧-١٠.

واتە: و بە نەفس‌و ئەو کەسەی چاك‌و بە تەکوز ئەوی سازدا جا چاکەو خراپەکەیشی پێ ئیلهام کردووە، بە هەقیقەت هەر کەس نەفسی پاك کردەوە ڕزگاری دەبێ،و هەر کەس نەفسی خۆی بە گوناه ئالودە کرد، بێ هیواو بێ بەش بوو.

﴿وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى، فإن الجنة هي المأوى﴾ النازعات/٤٠-٤١.

واتە: و بەڵام هەر کەس کە لە گەورەیی پەروەردگاری ترساوەو نەفسی خۆی لە هەواو هەوەس گێڕاوەتەوە جا بەڕاستی بەهەشت جێیەتی.

بێ باوەڕان لە مێژەوە بانگەواز کردن بۆ لای (ﷲ)ﷻ پەروەردگارو گێڕانەوەی هەموو شتێك بۆ لای ئەو بە درۆو فیشاڵ‌و ئەفسانە لێك ئەدەنەوە ﴿قال ربي يعلم القول في السماء والأرض وهو السميع العليم، بل قالوا أضغاث أحلام بل افتراه بل هو شاعر﴾ الأنبياء/٤-٥.

واتە: (بەڵام پێغەمبەر) فەرمووی: پەروەردگاری من هەموو قسەیەك چ لە ئاسمان‌و چ لە زەوی بێ ئەیزانێ، هەر ئەویشە زۆر ژنەواو زانا، ئەوانە وتیان: نا (ئەوەی موحەممەد هێناویەتی وەحی نیە) بەڵکو خەوی هاشەو پاشەیە، بەڵکو بە درۆ ئەوانە بەدەم خواوە هەڵدەبەستێ تا بەڵکو ئەو شاعیرو هەستیارێکە !..

بەڵام بێ باوەڕان ئەمڕۆ هەموو وتەیەکی بێجگە لەخۆیان وادادەنێن کە نازانستییەو بۆنی ئەفسانەو خەیاڵاتی لێ دێت. لێکچوونی تـەواوی نێـوان ئـەو دوو هەڵوێسـتە لـە کۆن و نوێدا بەڵگەیە لەسەر یەکێتی دەروونی مرۆڤایەتی، هەر چەندە وتەکانیش بەناو لـە لایـەن فەیلەسـوفەکانەوە بـە شـێوەیەکی ڕازاوەیـی دەربچێت، وەك ئـەوەی بەڵگـە بێت لەسـەر جۆرێك ڕێپیشاندان بۆ گومڕایـی، وەکـو ڕێپیشـاندانی چاکـە خـوازان بـۆ ڕێگـەی هیدایـەت، ئەمەش دەرکەوتنی ناوی (الهادي) خودایە لە جیهانی ئادەمیزاددا ﴿وهديناه النجديــــن﴾ البلد/١٠، واتە: و ئەوم بۆ (دوو ڕێگای) چاکەو خراپە ڕێنوێنی کرد. ﴿إنا هديناه السبيل إمـا شاكراً وإمّا كفوراً﴾ الدهر/٣، واتە: بەڕاستی ڕێگامان بەو نیشان داوە، جا یا سوپاس بێژە یا ناسوپاسە.

بێ باوەڕان وای دادەنێن کە دەتوانن هەموو دیاردەکانی ئەم گەردوونە بـە بـێ خـوا ڕاڤـە بکـەن، ئەوەشـیان کـە ئـەمڕۆ ناتوانـێ لێکـی بداتـەوە وای دەبینـێ و دە زانـێ لـە پاشەڕۆژدا دەیگاتێ، جا لەگەڵ ئـەوەی ئەگـەر ئـەم شیکردنەوانەی زانستیو ژیری بـێ! یـاخود گومانـاوی حەدەسیی بـێ، بڕوایـەکی تـەواوی پێیـەتیو هیـچ ڕاڤەیـەکی تریـش وەرناگرێ هەرچەندە زانستیو ژیرخوازیش بێت، چونکە بەلای ئەم جۆرە کەسـانەوە زۆری ئەگـەرەکان:یـەك ڕێ تێچووەکـەی خـۆی پـووچ ناکاتـەوە، کـەچی زۆریو جـۆراو جـۆری دیاردەکانی بوون بە لای ئەوەوە بە ڕاڤەی دەروونی خۆی دادەنێ، ئەمەش شـوێنەواری ئەوە دەردەخات کە هەست بەوە دەکات وەك زاتێکی خاوەن سیفەتەکانی زانستو هـێزو تواناو ژیانە، جـا گـەر ئـەم واتایانـە لـە گـەردوون دابماڵێن ئـەوا دەردەکـەوێت سـەرتاپای سروشت خاوەنی زانستو تواناو هـێزو ژیـان نیـە. ئەوانـە سـەبارەت هـەچ شـتێك ببینـن دەڵێن: ڕێی تێدەچێ، گەر ئێمەش نەڵێین وایـە! پـەروەردگار خـاوەن توانایـە! ئـەوا بـێ باوەڕ دەبینو (لە ئیسلام دەردەچین) بەڵام ئێمە ئەمە دەڵێین، کـە زانسـتو توانـاو هـێزی پەروەردگار لە گۆڕێ دایە، بەڵام ئەگەر زانستو توانا لە ئارادا نەبوونایە ئێمـەش ئەمـەمان نەدەگووت.

خوای گەورە شتی زۆر دەرخستووەو زۆریشی شاردۆتەوە، لەو شتە زۆرانەی کە دەری خستووە وای لە موسڵمانان کردووە بڵێن: "گەر پەردەکانی بینینی پەروەردگاریش لابچێت یەقینم زیاتر نابێت"، ئەو شتە زۆرانەش کە شاردونیەتیەوە وای لە بێ باوەڕان کردووە وا بزانن‌و یەقینیان هەبێت بەوەی کە پێشینەکان لە خەیاڵاتدا دەژیان، حوکمی ژیریش بە جۆرێکە پەروەردگار لە یەك کاتدا ئاشکراو شارراوەش بێت: بۆ دڵان ئاشکرا بێت بەڵام بۆ چاوان شارراوە بێت، چونکە بینینی بەدیهێنانی دروستکراوەکانی لە پێش چاومانە،و دڵیشمان گەواهی بۆ ئەدات، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ومن يؤمن بـــالله يهد قلبه﴾ التغابن/١١.

واتە: و هەر کەس کە بڕوا بە خوا بێنێ، خوا دڵو دەروونی ڕێنوێنی ئەکات.

لە نەبینینی پەروەردگاردا بەڵگەی بێ باوەڕ بوون بە دەستی بێ باوەڕانەوە نیە، ئەمەشمان لە سەرەتای باسەکەماندا خستە ڕوو، بەڵام لە دەرکەوتنیدا بەڵگەیەکی تەواو هەیە لەسەر باوەڕ بوون پێی، جا ئەگەر لە گومڕایی گومڕایاندا نیشانەو جۆرێکی ڕێپیشاندان هەبێت لە گومڕایی، چونکە خۆیان بێ بەش کردووە لە بینینێکی ڕوون‌و، شتەکان بە پێچەوانەوە دەبینن، ئەوا لە ڕێپیشاندانی ڕێپیشاندراواندا دیاردەیەکی تەواومان بۆ دەردەکەوێت لەسەر ڕێپیشاندانێکی تەواو. بەڵام هەروەك چۆن لە ڕێپیشاندانی ڕێپیشاندراواندا بەڵگە هەیە لەسەر دیاردەی ڕێپیشاندان، ئەوا لە ڕێپیشاندانی گومڕایانیش بۆ ڕێگەکانی گومڕایی بەڵگە هەیە لەسەری، وەك لەمەودوا ڕوونی دەکەینەوە، هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە زاتێکی ڕێپیشاندەر هەیە.

❁❁❁

نیشانەو ئایەتەکانی پەوەردگار زۆر ڕوون‌و ئاشکران‌و لە هەموو شتێکدا دەرئەکەون، بەڵام گەیشتنە ئەم ئایەت‌و نیشانانە پێویستی زیاتری بە مرۆیی بوونە، پێویستی بە ڕەوشتە بە شێوەیەکی وردتر ﴿سأصرف عن آياتِيَ الذين يتكـــبرون في الأرض

بغير الحق وإن يروا كل آية لا يؤمنوا بها وإن يروا سبيل الرشد لا يتخذوه سبيلا وإن يـــروا سبيل الغي يتخذوه سبيلا ذلك بأنهم كذبوا بآياتنا وكانوا عنها غافلين﴾ الأعراف/١٤٦.

واتە: کەسانێ کە لە زەوی بە ناهەق خۆ بە زل ئـەزانن لـە نیشـانەکانی خـۆم لایـان ئەدەم، ئەگەر هەر جـۆرە نیشـانەیەك ببینـن بـڕوای پـێ نـاهێننو ئەگـەر ڕێگـای هیدایـەت ببینن، پێیدا ناڕۆنو نایکەنە ڕێگای خۆیان،و ئەگەر ڕێگـای خـوار (و خـراپ) ببینـن پێیـدا ئەڕۆن (هەموو ئەمانە) لەبەر ئەوەیـە کـە نیشـانەکانی ئێمـەیان بـەدرۆ دەخسـتەوەو لـەوە غافلٚ بوون.

ئەمە ڕاستییەکە بەرپەرچ نادرێتەوە، خۆ بـەزل زانـینو بـێ ئاگـایی لـە ئایەتـەکانی پەروەردگار دوو ڕێگەی بێ باوەڕین، هـەروەها گەردنکـەچی بـۆ هـەقو ڕازی بـوون پـێیو بێداریی سەبارەت ئایەتەکانی پەروەردگار ڕێگای باوەڕبوونە، چونکە مـرۆڤ بـە ڕەوشـتو ئاکـاری مرۆڤایـەتیو زیـاتر بـە هیـوا بـوونو داواخـوازی هـەق، بێگومـان مـرۆڤ دەگاتـە پەروەردگار. گەروتیشیان سەرچاوەی ڕێپیشاندان توانای خوای گەورەیە ﴿ولو شئنا لآتينـا كل نفس هُداها﴾ السجدة/١٣.

واتـە: و ئەگـەر بمانویسـتبا (بـە زۆر) ڕێنوێـنی پێویسـتمان بـە هـەر مرۆڤێـك ئـەدا. دەڵێین: سەرچاوەی هەموو شتێك ویست وتوانای خوداوەندە، ئەمەش هیـچ بیانوویـەك بـۆ بیانووکـەرانو شـرۆڤەکەرانو هـەڵاتووان لەبەرپرسـیارییەتی ناهێڵێتـەوە، خـوای گـەورە فەرموویەتی ﴿إن هو إلاّ ذكر للعالمين. لمن شاء منكم أن يستقيم﴾ التكوير/٢٧-٢٨.

واتە: ئەو قورئانە تەنیا پەندو یاداوەرییەکە، بۆ جیهانیان بۆ هەر کەس لە ئێوە کە بیەوێ بکەوێتە سەر ڕێگای ڕاست. ئەبو جەهلیش گوتی: ئەوە بۆ ئێمەیە ئەگەر ویسـتمان، خوای گەورەش تەواوکارییەکەی ئایەتەکەی دابەزاند: ﴿وما تشاؤون إلاّ أن يشـــاء الله رب العالمين﴾ التكوير/٢٩.

واتە: و ئێوە ناتانەوێ مەگەر (ئەوەی کە) خوا بیەوێ کە پەروەردگاری جیهانیانـە.
ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ویستی پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، ئەمەش ڕۆڵو هەڵبژاردنی مرۆڤ وەلا ناخات.

﴿يهدي به الله من اتبع رضوانه سبل السلام﴾ المائدة/١٦.

واتـە: خـوا بـەوە، کەسانێ کـە بـەڕازی بوونـی خـوا پـەیڕەوی بکـەن بـۆ ڕێگـای سەلامەتو ئاشتی ڕێنوێنیتان دەکا.

﴿يضل به كثيراً ويهدي به كثيراً وما يضل به إلاّ الفاسقين﴾ البقرة/٢٦.

واتە: خوا زۆر کەسی پێ گومڕا ئەکاو زۆر کەسیشـی پـێ ڕێنوێنی ئـەکاو خـوا بـەو (مەسەلەیە) کەس گومڕا ناکات، مەگەر فاسقان نەبێت.

پەروەردگار گەر بیەوێت کەسێك گومـڕا بکـات لـەم بوونـەوەرە بـە نـاوی گومـڕاوە ئاشـکرای دەکـات، هـەتا لـەهیچ ئایـەتێکی پـەروەردگار لـە دروسـتکرداوەکانیدا دەسـتی پەروەردگار نابینێتەوە، هـەروەها لـە ئایەتـەکانی قورئانیشـدا، تەنانـەت هیـچ نیشـانەیەك نابینێتەوە بیگەیەنێتە پەروەردگار، ئەمەش بە زۆری خودا نیـە، بـەڵکو بـەهۆی ئەوەوەیـە ئەو مرۆڤە بۆ خۆی ڕێگاکەی تری هەڵبژاردووە بە هۆی خـۆ بـە زلزانـینو ستەمەوە، بۆیـە بەڵگەو ئایەتەکان بە پێچەوانەوە دەبینێت، ئەوەی کە بەڵگە بێت لەسەر بڕوا بوون ئەو بـە بەڵگەی بێ باوەڕی دەبینێ، ئەمەش لەبـەر ئەوەیـە کـە وتمـان وەك شـوێنەواری پـێزانینی ڕێپیشاندانی پەروەردگارە بۆ هـەردوو ڕێگاکـە، مرۆڤـیش بـە تـەنیا ئـەرکی بەرپرسـیارێتی هەڵدەگرێت.

گـەورەییو مـەزنی بـۆ ئـەو پەروەردگارەیـە کـە داوای نـەکردووە سـوننەتێك لـە سوننەتەکانی بگۆڕدرێت، ئەوەی لەسـەر مرۆڤـیش پێویستە ئەوەیـە کـە ئـەو ئەرکـەی لـە سنووری ئەو سوننەتانەدا پـێی سپێردراوە جێبەجێیان بکات.



بێ بـاوەڕان دەڵێـن: خـودا بـە توانایـە لەسـەر ڕێپیشـاندانی سـەرجەمی ئـادەمیزاد لەوەی پێی خۆشە؛ ئەی بۆچی ڕێیان پیشان نادات؟.

پەروەردگار ئەشتوانێ کە گێتی لە شەڕ پاك بکاتەوە؛ ئەی بۆچی وا ناکات؟ ئەمانە وا دەڵێن تا ئەم کۆتا وشەیە بدرکێنن: (بەو پێیەی کە لە جیهاندا گومڕایی‌و خراپـە هەیـە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم جیهانە لە دروست کردنی پەروەردگار نیە!).

پاشان بە بڕوادارانیش دەڵێن: مادام بڕواتان بە قەزاو قەدەر هەیە، ئەوا ئەو لادانەی ئێمـە تووشـی بوویـن خـوا بـۆی بڕیوینەتـەوەو ڕزگـار بوونمـان نیـە لێی، ئـەوا ئـەو کاتـە پەروەردگار بەرپرسیار دەبێت! نەك ئێمە، ئەوا هیچ جارێك لۆمەی ئێمە مەکەن، ئایا خودا نەیفەرمووە ﴿يضل الله من يشاء ويهدي من يشاء﴾ المدثر/٣١.

واتە: ئا بەم جـۆرە خـوا هـەر کەسـێ بیـەوێ لاڕێیـی دەکـاو هـەر کەسـیش بیـەوێ ڕێنوێنی دەکا.

ئێمەش دەڵێین بێ باوەڕە پێشینەکانیشیان ئەم وتەیـەیان درکـاندووە، قورئـانیش وەڵامی داونەتەوە بەڵام چۆن وەڵام دانەوەیەك؟ ﴿وقال الذين أشركوا لو شاء الله ما عبدنا من دونه من شيء نحن ولا آباؤنا ولا حرمنا من دونه من شيء كذلك فعل الذين من قبلهم فهل على الرسل إلا البلاغ المبين، ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدى الله ومنهم من حقت عليه الضلالة﴾ النحل/٣٥-٣٦.

واتە: و موشریکان وتیان: ئەگەر خوا بیویستبا، نـەك ئێمـەو نـە باووباپیرانمـان بـۆ غەیری ئەویان عیبادەت نەدەکردو شتێکمان بـێ ئیجـازەی ئـەو حـەرام نـەدەکرد، (بـەڵێ) ئەوانە بەر لەوانیش هەر ئەم کارەیان دەکرد، جا ئایا پێغەمبەران ئـەرك‌و ڕاسپاردەیەکیان بێجگـە لـە ڕاگـەیاندنی ئاشـکرا بـۆ هەیـە؟! و بـە هەقیقـەت ئێمـە لـەناو هـەر ئوممـەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووەو تا خوای تاقانە بپەرستن‌و لە تاغوت‌و ستەمکار دووری بکەن، جا خوا تاقمێکی ڕێنوێنی کردو تاقمێکیش لاڕێیی‌و گومڕایی داوێنیان گرت.

بێ بـاوەڕانی سـەردەمە پێشـینو سـەرەتاکانیش هـەر بـە هـەمان زار دەدوانو بـێ باوەڕانی ئەمڕۆش بەکاری دێننەوە: ﴿سیقول الذین أشرکوا لو شاء الله مـــا أشـــرکنا ولا آباؤنا ولا حرمنا من شيء کذلك کذب الذین من قبلهم حتی ذاقوا بأسنا قل هل عندکم مـن علم فتخرجوه لنا إن تتبعون إلا الظن وإن أنتم إلا تخرصون﴾ الأنعام/١٤٨.

واتە: بە زوویی موشریکان (بۆ بەری بوونی خۆیان) ئەڵێن: ئەگـەر خـوا بیویسـتبایە نەئێمە دەبووینە موشـریكو نـە باووباپیرانمـان، و ئێمـە هیـچ شـتێکمان حـەرام نـەدەکرد، کەسانێ کە بەر لەمانە بوون هەروا (پێغەمبەرانیان) بەدرۆ ئەخستەوە تا سـەرەنجام تـامی سزاو عەزابی ئێمەیان چەشت، بڵێ: ئایا (بەڵگەیەکی) زانستانەتان لا هەیە تا دەری بخەنو بە ئێمەی بنوێنن؟ ئێوە تەنیا لە گومانی بێ بنەڕەت نەبێ پەیڕەوی ناکەن،و ئێوە بێجگە لە درۆ شتی ترتان بە زاردا نایێ.

کەواتە ئایا نرخی بەڵگەی کافران چییە؟ ئەگەر تێبینی وەڵامە قورئانیـەکان بکـەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەرانی خوایان(صلوات الله علیهم) بەدرۆ زانیوە، هەروەها بە نەفام ناوبراون، پەیامی پێغەمبەرانیش –صلوات الله علیهم– بەڵگەیە لەسەریان.

ئەوانـە سـەیری گشـتگیریی ویسـتی پـەروەردگار دەکـەنو سـەیری توانـای خۆیـان نـەکردووە، بۆیـە ویسـتوویانە بەڵگـە لەسـەر پـەروەردگار بهێننـەوە بـە تەواوێتییەکـەی (الکمال)، خوای گەورەش بەڵگەیان لەسەر دێنێتـەوە بـەو توانایـەیان کـە لـە ڕێی ڕاسـتی خۆیدا بەکاری ناهێنن.

ئەوەی کە خوا نووسیویەتیو زانستی پێیەو ویستی لێیە، ڕێی هەڵبژاردن لە مرۆڤ ناگرێت، هەردووکیان هەڵەیـەکی گـەورەن، کـەوا گومـان بـەرین پـەروەردگار نـازانێت چـی ڕوودەدات، یاخود وا بزانین کە بوونی زانیاری بەوانەی کە ڕوودەدەن توانای هەڵبژاردنی لە ئێمە زەوت کردووە، زانستی پەروەردگار دەرخەرو ئاشکراکەرە نەك سەپێنەر بێت، جا کە زانستی پەروەردگار هەڵبژاردنمان لێ زەوت نـەکات، ئـەوا هـێزو ویسـتو تواناشـی هـەر بـە

هـەمان شـێوەیە، هـێز ئـەوە ئاشـکرا دەکـات کـە ئـیرادەو ویسـت تایبەتمـەندی کــردووە، ئیرادەش ئەوە تایبەت دەکات کە زانست بەسەریا تێپەڕیوە.

ئەوە هەڵەیە وا تێبگەین ئەم ئایەتە ﴿يضل من يشاء ويهدي من يشاء﴾ النحل/٩٣.

واتە: ڕێنوێنی دەکا،و بە هەقیقەت لەوەی وا ئەنجامتان داوە لێتـان دەپرسـێتەوە. ئەوە دەردەخات کە ئادەمیزاد رامە لەسەر هیدایەتو لەسەر گومڕایی، بەڵکو خوای گەورە دەفەرمـوێ:

﴿فلما زاغوا أزاغ الله قلوبهم﴾ الصف/٥.

واتە: جا کاتێ ئەوانە لە هەق لایاندا، خوا دڵو دەروونی ئەوانی لە حەق کرد.

﴿قد أفلح من زكّاها وقد خاب من دسّاها﴾ الشمس/٩-١٠.

واتە: بە هەقیقـەت هـەر کـەس نەفسـی پـاك کـردەوە رزگـاری دەبـێ،و هـەر کـەس نەفسی خۆی بە گوناه ئالودە کرد، بێ هیواو بێ بەش بوو.

﴿إن هو إلاّ ذكر للعالمين. لمن شاء منكم أن يستقيم، وما تشاؤون إلاّ أن يشاء الله رب العالمين﴾ التكوير/٢٧-٢٩.

واتە: ئەو قورئانە تەنیا پەندو یاداوەرییەکە بۆ جیهانیان، بۆ هەر کەس لە ئێوە کە بیـەوێ بکەوێتـە سـەر ڕێگـای ڕاسـت. (ئـەبو جـەهلیش گوتــی): ئــەوە بــۆ ئێمەیــە گــەر ویستمان،و ئێوە ناتانەوێ مەگەر (ئەوەی کە) خوا بیەوێ کە پەروەردگاری جیهانیانە.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە ویسـتی پـەروەردگار بەسـەر هـەموو شـتێکدا زاڵـە، ئەمەش ڕۆڵو هەڵبژاردنی مرۆڤ وەلا ناخات.

بـەڵێ مـرۆڤ خـاوەنی ئیرادەیـە بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت شـتێك هــەبێت لــە دەرەوەی ئیرادەی خوای گــەورە، سـەرجەم ئـیرادەی پـەروەردگار ڕاسـتە، ئەمـەش ئـەوە ناگەیەنێت سەربەستیو هەڵبژاردنی مرۆڤ زەوت بکرێت.

لە کۆتاییدا: خوای گــەورە هــەموو شـتێکی بـەدی هێنـاوە،بەرجەسـتە بێـت یـاخود مەعنەوی، هەر لە رەوشتی باشەوە تا رەوشتی خراپیش، تـا گـرۆی ئـادەمیزادو سـەرجەم

بوونەوەر، هیدایـەتی هـەموو شتێکیشی داوە، تەنانـەت خـۆ بـەزل زانینیـش ڕێپیشـاندانی ڕێگاکەی پێویستە، هەروەها حەسوودیو گومڕاییو هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی گومڕایی، هەروەها هیدایەتیش، و هەروەها لقەکانی درەختی مێویش کە بگاتـە هـەر شـوێنێك خـۆی تێوەدەئاڵێنێ، هەروەها خۆرو مانگ، سەبارەت مرۆڤیش[بە تایبەتی]ئـەوا: زاتو دەروونو لەشو هەموو شـتێك تێیدا نیشـانەی ڕێپیشـاندانە بـۆ ڕێگاکـانی، ئەگـەر وازی لێ بـهێنرێت لەسەر خوو سیفەتەکەی خۆی، بەڵام مرۆڤ سەبارەت ئەو مەلەکاتەی پـێی دراوە شـیاوی بەرپرسیارێتی کردووە، وای لێکردووە خێرو شەڕ بۆ ئەو تاقیکردنەوە بێت! ﴿ونبلوكـــم بالشر والخير فتنة﴾ الأنبياء/٣٥.

واتە: و ئێمە بە (گەیاندنی) خراپەو چاکە ئێوە تـاقی دەکەینـەوە. لـەم ئاکامەشـدا بۆتە ئەرك لەسەری هەوڵی زاڵ بـوون بـدات بەسـەر زۆربـەی ویسـتو ئـارەزووو شـەهواتو حـەزەکانیدا، بـەڵکو بوونـی خـۆی بـە پـێی ڕێپیشـاندانێکی دیـاری کـراو بگونجێنـێ، کـە سروشی خوایی بۆی دەست نیشان کردووە؛ تا لەم سەرزەوییەدا بە ڕۆڵی خۆی هەستێ بە پێی ڕێگەیەکی تایبەت.

بەم پێیـە لادانـی مـرۆڤ لـەم ڕێگەیـە دەبێتـە گومڕایـی، هەرچـەندە لقـەکانی ئـەم گومڕاییەش لە ڕێپیشـاندانەوە سـەرچاوەی گرتـووە، کـە بـە هـەموو شـتێك بەخشـراوە لـە بابەتەکەی خۆیدا: ﴿وهديناه النجدين﴾ البلد/١٠.

واتە: و ئەوم بۆ (دوو ڕێگای) چاکەو خراپە ڕێنوێنی کرد.

بەڵام سەبارەت توانای مرۆڤ کە ئایا دەسەڵاتی واز هێنـانی هەیـە لـەو گومڕاییـە - هەرچەندە لەسەر حیسابی لەززەتو ئارەزووەکانی بێـت- ئـەوا پێویسـتە لەسـەری هـەوڵ بدات واتای تاقیکردنەوە بەرجەستە ببێت، هەر لەبەر ئەمەشە کـە (بەهەشـت دەورە دراوە بەناخۆشییەکانو دۆزەخ دەورە دراوە بە شـەهوات). بـە پشـتیوانی خـوداش لـە دیـاردەی حەوتەمدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

بەڵام مەبەستی سەرەکیمان لێرەدا ئەوەیە کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین هیدایەتی تەواو بۆ هەموو شتێك -بەدیهاتووی بەرهەستیو مەعنەوی- ئاماژەی زاتێکی ڕێپیشاندەرمان بۆ دەکات ﴿أعطى كل شيء خلقه ثم هدى﴾ طه/٥٠.

واتە: وتی: پەروەردگاری ئێمە کەسێکە کەبەهەر بونەوەرێك ئەوەی پێداویستی بەدیهێنانیەتی، پێی داوە ئەوسا ڕێنوێنیشی کردووە. هیچ شتێك نیە مەگەر جۆرە هیدایەتێکی گشتی پێ نەدرابێت. تەنانەت شتە مەعنەویو نابەجەستەکانیش! چ خێر بێت یاخود شەڕ، بەڵام مرۆڤ ئەرکی هیدایەتێکی تایبەتی پێ بەخشراوە، بۆیە پێویستە لەسەریشی هەوڵی هێنانەدی بدات. لە کۆتاییدا ئەوەی گرنگە: ئەوەیە کە بۆمان روون بووبێتەوە هیدایەت لە هەموو شتێکدا بە بێ (اللَّهُ)ی پەروەردگاری ڕێپیشاندەر نایەتە دی.

# دیاردەی شەشەم

## دیاردەی داهێنان و قەشەنگی

ئایا سەرنجی تابلۆی وێنەکێشێکت نەداوە کە خەڵکی سەبارەتی بڵێن بەرهەمێکی مەزنە؟ داخۆ بۆچی ئەم بڕیارە دەدەن؟ لەوەڵامدا دەڵێین: لەبەر ئەو داهێنان و نوێخوازیو وێناندن و دەربڕینەیە لە کەش و سێبەرو گونجان و مەعریفەدا هەیەتی، کە دەبێتە هۆی دروست بوونی سەرسامی لە لایەن بینەرەوە، رەنگە تۆ بە سەرسامییەوە بڵێیت: ئەم تابلۆیە فڵان هونەرمەند نەخشاندوویەتی، ئەی ئایا کاتێك کە وای لەبەردەم تابلۆیەکی رازاوەی قەشەنگی مەزنی ئەم گەردوونەدا نایەت بە خەیاڵتا کە بیر لە نەخشێنەری مەزنی گەردوون بکەیتەوە؟، یاخود راهاتنت لە سەر بینینی دیمەنەکان وای لێکردووی:بەرچاوی گرتوویت لەم جۆرە بیر کردنەوەیەدا! گەر بیر بکەیتەوە ئەوا بۆت دەردەکەوێت: جوانیو قەشەنگی پەیوەستی هەموو شتێکن لەم گەردوونەدا: هەورەکان، پەلکە زێڕینە، ئاسمانی شین، ئەستێرە رەنگاو رەنگو پەرتو بڵاوەکان کە بە رێك و پێکی دەجوڵێن و ئەندازەیەکی سەیریان هەیە، مانگ لە کاتی هەڵهاتنیدا یا لەکاتی چواردەیی و کەوانەییدا، یاخود لە کاتێکدا لە ناوەندی ئاسماندایە، خۆر لە کاتی هەڵهاتن و ئاوا بوونیدا، سپێدەو

رەسەنایەتییەکەی، قەشەنگی نیوەڕوان، هـەموو ئەمانـە شـوێنەواری نەخشـین‌و داهێنـانی مـەزنن. گـەورەترین هونەرمـەند ئەوەیـە کـە بتوانێـت سـاتێك لـە سـاتەکانی گـەردوون بـە ئەمانەتەوە بە پەڕەمووچەکەی بکێشێ، بـەڵام گـەردوون‌وهـەموو دیاردەکـانی کـە دووبـارە دەبنەوە، یاخود بە دوای یەکدا هاتنیان، یان گۆڕینی دیمەنی جوانیـان بـە جۆرێك کـار لـە دەروون دەکات کە هەموو ساتێ جوانی نەخشاندنەکان دەشڵەقێنێ.

هەر گەڵایەکی درەختەکان بەو پەڕی یاساو قەشەنگییەوە داڕێـژراوە، بـە جوانـترین نەخشە، نەخشەو سازاندنێك کە چ کەسێك توانای نیە دایبهێنێت مەگـەر لاسـایی کردنـەوە نەبێت، بە جوانترین شێوە لە گوڵەکاندا دەیبینیتەوە، لە بـاڵای بـاریك‌و جوانـی‌و داڕشـتنە قەشەنگ‌و رەنگە دابەشبووەکانیدا، بە جۆرێك هـەر گوڵێـك تیـایدا پارێزگـاری بـە جوانـی‌و گونجـان‌و رەنگـە تایبەتییـەکانی خۆیـەوە بکـات، لـە هـەر گوڵێکـدا هەسـتێکی نـوێ دەبینیتـەوە، زۆر قەشـەنگتر دەبێـت کـە یـەك رەگـەزی کـۆی تیـا ببینیتـەوە، هـەروەها قەشەنگیشە کە لە جۆرەها رەنگ‌و رەگەز پێکهاتبێت، هەر یەك لە گەڵاو گوڵ‌و لق‌و پـۆپ‌و بەرووبوومەکـەی داهێنـانێکی سـەیری لـە خـۆ گرتـووە، گـەر بـە تـەنیابن یـا پێکـەوە، لێکرابێتەوە یاخود پێوەی بێت.

هەروەها دۆڵی سەوزو رووبارو درەختی سەربڵند، بەردو شاخەکان کە بەفر لوتکەی داپۆشیون، یان ئەوانەی هەر لـە دوورەوە ئاسمـان شـینایی خـۆی پـێ بەخشـیوە، یـاخود کۆبوونـەوەی لمـە بەرینـەکانی بیابـان، یـا شـەپۆلە رێـك‌و پێکـە بەدوایـەکداهاتووەکانی ئۆقیانووسەکان‌و گێرسانەوەیان لـە کـەنارەکاندا، هـەروەها دەنـگ‌و هـاژەو زیقـەو خـوڕەو خوێندن‌و دەنگە جۆراو جۆرەکان، هەروەها دەنگی بروسکەو تیشکدانەوەی تینەکەی، ئایا ئەمانە هەموو جوان‌و قەشەنگ‌و سەرنج راکێش نین بە پلەیەك مرۆڤ دەترسێنن‌و سەرسامی دەکەن؟ یاخود ئەو باڵندانەی لەسەر دەریاکان ئەگەڕێن یاخود لەسـەر دارسـتانەکان، یـان لەسەر زەویدا کە دەفڕێت‌و لێت هەڵدێ، یاخود لەبەردەستتا گـەردن کەچـە، رەنگی تـەباو گونجاویی پەڕەکان، شـێوە قەشـەنگەکانیان، نـەخش‌و نیگـارە دڵ رفێنـەکانیان، لـە هـەر

پەڕێکیدا ڕەونەقێکی تێدایـە، هـەروەها لـە باڵـەکانیاندا ساتێ دەیانکاتـەوەو ساتێکی تـر دایان دەخاتەوەو بەرز دەبێتەوەو نزم دەبێتەوە، کەوا لە دڵان دەکات پـڕ بـن لـە هەستی خۆشەویستی‌و گوشادی.

تەرزەو کڵۆ بەفرە شێوە ئەندازەییە جیاوازەکان، یـان هێڵـە بلوورییـەکانی ڕەگـەزو پێکهاتە جیاوازەکان، یان ڕەنگی ڕەگەزە تاک‌و ئاوێتەکان، پێکهاتەی بەش‌و پارچەکانیان، خڕی گۆی زەوی،و تەمەکانی سـەر ڕووی مـەریخ‌و ڕووی مـانگ‌و هـەروەها لۆچـەکانی ئـەو ڕووانە، هەموو ئەمانە زۆر جوان‌و قەشەنگن، بە شێوەیەکی زۆر سەیرو سـەرنج ڕاکێـش... کاتێك بیانخەینە ژێر زەڕەبینەوە یاخود بە بینینی چاوی ئاسـایی. هـەروەها لـە حوشـتردا جوانیەکی زۆر هەیە، و لە مەڕو بەرخ‌و مانگاو بزن‌و سـەگ‌و پشـیلەو هـەموو ئـەو شتانەی خوا بەدی هێناون جوانییان تیا دەبینرێت، لە خۆشی‌و ناخۆشی‌و هــەموو هـەڵس‌و کـەوت‌و وەستان‌و جوڵـەیاندا، لـە جوڵـەی ماسـی‌و شـەپۆلدانی گیـای قوڵایـی دەریاکـان،یـاخود شەپۆلدانی گژو گیای وشکانیەکان کاتێ شەماڵ هەڵدەکات، لە ئێسکە شـکاوەکاندا کـاتێك چاك دەبنەوە، لەو برینانەی کە یەك دەگرنەوە دوای ئەوەی گۆشـت‌و پێسـتەکەیان دەمـی کردۆتەوە، لە سوری خوێندا، و ئەو دڵە شـکاوانەی شـادیان بـۆ دەگەڕێتـەوە، لـە کوتـانی تۆوی ڕووەکەکان،لەو هەنگانەی کە شیلەی گوڵان دەمـژن، لـە مـاچ کردنـی پـەپوولاندا بـۆ لێوی گوڵان، لە گواستنەوەی بۆ هەڵاڵەیـەکی تـردا.. لـە گواسـتنەوەی هەڵاڵـەی گـوڵان بـۆ یەکتری، پاشان کوتانیان‌و زۆر بوونیان‌و ڕاکێشانی دوانەکان بۆ یەکدی.. لە هەموو شتێکدا جێ دەستی قەشەنگی‌و ڕەونەق‌و نەخشانی پەروەردگار بەدیار دەکەوێت.

ئـەو تـەبایی‌و گونجانـەی لـە نێــوان هــەموو بوونــەوەراندا دەیبینــین، لــە نێــوان ئەندامەکاندا، لە نێوان ڕەنگەکاندا، ئەمانە وایان کردووە هەموو شتێك لـە شـوێنی خۆیـاندا بن، هەموو ئەمانە داهێنانن‌و ئاماژەی داهێنەر دەکەن.

﴿الذي أحسن كل شيء خلقه﴾ السجدة/٧.

واتە: و سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤی لە گڵ دەستی پێ کرد.

﴿بديع السموات والأرض﴾ البقرة/١١٧.

واتە: بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی خوایە.

﴿ذلكم الله ربكم له الملك﴾ فاطر/١٣.

واتە: ئەمەیە خوا پەروەردگاری ئێوە، فەرمانڕەوایی تایبەت بەوە.

ئەم قەشەنگیو داهێنانە لە پێناوی تۆ دان ئەی مرۆڤ ﴿ألم تروا أن الله خلق لكم ما في السموات وما في الأرض وأسبغ عليكم نعمه ظاهره وباطنه﴾ لقمان/٢٠.

واتە: ئایا نەتاندیوە کە بەڕاستی خوا ئەوەی لە ئاسمانەکانو ئـەوەی لـە زەویدایـە بۆ ئێوەی رامو دەستەمۆ کردووەو نیعمەتەکانی خۆی چ زاهیریو باتینی بێت بـۆ ئێـوەی زیاد کردووەو پێی داون. ﴿وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها﴾ إبراهيم/٣٤.

واتە: و ئەگەر نیعمەتی خوا بژمێرن، ئەوانە لەئەژمار نایەن.

ئەمانە لە پێناوی تۆدان تـاکو پـەروەردگارو هـەموو ناوەکـانی بناسـیت، سوپاسـی گەورەییو بەخشندەیی بکەیتو بە خۆشەویستیو عیشـقەوە بیپەرستیت، بۆیـە هەسـتو داهێنانو حەزی جوانی تیادا خولقـاندویت، ئەمانـە لەوپـەڕی داهێنـانو قەشـەنگیدان گـەر مرۆڤ ژیریی بەکار بێنیو تێ بگات.

خوای گەورە هێزی بیرو چوواندنو زیرەکی هەستەکی پێ بەخشیوە، بۆیە لەززەت لـە جوانـی دەبینێـت،و مـەلی خـەیاڵی لەسـەرتاوە تـا کۆتـایی دەگـێڕێت، لـە خـێرایی بروسکەیەکدا هەزاران تابلۆی بوون یاد دەکاتەوە، بە خەیاڵی پـەردەی زەویو ئاسمانـەکان ئەبڕێ، لەگەڵ ئەو درککردنەیدا کە وای لێ دەکات لەگەڵ بوونەوەردا کار لێك کـردن بکـات، حەزو ئارەزووی دەبێت، رقو خۆشەویستی دەبێـت. جـارێك هـەوڵی بنیـات نـانو ئـاوەدان کردنەوە دەداتو جارێکی تریش رووخاندن. بۆیە ژیان وەك هونەرێك دەبینێو ماناش وەك ئامێرێك؟ لە هەموو ئەمانـەدا قەشـەنگیو داهێنـان هەیـە، جـا چ جـای لـەناوەڕۆك، یـاخود رووکەشی مرۆڤـدا بێـت، یـان لـە دەوروبـەریدا بێـت، رەنگـە وێنەکێشـێك وێنەیـەکی جـوان بکێشێو داهێنان بـەرپا بکـات، وێنەیـەکی ناشـیرینیش بکێشـێت هـەر داهێنـان بکـات، لـە

هـەردوو حاڵەتەکەشـدا داهێنـان هـەر داهێنانـەو لـە هەردووکیشـیدا هـەر بـە کـارێکی بـاش هەستاوە، لە گەردووندا جوانو جوانتر هەیە، ناشیرینو ناشیرینتر هەیـە، بـەڵام لـە هـەموو ئەمانەشدا داهێنان هەیە، بەڵکو داهێنان زیاد لەمانەش دیار دەکەون، تەنانـەت جوانـی بـە هۆی ناشیرینیەوە ئاشـکرا دەبـێو جوانـتریش بـە هـۆی جوانـەوە، زیـاتر وێنـەکان ئامـاژە ئەدەن، هەردەم لە نوێ بوونەوەدا ئەمێننەوە، زیـاتریش گـەواهی لەسـەر توانـای داهێنـان ئەدەن.

جـا ئـەی مرۆڤـی هۆشـیار هـەرگیز تووشـی ئـەوە نـەبیت کـە قەشـەنگیو داهێنـان ببینیتو داهێنەرەکەی نەناسیت، یان هەست بە باشە بکەیتو چاکساز لە یاد بکەیت، یـان شەیدای جوانی بیتو دڵت پڕ نەبێت لە خۆشەویستی بەدیهێنەری جوانی، تۆش لەگەڵ ئەم شاعیرەدا بڵێ:

عذابُـــــه فيـــــك عَـــــذْبٌ ... وبُعْـــــدُه فيـــــك قـــــرْبُ
وأنـــــتَ عنـــــدي كروحـــــي ... بـــل أنـــتَ منـــها أحـــبُّ
حَسْـــبي مـــن الحـــب أنـــي ... لمـــا تحـــبُ أحـــب

(ســزاکەی لـــە تـــۆدا زوڵاڵـــە ... دووریشـــی لـــە تـــۆدا نـــێزیکی
تـۆ لای مـن هـەر وەکـو گیـانمی ... بـەڵکو تـۆ خۆشەویسـت تـری
هێنـدە خۆشەویسـتیم بەسـە ... تۆ چیت پـێ خـۆش بـێ منیـش وا)



# دیاردەی حەوتەم

## دیاردەی کار لە جێی[7]

﴿قل انظروا ماذا في السماوات والأرض وما تغني الآيات والنذر عن قوم لا يؤمنون﴾ يونس/١٠١.

واتە: بڵێ: بڕواننە ئەوەی وا لە ئاسمانەکانو زەویدایە، بەڵام ئەم نیشانانەو ترسێنەرانە بۆ هۆزێ کە بڕوا ناهێنن بێ سوودە، و بێ نیازیان ناکات (نەزر: جەمعی نەزیرەو کنایە لە پێغەمبەران دەکات).

﴿أولم ينظروا في ملكوت السماوات والأرض وما خلق الله من شيء وأن عسى أن يكون قد اقترب أجلهم فبأي حديث بعده يؤمنون﴾ الأعراف/١٨٥.

واتە: ئایا لە حوکومەتی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە هەر شتێك خوا خەلقی کردووە ناڕوانن (تا پەند بگرن)، جا بە چ قسەیەك دوای ئەو (قورئانە) بڕوا دێنن؟.

﴿وكأين من آية في السماوات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون﴾ يوسف/١٠٥.

واتە: و چەند زۆرن نیشانەکانی (خوا) لـە ئاسمانـەکانو زەویدا کـە ئەوانـە بـەلایدا ئەڕۆنو رووی لیٚ وەردەگێڕن!.

﴿ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والإنس لهم قلوب لا يفقهون بها ولهـــم أعـــين لا يبصرون بها ولهم آذان لا يسمعون بها أولئك كالأنعام بل هم أضل أولئك هـــم الغـــافلون﴾ الأعراف/١٧٩.

واتە: و بە هەقیقـەت زۆرێ لـە جنۆکـەوو ئینسـمان بـۆ دۆزەخ خولقـاند، بـۆ ئـەوان دلگەلیٚ هەیەو پیٚی تیٚ ناگەن، و چاویان بۆ هەیەو پیٚی نابینن‌و گوێیان بۆ هەیە کە پـیٚی نابیستن، ئەوانە هەر وەکو مەڕو مالاتن، بەلکو لەوانیش گومڕاترن، هەر ئەمانە غافلن.

خوای گەورە ئەوەی لە موسـلمان دەوێت کـە لـە هـەموو شـتێکدا ئایـەتو نیشـانە ببینێـت، تـا زیـاتر بـاوەڕی نیشـان بـدەن، هەسـت کـردن بـەوەش:بـەکارێکی باشمـان بـۆ دادەنێت، جا گەر موسلمان نەگاتە ئەو ئاستە بەرزە ئەوا پێویستی بە وشیارییەکی زیـاتر و بیرکردنەوەیەکی زیاترو یاد کردنێکی زیاترە.

دەسـتی پـەروەردگار کـە بەدیهێنـەرە، خـۆی لـە بەدیـهاتووەکانیدا دەرخســتووە. هـەروەها ئـیرادەی پـەروەردگار تایبەتمــەندی کـردووە خــۆی لــە دروســتکراوە جـوانو قەشەنگەکانیا دەرخـات، حیکمەتـەکانی پـەروەردگار ئاشـکرا بـوون،ئیـدی مـرۆڤ لـە چـی دەترسیٚ؟.

دلێکیش شوێنەواری پەروەردگار لە هەموو شتێکدا نەبینێتەوە ئەوا دلێکـی کوێـرە: ﴿فإنها لا تعمى الأبصار ولكن تعمى القلوب التي في الصدور ﴾ الحج/٤٦.

واتە: چونکە چاوی (زاهیریان) نابینا نابیٚ بەلکو دلو دەروونیٚ کە لە سینگیان دایە بینایی لە دەست ئەدا.

رەنگە جیٚی بەزەییو میهریش بیٚ ﴿فلعلك باخع نفسك على آثارهم إن لم يؤمنـــوا بهذا الحديث أسفاً﴾ الكهف/٦.

واتە: جا رەنگە لەبەر کردەوەی ئەوان خۆت بە غەمو خەفەت لە ناو بەری، ئەگەر بڕوا بەم قسە نەکەن؟.

خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین کە لە نیشانەو ئایەتەکانی لە گەردووندا بکۆڵینەوە، گەردوونیش بۆ خۆی جێی سەرنجە. جا لەم بارەیەوە بێ باوەڕان و بڕواداران وەك یەك لێیان کۆڵیوەتەوە، کەم تا زۆریش هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان زانستی ئەم دوو لایەنەدا، بەڵام جیاوازی نێوانیان رادەی بەکارهێنانی ژیریی و یاساکانییەتی بۆ گەیشتن بەو دیوی سروشت، یان بە مەیین و وەستان لە تێڕوانیندا تەنیا بۆ بەرهەستەکان و بەکار نەهێنانی ژیریی و پابەند بوون و گۆشە گیری بە تەنی خاکەوە(بە واتای مانەوە تەنیا لەبەر هەستەکاندا).

بۆیە قورئان زۆر باسی ئەوەی کردووە: لە گەردووندا ئایەت و نیشانەو بەڵگە هەن بۆ کۆمەڵێك تێ بگەن، یان بیر بکەنەوە، هەروەها زۆر باسی ئەوەشی کردووە کە لەمەدا نیشانە هەیە بۆ کۆمەڵێك ژیر بن ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون﴾ النحل/١٢.

واتە: بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك هەیە (لە گەورەیی خوا) بۆ تاقمێ کە ئەقڵی خۆیان دەخەنە کار. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حوکمی یاساکانی ژیریی مەرجێکە بۆ ناسینی ئایەتەکانی پەروەردگار.

بەم پێیەش هەر دیاردەیەك لە گەردووندا لێی دەدوێین ناڵێین ئێمە بە تەنیا پەی پێ دەبەین و دەیزانین، بەڵکو ئێمەو بێ باوەڕان لەم زانینەدا هاوبەشین، بەڵام جیاوازیمان ئەوەیە ئێمە شیتەڵی بوونی ئەو دیاردانە بە پەیوەستییەکی ژیریی دەکەین کە دەبێت لە گەڵیدا بێت، بەڵام ئەوان بێ بەڵگە رەفزی ئەم شیتەڵە ژیرییە دەکەن؛ وەك ئەو ئەندازیارانەی لەبەردەم بینایەکی زۆر قەشەنگدا راوەستاون و هەموویان هاوبەشن لەوەدا کە دەزانن بیناکە لە چی پێك هاتووە،و بەشێوەو جۆری رێکخستن و چۆنیەتی داڕشتنی ئاشنان، بەڵام یەکێکیان سورە لەسەر ئەوەی کە بوونی ئەو بینایە بێ بوونی هیچ شارەزایی و زانست و ئیرادەو تواناو هێزو داهێنان و حیکمەتێك دروست بووەو چ کەسێك بەم

شتانە هەڵنەستاوە. بەڵام یەکێکی تریان ژیریی بڕیاری لەسەر ئەوەی پێ ئەدات کە ئەندازیارێکی زاناو داناپەروەر بە کاری ئەنجام دانی ئەم بینایە هەستاوە. ئەم کێشەیە بەوپەڕی سادەیی ئەمە دەگەیەنێت، کاتێك کەسی یەکەم بە شێوەیەکی ژیریی لەو حوکمەی دەری کردووە گفتوگۆ دەکات، دەڵێت: من لە رۆژانی داهاتوودا دەری دەخەم کە چۆن ئەم بینایە بۆ خۆی دروست بووە، لەگەڵ ئەمەشدا ژیریی بە هۆی زرنگییەوە زیاتر بە هاتنی رۆژگار زانیاری بەرفرەترمان پێ ئەدات لەمەڕ کاری بیناکە، کە زیاترو وردتر خاوەنەکەیمان پێ دەناسێنێت، هەرگیز حوکمی زرنگی وەلا ناخرێت.

گەردوونیش هەر بە هەمان شێوەیە، چەندێك زیاتر وەدەرکەوێت ئەوا زیاتر ئەبێتە بەڵگە لەسەر (ﷲ)ی خودا، (دیاردەی حیکمەتو کار لە جێیی)ش کە ئێستا باسی دەکەین باشترین گەواهیدەرە بۆ ئەوەی کە دەیڵێین، مرۆڤی ئاسایی دەبینێت لە گەردووندا چ حیکمەتێك هەیە، ئیدی بەو حیکمەتە پەروەردگاری حەکیمو داناو کار لەجێ دەناسێت، هەرچەندێکیش زانستی فراوان بێت زیاتر زانیاری بەو حیکمەتە بەرفراوانتر دەبێت، هەمیشە زانستیش دەرخەری حیکمەت بووە.

گەورەترین گیروگرفتو ناهەمواری کە تووشی بڕواداران بووە لەم رۆژە ناهەموارەدا ئەوەیە کە بێ باوەڕان بانگەوازی زانست دەکەن کاتێك بێ باوەڕی خۆیان دەردەخەن، کەچی بڕواداران نازانن؛ ئەوەش کە بووە بە هۆی زیاتر پاڵپشتییان لەم گوتەیەدا ئەوەیە کە زۆربەی بڕواداران لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا کەمتر زانستیان بە رووکەشی ژیانی دنیا هەیە وەك لە کەسانی تر، بەڵام ئەو سەردەمەش وا لە سەرهەڵداندایە کە بڕوادار زیاتر زانستی بەرفراوانتر بێ بە رووکەشەکانی ژیانی دنیاو وا خەریکن ئەوە دەسەلمێنن کە زانستی زیاتر ئەبێتە هۆی وەدەست خستنی بڕوای زیاتر..

❋❋❋

لەمەڕ حیکمەتەوە گوتوویانە: دانانی شتەکانە لە شوێنی خۆیاندا، سەبارەت بە گەردوونیش ئەوا بە شێوەیەکی رەها ئەوە دەگەیەنێت کە رێی تێ ناچێت هیچ شتێك

جگە لەم شوێنانەی ئێستایان کە هەن، دابنرێن باشـتر بێـت؟ ئەمـەش واقیعـی گەردوونـە، هەموو شتێك تیایدا بە پێی مەبەستە لـە حیکمـەتو داناپـەروەریی، بۆیـە هـەرگیز ژیریـی ناتوانێ لەمەی ئێستا بەدەر بۆچوونێکی دی لا دروســت بووبـێ، بـە پـێی لێکۆڵینـەوە لـە هەموو شتەکان بە هــەندەکیو هەمەکییـەوە...، ئەوسـا راسـتییەکی راشـکاوی لا دروست دەبێت کە دەڵێ: ئەوەی من ئێستا لەسەریم کرۆکی حیکمەتە، ئەمــەش چـەند نموونەیەکە لەو بارەیەوە:

١- ئەگەر مردن نەبوایە چی رووی دەدا؟.. گوتوویانە گەر دوو مێش زاووزێ بکەنو نەمرن، ئەوا پـاش پێنـج سـاڵ بـە بـەرزایی (٥) سـم چینێـك لـە مێـش دەوری گـۆی زەوی دەدات، ئەمە تەنیا سەبارەت یەك رەگەز لە بوونەوەرەکان، ئەی داخۆ چی رووی دەدا گەر لـە سـەرجەم بەدیهێنراوەکاندا مـردن نەبوایـە! ئـالێرەوە حیکمـەتی نەخۆشـی دەزانـــین، هەروەها حیکمەتی بوونی هۆکاری نەخۆشـییەکانیش دەزانـین وەك میکـرۆبو ڤـایرۆس و هتد، هەروەها یەکێکی تر دەڵێت ئایا ئەگەر ئادەمیزاد بێ نەخۆشی بمردایە باشتر نـەبوو؟ یان تەنیا بە نەخۆشییەك بمرێت، کە هەر کاتێك تووشی بـوو کۆتـایی بـە ژیـانی بێـت؟ لای ئـەو جۆرە کەسـانە حیکمـەتی بوونـی هیـوا لـە ئـارادا نیـە، هـەروەها حیکمـەتی ئاگـــادار کردنەوەو حیکمەتی بیناییو حیکمەتی پەند وەرگرتن بەم واقیعە.

٢- تـەنیا ئـەو پاشـەڕۆکەی لـە مرۆڤـەوە دەردەچێـت گـەر بوونـی بـەکتریاو چـەند هۆکارێکیتر نەبوایە کە دەبێتە هۆی گۆڕینو لەناو بردنــی ئـەو پاشـەڕۆکە، ئـەوا دنیـای پـڕ دەکرد، ئالێرەوە هەسـت بـە حیکمـەتی بوونـی زینـدەوەران دەکـەین کـە مـرۆڤ لای وایـە بوونیان هیچ سوودێکی ئەوتۆی نیە، بۆیە وا هــزر دەکـات کـە بوونیـان بـێ حیکمـەتو بـێ مەبەست بێت، ئەگــەر لـە هــەندێك بوونـەوەردا هیـچ حیکمـەتێك نـەبێت تـەنیا جوانیەکـەی نەبێ! ئەوە بەس بوو،و لە هەندێکی تردا تــەنیا ئـەو حیکمەتـەی تیـا بێـت کـە ترسـێنەرە ئەوە بەس بوو، بوونـــی تـرس لـە گـەورەترین حیکمەتەکانـە، چونکـە مـرۆڤ خۆپاراسـتنو ئاگاداری فێر دەبێت، بەم جۆرەش تواناکانی پەرە پێ ئەدات، گەر لە هــەندێك بوونـەوەردا

تەنیا جێ هێشتنی شوێنەکەی بێت لەگەڵ پێش خۆیو پاش خۆیدا ئەوا مەبەستی هاوکاری بەدی هاتووە، ئەمە بە تەنیا حیکمەتە،و لە هەندێ بەدیهاتووی تردا تەنیا ئەوە هەبێت کە کشگێڕی بەدیهێنەرانی خواو توانایت بۆ دەرکەوێت ئەوە بەسە وەك حیکمەتێك.

٣- هەندێك خەڵك دەڵێن: تەنانەت شەڕیش بێ حیکمەت نیە؟! هەروەها ئازاریش؟! ئایا دادپەروەری لە ستەم باشتر نیە؟ میهرەبانی لە دڵ رەقی باشتر نیە؟ سەرپەرشتیاری لە هەتیو خستن باشتر نیە؟ باوەڕ لە بێ باوەڕیو کوفر چاکتر نیە؟ هەستان بە ئەرکی سەرشان لە پشتگوێ خستن باشتر نیە؟، کەواتە ئەبێ حیکمەت چی بێ لە بوونی ئەم ناتەباییو کەمو کورتییانەو بەرانبەرەکەیاندا؟.

تەنانەت دەگاتە ئەو بارەی هەندێك بپرسن بۆچی خوای گەورە شەڕو خراپەی خولقاندووە؟ هەتا دەڵێن: بوونی شەڕ بەڵگەیە لەسەر نەبوونی خوا، چونکە خوا دەبێت خێرەومەند بێتو تەنیا خێریشی لێ بکەوێتەوە. ئێمەش دەڵێین: پێویستە حەزمان لە زانینی حیکمەت بێت لە هەموو شتێکدا، یاخود بپرسین تا شارەزا بین، یان هەوڵی زانین بدەین، ئەمە شتێکی روونو ئاشکرایە، لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەدا کە کەمو کورتی لە زانینی حیکمەتدا نەبوونی حیکمەت ناگەیەنێ. بەڵام گەر بڵێین: خوایە بۆ وات کرد؟! ئەوا ئەمە باشو گونجاو نیە، تەنیا کەسانی بێ ئاگاو نەزان بە گەورەیی خودا ئەم پرسیارانە دەکەن کە بێ ئاگان لە زانستی خوداو کەم تواناییو سنوور دراوی مرۆڤ دەردەخەن لە بەرانبەر بێ سنووریو کەمالو تەواوییەکانی (ﷲ)ی پەروەردگار. زانایەکیش گەر لە روانگەی زانستەوە بە کارێك هەستێت کەسانی نەزان پێی ناڵێن بۆ وات کرد؟ هەروەك خوای گەورە سەبارەت مرۆڤ دەفەرموێت: ﴿وما أوتيتم من العلم إلا قليلاً﴾ الإسراء/٨٥.

واتە: و لە زانست مەگەر کەمێك نەبێ (لە بابەت رۆحەوە) بە ئێوە نەدراوە.

کەواتە ﴿لا يسأل عما يفعل وهم يسألون﴾ الأنبياء/٢٣.

واتە: لە کارێ کە دەیکا ناپرسرێ (و رەخنەی لێ ناگیردرێ)، و لەکاری ئەوان دەپرسرێو (رەخنە) دەگیردرێ.

بەڵام سەبارەت ئەوەی بڵێین: بوونی شەڕ بەڵگەیە لەسـەر نـەبوونی هیـچ خوایـەك! ئەمە ئەوپەڕی نەفامییە، ئەوپەڕی لەدەسـتدانی هـزرە، ئەوپـەڕی نائاگاییـە بـە یاسـاکانی گەردوون، چونکە بوونی خـوا بەڵگـەکانی لەسـەر بنیـاتنراوە، بـە جۆرێك دەبێتـە شـتێکی ئاشکراو بێ بەڵگە لای هەموو ئەو مرۆڤانەی بەهرەو مەلەکەیان لە کار نەکەوتبێت.

کەواتـە لـە بازنـەی وەڵام دانـەوەی حیکمەتـەکاندا وەڵامـی پرسیارەکانی رابـردوو دەدەینەوە:

زینا کردن خراپەیـە! ئـەی ئایا بەدیهێنانی ئامێرەکانیشـی هـەر خراپەیـە؟ خـوای گەورە بـۆ نـێرو مـێ ئـامێری زاووزێی دروسـت کـردووە، هـەروەها لای پیـاوو ئافرەتـەوە ئارەزووی خولقـاندووە، حیکمەتەکـەش ئاشـکرایە کـە خـوا بۆچـی خولقاندوویـەتی، بـەڵام ئادەمیزاد بۆ خۆی، بەکارهێنانی ئەم ئامێرانەی گواستۆتەوە لە بـارە گونجاوەکەیـەوە کـە لە پێناوی مانەوەی رەگەزدا خولقاوە بۆ باری شپرزەیی زایەند، کەواتـە شـەڕ لـە دروسـت بوونی ئەندامەکاندا نیە، بەڵام شەڕ لەوەدایە کـە مـرۆڤ پـێی هەڵدەسـتێتو سـنوورەکان دەبەزێنێ کە شتەکانی لە پێناو دا بەدیهێنراوە.

هەروەها خواردنەوەی مەی شەڕو خراپەیە، ئەی ئایا ترێ بۆ خراپە بەدی هاتووە؟ ترێ خۆی لە خۆیدا شتێکی خۆشو نایابە، حیکمەتیش لە دروسـت بوونـی ئاشـکرایە، جـا تەنیا مرۆڤە ترێکەی گۆڕیوە لە حاڵەتە گونجـاوە باشـەکەیەوە بـۆ حاڵـەتی پیسـی خـراپ، هەروەها بەکار هێنانی ئاسن لە کاری کوشتندا شتێکی رێ پێ نـەدراوو خراپـە، ئـەی ئایـا ئاسن بۆ خراپە دروست کراوە؟، لە دروست کردنی ئاسـندا چـەندان حیکمـەتی بـێ شـومار هەن، بەڵام بەکار هێنانی مرۆڤ بۆی بە شێوەیەکی هەڵە ئەوە خراپەکەیە.

هەروەها حەسوودی بردن خۆی لـە خۆیـدا ئـاوات خواسـتنە بـە نـەمانی نیعمـەتو بەخششەکانی کەسی حەسوود پێ براو ئەمەش شەڕو خراپەکارییە، ئەی ئایا مەلەکەی کێ بەرکێی نێوان مرۆڤەکان شەڕو خراپەیە؟ لە راستیدا مەلەکەی پێشبڕکێ لە لایەن مرۆڤەوە گەورەترین هۆکارە دەبێتە هۆی گەشە سەندنو ئاوەدانیو چاك سـازی مرۆڤایـەتی، بـەڵام

مرۆڤ خـۆی ئـەم مەلەکەیـەی هەڵگێڕاوەتـەوەو لـە بـاری شـەڕدا خسـتویەتییەوە، کەواتـە شەڕەکە لە دەروونی مرۆڤدایە نەك لە بوونی (مەلەکە)دا، خۆ بەزل زانینیش پێشێل کردنو بچووککردنەوەی خەڵکەو ناهەقی نواندنەو ئەمەش بە شەڕ دادەنرێت، ئەی ئایا هەوڵ دانو داواکردنـی کـەمالو (تـەواوێتی بڵندیـی ڕێ پێـدراو) شــەڕە؟ خــوای گــەورە لــە مرۆڤـدا ئامادەگییەکی خولقاندووە تا کـەمالو تـەواوێتی داوا بکـاتو پلـە بڵنـدی بخوازێـت؛ بـەڵام مرۆڤ بۆ خۆی ئەم ئامادەگییەی هەڵگێڕاوەتەوەو کردویەتی بە خۆ بەزل زانین، ئیدی بەشەڕ کەوتوەتەوە.

کەواتە مـرۆڤ –بـە گۆڕیـنو دەسـتکاری کردنـی هێنانـەدی حیکمـەتی خوایـی لـە شتەکاندا– خێر دەگۆڕێت بۆ شەڕو چاکسازی دەکاتە خراپەکاری.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێـت: ئـەی حیکمـەت چییـە لـەوەی ئـەم ئامادەگییـە زۆرە بۆ مرۆڤ بەدیهاتبێ بۆ خێرو شەڕ؟، وەڵامی ئەمەش بەم جۆرەیە:

أ– تا مرۆڤ سـەرجەم هـێزو تاقەتـەکانی بـەکار بخـاتو هیچیـان نەپووکێنێتـەوە؛ وزەکانی ژیریيو تواناو گیانو هزرو لاشــەی، بـەم جـۆرە کـەمالاتو تـەواوی مـرۆڤ بـەدیار دەکـەوێت بـە مـەرجێ بـەکارهێنانی سـەرجەم وزەکـان بـە ڕێگـە ڕاسـتەکەی خۆیــانبێ لــە دۆزینەوەی هاوتــایی نێـوان سـەرجەم وزەکـاندا، بـەم جـۆرەش فـەزڵو چاکـەو بەخشـینی پەروەردگار لەسەر مرۆڤ دیار دەکەوێت. یاخود بەکات لەدەست دانی هەندێك لە وزەکانو بەکارهێنانی هەندێکیان لەجێگـەی تـردا، نـەك بـە پـێی حیکمـەتی بـەدی هێنانیـان، ئـەوا گـەندەڵی لادان لـە سـوننەتەکانی پـەروەردگارو بەدەرکـەوتنی شــوێنەواری خراپییــەکانی ئاشکرا دەبنو ئالێرەوە مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستە ڕێگا.

ب– بەم پێیە مرۆڤ:پەروەردگار بەو پەڕی تەواوی دەناسێ، چونکە مرۆڤ نازانێت خوداوەند لێی خۆش بووە گەر هەڵە نەکاتو داوای لێخۆشبوون نەکات، ناشزانێت کە خـوا پەشیمانی وەردەگرێت، کـاتێك نـەبێت مـرۆڤ دوای تـاوان پەشـیمان بێتـەوەو دڵنیـا بێـت لەوەی کە خوا لێی وەردەگرێـت، هـەروەها هێزوتوانـای ڕەهـای پـەروەردگار دەرناکـەوێت

لەسەر بەدیهێنانی هەموو خێرو شـەڕو ڕێپیشـاندانو گومڕاییـەك، کـاتێك نـەبێت کـە خـێرو شەڕو ڕێپیشاندانو گومڕایی بوونیان هەبێ، هەروەها بە تەواوییش خودا ناناسـرێت ئەگـەر مرۆڤ بەو جۆرە نەبێت کە هەیـە، بۆیـە حیکمـەتی خوداوەنـد لـە دروسـت کردنـی پـەریو مرۆڤدا بۆ مەبەستی ناساندنی خۆیەتی: ﴿وما خلقـــت الجـــن والإنـــس إلا ليعبـــدون﴾ الذاريات/٥٦.

واتە: و من جنۆکەو ئینسـانم خـەلق نـەکردووە مەگـەر بـۆ ئـەوەی عیبـادەتم بکـەن (لێرەوە تەکامول پەیا بکەنو لە خوا نزیك ببنەوە؟).

مرۆڤ نازانێت خوای گەورە وەڵامدەری پاڕانەوەکانە تا حاڵەتی پەرێشانی نـەبێتو نەپاڕێتەوەو خواش وەڵامی نەداتەوە، هەروەها نازانرێت پەروەردگار رزقو رۆزی بەخشـە، کاتێك نەبێت کە رزقو رۆزی ببینێ دەگاتە هەموو دروستکراوێك، لێرەوە نهێنی زۆر هەواڵو باسمان بۆ دەردەکەوێت کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومانە.

ج- ئەوانەی داواکارن ئەم جیهانەمان یەك پارچە خێرو چاکە بێت، ئەوا بـە هەڵـەدا چوون، چونکە حیکمەت لە بوونی گەردوونو مرۆڤـو ژیانی یەکەمین بریتی بـووە لـە تـاقی کردنەوە، تاقیکردنەوەش نایەتە دی بـە بوونـی خـێرو شـەڕ نـەبێت، مرۆڤـیش کـاتێك لـەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتوو دەبێتو دەردەچێـت؛ کـە وزەیـەکی لـە ویسـتی خـۆی بـەکار هێنا بۆ رزگار بوون لە شەڕو روو کردنە خێرو چاکە ﴿ونبلوكـــم بالشـــر والخـــير فتنـــة﴾ الأنبياء/٣٥.

واتە: و ئێمە بە (گەیاندنی) خراپەو چاکە ئێوە تاقی دەکەینەوە.

﴿الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملاً﴾ الملك/٢.

واتە: کەسێ کە مردنو ژینی خەلق کـرد تـا ئـەزموونتان بکـا کـە کامـە لـە ئێـوە بـە کردەوە چاکترە.

﴿ونفس وما سواها. فألهمها فجورها وتقواها، قد أفلح من زكاها وقد خـــاب مـــن دساها﴾ الشمس/٧-١٠.

واتـە: و بـە نـەفس و ئـەو کەسـەی چـاك و بـە تـەکوز ئـەوی سـازدا جـا چاکـەو خراپەکەیشی، پێ ئیلهام کردووە، بە هەقیقەت هـەر کـەس نەفسـی پـاك کـردەوە رزگـاری دەبێ،و هەر کەس نەفسی خۆی بە گوناه ئالودە کرد، بێ هیواو بێ بەش بوو.

﴿وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عــن الهــوى فــإن الجنـــة هـــي المــأوى﴾ النازعات/٤٠-٤١.

واتە: و بەڵام هەر کەس کە لە گەورەیی پـەروەردگاری ترسـاوەو نەفسـی خـۆی لـە هەواو هەوەس گێڕاوەتەوە بەڕاستی بەهەشت جێیەتی.

جا گەر مـرۆڤ سـەرکەوتوو بـوو لـەتاقی کردنـەوەی ژیـانی دنیـادا ئـەوا شایسـتەی ئەوەیە لە جیهانی چاکەی رەهادا بژی لە ژیانی دوا رۆژدا ﴿لهم دار السلام عنـــد ربهـــم﴾ الأنعام/١٢٧.

واتە: بۆ ئەوانە خانووی ئەمن و ئەمان لای خوایان هەیە.

کەسێکیش دەرنەچێت و بکەوێت لەو تاقی کردنەوەیەدا ئەوە شایسـتەی چوونـە نـاو مەنزڵی وێرانی و خراپەی رەهایە ﴿جهنم يصلونها وبئس القرار﴾ إبراهيم/٢٩.

واتـە: (خـانووی نـابودی هـەمان) جەهەننەمـە (کـە) ئەوانـە دەچنـە نـاوی،و جێگـا مانەوەیەکی خراپە.

بە پاداشت و سزایەکی بە داد بە پێی کردەوەکانیان.

۞۞۞

٤- جا گەر مرۆڤ؛ ژیریی بە شێوەیەکی زانستیانە بخاتە گەڕ، ئەوا لـە بچووکـترین گەردی ئەو بوونەوە تا گەورەترین بەشەکانی گەردوون هەمووی بۆ ئـەو پـڕ لـە حیکمـەت و داناییە، مرۆڤ لەو کاتەدا هیچ شـتێك نابینێتـەوە لـە دنیـادا بـێ بـەش بێـت لـە حیکمـەتی جوانی و نیبانی، ئەو نموونانەش کە لە دیاردەکانی رێپیشـاندان و ئـیرادەو داهێنـاندا لێیـان دواین هەمووی دەشێن وەك نموونەی حیکمەت بیانهێنینەوە لە هەموو دروسـت کراوەکـانی خوادا: ﴿الذي أحسن كل شيء خلقه﴾ السجدة/٧.

واتە: زاتێكە هەرچی بەدیهێناوە بە جوانی خەڵقی كردووە.

﴿صنع الله الذي أتقن كل شيء﴾ النمل/٨٨.

واتە: كاری خوایە كە هەر شتێكی مونەزەمو كاملو پتەو بەدیهێناوە.

ئەمەش چەند نموونەیەكی تری بچووكن كە دەشێن وەك گەواهیدەری دیاردەی حیكمەت لە چوارچێوە گەورەكەیدا باسی بكەینو بەنموونە بیانهێنینەوە:

أ- ئەگەر هەردوو چاوی مرۆڤ لە بەشی سەرەوەی سەری یان خوارەوەی چەناگەیدا یا لە پشتییەوە، یا.... بوایە؟ ئایا ئەوە پەسەندتر بوو؟! یان بوونیان لە شوێنی ئێستایاندا؟ ئایا هیچ ئەندامێك لە لاشەی مرۆڤ بێجگە لەم جێگایانەی ئێستایان لە چ جێگەیەكی تردا بوونایە پەسەند ئەبوون؟ هەچ مرۆڤێ رێز بۆ ژیریی دابنێ ناتوانێ بڵێ: بەڵێ دەبوو..

بچووكترین نموونەش بۆ روونكردنەوەی شوێنی حیكمەت لە بەشەكانی لەشی ئادەمیزاددا دەستی مرۆڤە، زۆر ئەستەمو گرانە؛ ئەگەر نەڵێین مەحاڵە! كە ئامێرێك بدۆزرێتەوە جێی دەستی مرۆڤ بگرێتەوە لە سادەییو تواناو تیژی لە گونجاندا، بۆ نموونە كاتێك دەتەوێت پەرتووكێك بخوێنیتەوە بە دەستت ئەم دیوو ئەودیوی دەكەیت، پاشان لە شوێنی گونجاودا بۆ خوێندنەوە دایدەنێیتو رای دەگری، ئەم دەستە؛ خۆی جێی خۆی راست دەكاتەوە، كاتێك لاپەڕەكانی هەڵدەدەیتەوە ئەوا پەنجەت دەخەیتە ژێر كاغەزەكەوەو پاڵەپەستۆی دەخەیتە سەر بە جۆرێك بتوانی هەڵیگێڕیتەوە، پاشان پاڵەپەستۆكە نامێنێت بە هەڵدانەوەی لاپەڕە، هەروەها دەست پێنووس دەگرێتو پێی دەنووسێت، هەروەها ئامێریش بەكا دێنێت، مرۆڤ پێی دەخوات، پەنجەرەی پێ دەكاتەوە، شتێك بیەوێ پێی هەڵدەگرێت، هەروەها دەست لە شت ئەداتو هەستیان پێ ئەكاتو شتی پێ دەگرێت، هەروەها بەكاری دێنێت بۆ هەست كردن بە جوانیو گواستنەوەی هەستەكانی بۆ دڵی، هەروەها نینۆكەكان پەنجەكان دەپارێزن چونكە زیاتر بەر كاریگەریو لێدان دەكەونو بەهۆی نینۆكیشەوە دەتوانی پێستت بخورێنیو شتی پێ

بگریت، لە کۆتاییدا: نینۆکەکان تـەرازووی تەندروسـتی مرۆڤـن، هـەچ کـارێك مـرۆڤ پـێ‌ی هەڵدەسـتێت،گـەورەترین یارمـەتی دەری جوڵـەی پەنجـەکانی دەسـتییەتی، ئەگـەر نەجووڵاوبوونایە -بۆ نموونە- وەك نینۆکەکانی مەیمون؛ ئەوا نەیدەتوانی زۆر لەو کارانەی ئێستا پێ‌ی هەڵدەستی بیکردبا.

ب- لێوی سەرەوەی وشتر قلێشـاوو درزاوییـە تـا یارمـەتی بـدات لەسـەر خواردنـی رووەکی دڕکاوی بیابان، پێکانیشی لەگەڵ لمدا گونجاوەو تێیـدا رۆنـاچێت؛ بـە پێچەوانـەی ئەوەی کە (سم)ی ببوایە یان پێکانی بچووك بونایە، برژانگە درێژەکانیشی وەك تۆڕ وایـەو چاوەکـانی لـە گـەردی لم دەپـارێزن، گردۆڵکـەکانی سـەر پشتیشـی بـۆ ماوەیـەکی درێـژ خواردنی تیا هەڵدەگرێت‌و لە کاتی نەبوونی خۆراکدا سوودیان لێ دەبینێ.

ج- بەهەڵم بوون‌و ئاودەردان لە رووەکـدا بریتییـە لـە بەهـەڵم بوونـی ئـاو بـە هـۆی گەڵاکانیەوە، ئەمەش یارمەتی هەڵمژینی شلەمەنیەکان ئەدات کە بە هۆی رەگەوە لـە خـاك وەری ئەگرێت، ئاوا کرداری بە هەڵم بوون دروست دەبێت بـە هـۆی ئـەو چاڵ‌و کەلێنانـەی لەسەر گەڵاکان هەیە، ئەم کەلێنانەش لە رووەکێکەوە بۆ رووەکێکی تر جیـاوازە بـە پـێ‌ی جیاوازی ژینگەکەیان. بۆیە کەلێنی رووەکـە بیابانیـەکان کـەمترە لـە رووەکـی باخچـە، بـە جۆرێك کە بە هەڵم بوون لە یەکەمدا کەمترە لە چاو دووەمدا.

د- باڵندە بە پێ‌ی قەبارەکەی لە هـەموو گیانـەوەرێکی تـر سـووکترە، لـە ئاکـامی پشکنینی لەشییەوە دەرکەوتووە کە ئێسکی باڵندە ناسك‌و شك‌و بۆشە، تا یارمەتی بدات لەسەر سووکی لەشی‌و بەمەش کاری فرینی بۆ ئاسان بێت.

هـ- لە کیشوەری بەستەڵەکی باشـوور جـۆرە باڵندەیـەك هەیـە نـاوی (البـانجو)یـە، مێیینـەی ئـەم باڵندەیـە هێلکـەکانیان لـە زسـتانێکی تـاریکدا دادەنێـن -لـەکاتێکدا بـەفر زەمین‌و ئاسمان ئەتەنێت- لە گیرفانێکی سەهۆڵبەندیدا لـە بەشـی سـەرەوەی قاچـەکانی، بێچووەکان هەتا بە هێز دەبن‌و توانای خۆ ژیاندنیان دەبێ هەر لەو جێیەدا دەمێننەوە.

و- لە هەر لایەكی ماسیدا هێڵێكی درێژكۆلە هەیەو لە پشكنینی ئەو هێڵانەدا بە ئامێری ورد بین دەركەوتووە كە ئەمانە ئەندامی زۆر وردی هەستەوەرن بەڕادەیەكی زۆر گەورە، كاتێك ماسی لە بەربەستێك یا لە بەردێك نزیك دەبێتەوە ئەوا ئەم ئەندامانە هەست بە پاڵەپەستۆی ئاو دەكەن لە ئاكامی بەركەوتنی بە هەر بەربەرستێك، هەرچەندە شەپۆلەكانی ئاوەكەش كەم بن. بەم جۆرە خۆی لە لێدانو بەركەوتن دەپارێزێو ڕێگاكەی دەگۆڕێت.

ز- شەمشەمەكوێرە لە شەودا ئەفڕێ. بەجۆرێك هیچ ڕووناكییەك كار لە لاوازی چاوەكانی ناكات، لەگەڵ ئەمەشدا شەمشەمەكوێرە خۆی لە هیچ بەربەستێك نادات هەرچەندە زۆر بن. دەریشكەوتووە كە شەمشەمەكوێرە لە كاتی فڕیندا بروسكەو جۆرە دەنگێكی تایبەت دەردەكاتو ئەگەر بەر هەر تەنێك بكەوێت ئەوا دەنگەكەی بۆی دەگەڕێتەوەو ئیدی هەستی پێ دەكات بێ ئەوەی ببینن، ئالەمەدا وەك ڕادار وایە.

ئەم نموونانە وێنەیەكی ساكارمان پێ ئەدەن لە بوونی حیكمەت لە هەموو شتێكدا، مرۆڤیش هەرچەندە زانستی پتر بێت ئەوەندە درك بە دیاردەی حیكمەت ئەكات وەك لەمەو پێش گوتمان، بەڵام دڵانی داخراوو كوێر، گوێی كەڕ، ژیریی پەك كەوتوو، ئەمانە دەستەوسان ئەمێننەوەو هیچ وانەو نیشانەیەك لە پەروەردگار وەرناگرن ﴿وكأين من آيةٍ في السموات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون﴾ يوسف/١٠٥.

واتە: و چەند زۆرن نیشانەكانی (خوا) لە ئاسمانەكانو زەویدا كە ئەوانە بەلایدا ئەڕۆنو ڕووی لێ وەردەگێڕن !.

﴿وقالوا لو كنا نسمع أو نعقل ما كنا في أصحاب السعير﴾ الملك/١٠.

واتە: و دەڵێن: ئەگەر گوێمان دابانێ، یا ئەقڵمان بخستبایەكار،لە ڕیزی دۆژەهیان نەدەبووین.

بێگومان گەر كەسێك دروست كردنی ڕادار بداتە پاڵ كەسێكی شێتی كەڕی كوێری لاڵ، ئایا گومانت نابێ لە ژیریی ئەو كەسە؟ بێگومان بە شێتیشی دائەنێیت!. ئەی ئایا ئەو

کەسـەی کـە دەرکردنـی دەنگـی شەمشـەمەکوێرە بـۆ مـاددەی کـەڕو لاڵو کوێـرو مـردوو دەگێڕێتەوە لەو کەسە بە شێت تری نازانیت؟.

﴿إن الذين يلحدون في آياتنا لا يخفون علينا أفمن يلقى في النار خير أم من يأتي آمنـــا يوم القيامة اعملوا ما شئتم إنه بما تعملون بصير﴾ فصلت/٤٠.

واتە: بەڕاستی کەسانێ کە نیشانەکانی ئێمە دەگۆڕن لـە ئێمـە شـاردراوە نـین، جا ئایا کەسێ کە دەخرێتە نێو ئاگر باشترە یان کەسێ کە لە ڕۆژی بەرێدا لە ئەمنو ئـەماندا هەرچی دەتانەوێ بیکەن، بەڕاستی ئەو بەوەی دەیکەن بیینایە.

۞۞۞

لەم گەردوونەدا ملیۆنەها شایەتو گەواهی دەر هەن لەسەر دیاردەی حیکمەت، هەر لە گەردو خانەوە تا کۆبوونەوەی گەردەکانو خانەکان، هەروەها لـەناو هـەموو جۆرێك لـە جۆرەکـانی دروسـتکراوەکانو هـەموو بەشـێك لـە بەشـەکانیاندا، لـە کۆبوونـەوەی هـــەموو ئەمانـەدا،و هـەر شـایەتێك لـەم ملیـار حیکمەتانـە، ئەگـەر مـرۆڤ بـۆ (نـــەبوون –عـدم)ی بگێڕێتەوە ئەوا شێتە، ئەو کەسانە چـەند بـێ هۆشـن؟ ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە بـڕوا بـە پەروەردگاری کار بەجێ ناکـەن! چـەند ئەوانـە نـەزانو کەللـە پووچـن؟ کـە بـڕواداران بـە بەدیهێنەری حیکمەتەکان بە شێت لە قەڵەم ئەدەن!.

﴿ن والقلم وما يسطرون، ما أنت بنعمة ربك بمجنون، وإن لك لأجرا غير ممنـــون، وإنك لعلى خلق عظيم، فستبصر ويبصرون، بأيكم المفتون، إن ربك هو أعلم بمن ضل عـــن سبيله وهو أعلم بالمهتدين، فلا تطع المكذبين﴾ القلم/١-٨.

واتـە: نـون، سـوێند بـە قەڵـەمو ئـەوەی دەنووسـن، بـە بەرەکـەتی نیعمـەتی پەروەردگارت تۆ شێت نیت، و بەڕاستی بۆ تۆیە پاداشی گەورەو بێ بڕانـەوە، و بەڕاسـتی تۆ خو و خوڵقی گەورەو شیاوت هەیە، جا لە دواییدا تـۆ دەبیـنیو ئـەوانیش دەبیـنن، کـە کام یەك لە ئێوە شێتە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ باشتر ئەزانێ چ کەسێ لـە ڕێگـای خـوا لایداوە،و هەر ئەویشە زاناتر بە ڕێنوێن بووان، جا لە بە درۆخەرەوان ئیتاعەت مەکە.

# دیاردەی هەشتەم

## دیاردەی گرنگی پێدان (العنایة)

١- هەموو نیعمەتێك، نیعمەت بەخشێكی لە پشتەوەیە، وەسف كردنی دەرمان بۆ نەخۆشێك نیعمەتێكەو لە پشتییەوە پزیشكێك هەیە، دابین كردنی خۆراك بۆ برسی نیعمەتەو لە پشتییەوە خۆراكدەرێك هەیە، سەرپەرشتی كردنی منداڵ تا گەورە دەبێ نیعمەتو بەخششەو لە پشتییەوە دایكو باوكی هەن، بوونی ماڵێك بە هەموو پێداویستییەكانی خۆشگوزەرانییەوە نیعمەتەو لە پشتییەوە كەسانێك هەن كاریان تێدا كردووە. هەر بەم جۆرە هەموو پێ بەخشراوە دروستكراوەكانی مرۆڤ، راستەوخۆ كەسانی لە پشتەوەن كە بەخشەرو گرنگی پێ دەر بوون.

ئەی ئایا ئەو هەموو بەخشینەی لە دروست كردنی دەستی مرۆڤ نین‌و بە مرۆڤ خەڵات كراون، ئایا لە پشتییانەوە دەستێك نیە؟ ئەم وتەیە ئەو پەڕی پوچەڵ كردنەوەی كاری ژیریی مرۆڤە!.

كاتێك كە ئەم دیاردەیە، دیاردەی گرنگی پێ دان‌و نیعمەتەكانی مرۆڤ گەورەترین دیاردەیە قورئان لێی دواوە، دەرخستنی فەزڵ‌و بەخشین‌و میهرەبانی پەروەردگار

دەگەیەنێت، بەم جۆرەش کەسانی هۆشمەند سوپاسـگوزاری دەنوێنـن بـۆ (ﷲ)ی مـەزنی دلۆڤان، یاخود ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەر مـرۆڤ لـە بـێ بـاوەڕیو ستەمو نکۆڵیکردنیـدا، بۆیە شایستەی هەموو سزایەك دەبێت، بۆیە ئێمەش هەڵوێستەیەك دەکەین لەمەڕ دیاردەی بەخششی پەروەردگار بۆ ئـادەمیزاد لـە قورئـانی پـیرۆزدا، هـەروەها تەماشـا کردنـی ئـەم گرنگی پێدانە وەك بەڵگەیەك لەسەر بەدیهێنەری گەورەو بە دەسەڵات.

٢- پەروەردگار دەفەرموێت ﴿وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها إن الله لغفور رحيـــم﴾ النحل/١٨.

واتە: و ئەگەر نیعمەتی خوا بژێرن، بۆتان نابژێدرێ، دیارە خودا غەفورو رەحیمە.

﴿وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها إن الإنسان لظلوم كفـــار﴾ إبراهيم/٣٤.

واتە: و ئەگەر نیعمەتی خوا بژمێرن، ئەوانە لەئەژمار نایەن.

ئەگەر تێبیـنی ئـەم دوو ئایەتـەی رابـردوو بکـەین ئـەوا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە یەکێکیان بە ﴿إن الله لغفور رحيم﴾ دوایـی هـاتووە، و ئـەوی تریشیـان مـرۆڤ بـە جۆرێـك وەسف دەکات کە﴿إن الإنسان لظلوم كفـــار﴾، جـا لـەم دوو ئایەتـەو دوماهییـاندا چـەند مانایەکمان بۆ ئاشکرا دەبێ:

أ- ئەو نیعمەتە فراوانانەی کە نایەنە هەژماردن هەرگیز بە کاری رێکەوت دانانرێت، بەڵکو لە بەدیهێنانی (ﷲ)ی پەروەردگارە، هەروەها (لێخۆشبوونو میـهرەبانیی) ئـەو دوو سیفەتەن کە بە فریای مرۆڤی باوەڕدار دێن، ئەگەر بە شێوەیەکی تەواوو بە تێگەیشتنێکی پێویستیش مرۆڤی بروادار بە کاری سوپاسگوزاری هەڵنەستێت.

ب- نەفامی مرۆڤ کە دەبێتە هۆی بێ باوەڕیی، و خۆ بەزلزانینی کە ستەمکاری لێ دەکەوێتەوە، ئەمانە وا لە مرۆڤ دەکەن کە هۆشی لە ئاست نیعمەتەکانی پەروەردگار بـێ بـەش بێـت، ئەمـەش وای لێ دەکـا بـە دڵسۆزیو یـەکلابووەوەیی نیعمەتـەکان نەداتـە پـاڵ پەروەردگار، بەڵکو ئەیداتە پاڵ چ شتێکیتر، هەرچەندە هیچو پووچیش بن ﴿وإذا ذكر الله

وحده اشمأزت قلوب الذين لا يؤمنون بالآخرة وإذا ذكر الذين من دونه إذا هم يستبشرون﴾ الزمر/٤٥.

واتە: و هەر کاتێ خـودا بـە تاقانـە بـوون یـاد دەکرێ دڵو دەروونـی کەسـانێ کـە بڕوایان بە ئاخیرەت نیە دەگیردرێ، بەڵام کاتێ کە مەعبودەکانی تر یاد دەکرێ ئـەو کاتـە شاد دەبن.

٣- خوای گەورە ماهییەتی عینایەتی خۆیو نیعمەتەکانی بۆ مرۆڤ لە ئایەتـەکانی قورئاندا کۆ کردۆتەوە، لەوانە:

﴿هو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعا﴾ البقرة/٢٩.

واتە: هەر ئەو خوایەشە کە ئەوەی لە زەوی دایە بۆ ئێوەی بەدیهێناوە.

﴿ألم تروا أن الله سخر لكم ما في السماوات وما في الأرض وأسبغ عليكم نعمه ظاهره وباطنه﴾ لقمان/٢٠.

واتە: ئایا نەتاندیوە کە بەڕاستی خـودا ئـەوەی لـە ئاسمانـەکانو ئـەوەی لـە زەوی دایە بۆ ئێوەی رامو دەستەمۆ کردووەو نیعمەتـەکانی خـۆی چ زاهـیریو باتنی بـۆ ئێـوەی زیاد کردووەو پێی داون.

﴿وسخر لكم ما في السماوات وما في الأرض جميعا منه﴾ الجاثية/١٣.

واتـە: خـودا ئـەوەی لـــــــــــــــــــــــــــە ئاسمانـەکانو زەوی دایـــە هەمووی لە لایەن خۆیەوە رامی ئێوەی کردووە.

لەم کۆکارییە خێرایەدا چەند شتێکمان بۆ دەرئەکەوێت:

أ- یەکەم شێوەو نیعمەتـەکانی پـەروەردگار لەسـەر مـرۆڤ:بەدیـهێنانی مرۆڤـە بـۆ سروشتو خولقێتی بەم جۆرەی هەیە کە زۆر واتای ناوەخنو ئاشکرایی لە خۆ گرتووە.

ب- دووەم روو ئەوەیـــە کـــە زەویو ئاسمانـــەکانو چـــی لـــە ناویاندایـــە رامو گەردمنکەچی مرۆڤن.

جـ- ئەم نیعمەتـە بەرفراوانانـە بۆ مـرۆڤ بـە هــەردوو بەشــەکەیەوە لــە لایــەن خوداوەندی گەورەوەیــە: "وأسبغ" "جمیعاً منـه" نایەتـە دی تـەنیا بـەم جـۆرە نـەبێت، چونکە گونجانی گەردوون بۆ مرۆڤ و رێ تێچوونی رام بوونی، تەنیا بە هۆی هێزو بوویەکی رامکارەوە دەبێ.

٤- دوای ئەم درێژە دانە دێینە سەر باس کردنی هەندێك لەو روانەی نیعمەتــەکانی پەروەردگار کە بە مرۆڤی بەخشیون و لە قورئاندا هاتوون..

أ- ﴿ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلنــاهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا﴾ الإسراء/٧٠.

واتە: و بە حەقیقەت ئێمە رێزمان لە بەنی ئادەم گرت (ئەقڵمان پێدا)و ئەوانمان لە بەژو زەریا هەڵــگرت (بە سواریو گێڕامان)و رزقو رۆزیی پاکمان پێدان، و فەزیلــەتمان دان بەسەر زۆرێ لە ئافەریدەکانم.

﴿الرحمن. علم القرآن. خلق الإنسان. علمه البيان﴾ الرحمن/١-٤.

واتە: (خودای دەهەندە) بەخشــەر، قورئـانی فـێر کـرد، مرۆڤـی خـەلق کـرد، زمـانو قسەی بەو فێر کرد.

﴿لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم﴾ التين/٤.

واتە: بێ شـك ئێمـە مرۆڤمـان بـە باشـترین شـێوە خولقـاندووە. پێغەمبـەریش ﷺ دەفەرموێ ((إن الله خلق آدم على صورته)): پەروەردگار ئادەمی لەسەر شێوەی خــۆی دروسـت کـردووە. واتـە لەسـەر سـیفاتی خـۆی (بـەڕای هــەندێك لـە زانایـان)، بـۆ نموونــە پــەروەردگار خـاوەن ئیرادەیـەو مرۆڤـیش ئـیرادەی هەیـە، پـەروەردگار زانایــەو مرۆڤــیش سیفەتی زانستی هەیە، پەروەردگار زیندووەو مرۆڤیش ئەم سیفەتەی تیایـە، پـەروەردگار بیسەرەو مرۆڤیش سیفەتی بیستنی هەیە، پەروەردگار بیینایەو مرۆڤیش سیفەتی بینیـنی هەیە، پەوەردگار قسە دەکـاتو مرۆڤـیش سـیفەتی قسـە کردنـی هەیـە، خـوا بـە نیـانو ئارامەو مرۆڤیش سیفەتی نیبانیو ئارامی هەیە، خوا میهرەبانـەو مرۆڤـیش ئـەم سـیفەتەی

هەیەو...... لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەدا کە هیچ شتێك بە (اللّٰه) ناچێت، لە بوونو سیفەتو ناوو کردارەکانیشیدا.

ئەو نیعمەتو بەخشینانەی پەروەردگار لە پێکهاتنو ئاکاردا کە بە مرۆڤی بەخشیوە (بە ئاشکراو پەنهانەکانەوە) نەیبەخشیوە بە هیچ لە بەدیهاتووەکانی تری.

﴿وأسبغ عليكم نعمه ظاهرة وباطنة﴾ لقمان/٢٠.

واتە: و نیعمەتەکانی خۆی چ زاهیری‌و باتینی بۆ ئێوەی زیاد کردووەو پێی داون.

تەنیا نیعمەتی ژیریی بۆ مرۆڤ بەس بوو، بە هۆی ئەم بەخشینەوە مرۆڤ توانیویەتی چی لە گەردوونا هەیە بیانخاتە ژێر بارەوەو گەردنکەچی خۆیانی بکات.

ب- پاشان پەروەردگار بەخششە گەردوونیەکانی بۆ مرۆڤ دەژمێرێت، لەم بارەشەوە ئایەت زۆر هەن! ئەوەندە بەسە کە بڵێین یەك سورەتی دوورو درێژ زیاتر لەم بارەوە ئەدوێت، ئەویش سورەتی (الأنعام)ە. هەروەها سورەتی (النمل)یش، دەبا پێکەوە چاوێك بە چەند ئایەتێکی هەڵبژاردەی قورئاندا بخشێنین ﴿هو الذي جعل الشمس ضيـــاء والقمر نورا وقدره منازل لتعلموا عدد السنين والحساب﴾ يونس/٥.

واتە: ئەو کەسێکە رۆژی رووناك‌و مانگی نورانی کردووەو بۆ ئەو مەنزڵگەی دیار کردووە تا ژمارەی ساڵ‌و حیسابی (کارەکانتان) بزانن.

﴿وهو الذي جعل لكم النجوم لتهتدوا بها في ظلمات البر والبحر﴾ الأنعام/٩٧.

واتە: و هەر ئەوە کە ئەستێرەکانی ئاسمانی بۆ ئێوە داناوە تا لە تاریکیی بەژ (وشکانیی)و زەریا بە هۆی ئەوانەوە رێنوێن بن‌و رێگا بدۆزنەوە بۆ رزگار بوون.

تاکە رێگەیەك بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لە تاریکایی وشکانی‌و دەریاکاندا رێگەی پێ بدۆزێتەوە ئەستێرەکانە، لە پێشتردا ئەم مەسەلەیە زۆر دیارترو ئاشکراتر بوو، وەك لە ئێستادا بە هۆی زۆری سوود وەرگرتنی مرۆڤ لە ئەستێرەکانەوە؛ بەڵام ئێستاو هەتا هەتاشە رێنمونی مرۆڤ بەهۆی ئەستێرەکان شتێکی بنەڕەتی‌و چەسپاوە، کە رێبواری بیابان بە هۆیەوە رێ دەدۆزێتەوەو سەرباز لە کاتی هێرش بردن‌و پاشەکشەدا کەڵکی لێ

وەردەگرێت، مرۆڤ لـە هـەر جێگەیـەکدا بێـت دەتوانێـت لێی بەهرەمـەند ببێـت، تەنانـەت کەشـتی لـە دەریـادا کـاتێك سـوود لـە قیبلـە نمـا "البوصلـة" و هێڵـەکانی پـانیو درێـژی وەردەگرێت –تەنانەت لەم کاتانەشدا هەر پشت بە ئەستێرەکان دەبەستێت–، چونکە گەر ئەسـتێرەی "القطـب" نەبوایـە نەئـەتوانرا هێڵـەکانی پـانیو درێـژی بناسـرێتەوە، گـەر ئەسـتێرەکانی تریش نەبوونایـە ئـەوا ئەسـتێرەی "القطـب" نەئەناسـرایەوە، جـا ئەگـەر ئەستێرەکانی ئاسمان نەبوونایە مـرۆڤ چـەند سـەری لێدەشـێواو لـە جوڵـە سسـتو گۆج دەبوو وسنوری بازنەی کاری تەسك دەبۆوە !!.

– ﴿وألقى في الأرض رواسي أن تميد بكم وأنهارا وسبلا لعلكم تهتدون، وعلامـــات وبالنجم هم يهتدون﴾ النحل/١٥–١٦.

واتە: و لە زەویدا کێوگەلی پتەوی دانا تا ئێوە نـەهاژێنێو ئـارامیش بـە ئێـوە بـداو رووبارو چۆمی (بەدیهێناوە)، رێگا گـەلی سـازدا تـا بـەڵکو هیدایـەت بدرێـن ورێنوێـن بـن،و (هەروا) نیشانە گەلێکی داناو (بەشەودا) ئەوانە بەهۆی ئەستێرەکانەوە هیدایەت ئەبن.

– ﴿الله الذي خلق السماوات والأرض وأنزل من السماء ماء فأخرج به من الثمرات رزقا لكم وسخر لكم الفلك لتجري في البحر بأمره وسخر لكم الأنهار، وسخر لكم الشمس والقمر دائبين وسخر لكم الليل والنهار، وآتاكم من كل ما سألتموه وإن تعدوا نعمـــة الله لا تحصوها إن الإنسان لظلوم كفار﴾ إبراهيم /٣٢–٣٤.

واتـە: خـوا زاتێکـە ئاسمانـەکانو زەوی سـازداوەو لـە ئاسمانـەوە ئـاوی (بـاران)ی بـاراندووە، جـا بـەو (بـاران)ە میـوەی (جیاجیـای) دەرهێنـاوەو کردوویەتـە رزقو رۆزیـی ئێوە،و گەمی بۆ ئێوە داناوە تا لەسەر دەریـا بـە فـەرمانی ئـەو بـرواو زەریاکانیشـی بـۆ ئێـوە رامو موسـەخخەر کـردووە،و رۆژو مـانگی بـۆ ئێـوە رام کـردووە، لـە حـاڵێکدا کـە بەردەوام لە کاردانو شەو رۆژیشی موسەخخەری ئێوە کردووە،و لە هەر شتێك کە داواتـان لێکردووە بە ئێوەی داوە،و ئەگەر نیعمەتی خوا بژمێرن، ئەوانە لە ئەژمار نایەن، بەڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکارو زۆر ناسپاسو کوفرکەرە.

- ﴿أولم يرى الذين كفروا أن السماوات والأرض كانتا رتقا ففتقناهما وجعلنا من الماء كل شيء حي أفلا يؤمنون، وجعلنا في الأرض رواسي أن تميد بهم وجعلنا فيها فجاجا سبلا لعلهم يهتدون، وجعلنا السماء سقفا محفوظا وهم عن آياتها معرضون، وهو الذي خلق الليل والنهار والشمس والقمر كل في فلك يسبحون﴾ الأنبياء/٣٠-٣٣.

واتە: ئایا ئەوانەی وا کافر بوون، نەیاندی کە ئاسمانەکانو زەوی پێکەوە لکابوون، جا ئێمە ئەوانمان لە یەکتر جیا کردەوە؟و هەر شتێکی زیندوومان لە ئاو گرواند، جا ئایا (ئێستاش) بڕوا ناهێنن،و لە زەویدا کێـوگەلی مەحکەمو پتەومان دانا تا بەوان ئۆقرە بگرێ (و نەلەرزێ)،و لەو (زەوی)دا دۆڵو دەرەو ڕێگا گەلمان سازدان تا هیدایەت بنو ئاسمان (هەوای زەوی) مان کردە میچێکی پارێزەرو پتەو بەلام ئەوان روو سوڕێنەر بوون لە نیشانەکانی ئێمەو ئەو (خودا) کەسێکە کە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی خەلق کردووە کە هەر یەکە لەوان لە مەدارێکدا لە دەوری خۆیان دەخولێنەوە.

- ﴿خلق الإنسان من نطفة فإذا هو خصيم مبين، والأنعام خلقها لكم فيها دفء ومنافع ومنها تأكلون، ولكم فيها جمال حين تريحون وحين تسرحون، وتحمل أثقالكم إلى بلد لم تكونوا بالغيه إلا بشق الأنفس إن ربكم لرءوف رحيم، والخيل والبغال والحمير لتركبوها وزينة ويخلق ما لا تعلمون، وعلى الله قصد السبيل ومنها جائر ولو شاء لهداكم أجمعين، هو الذي أنزل من السماء ماء لكم منه شراب ومنه شجر فيه تسيمون، ينبت لكم به الزرع والزيتون والنخيل والأعناب ومن كل الثمرات إن في ذلك لآية لقوم يتفكرون، وسخر لكم الليل والنهار والشمس والقمر والنجوم مسخرات بأمره إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون، وما ذرأ لكم في الأرض مختلفا ألوانه إن في ذلك لآية لقوم يذكرون، وهو الذي سخر البحر لتأكلوا منه لحما طريا وتستخرجوا منه حلية تلبسونها وترى الفلك مواخر فيه ولتبتغوا من فضله ولعلكم تشكرون، وألقى في الأرض رواسي أن تميد بكم وأنهارا وسبلا لعلكم تهتدون،

وعلامات وبالنجم هم يهتدون، أفمن يخلق كمن لا يخلق أفلا تذكرون، وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها إن الله لغفور رحيم﴾ النحل/٤-١٨.

واتە: مرۆڤی لە نوتفە (ئاوی کەم یان ئاوی ساف)ی بێ بایەخ بەدیهێنا، جا لە ناکاو بووە دوژمنێکی ئاشکراو بزن‌و مەڕو گاو وشتری بەدیهێنا، لە حـاڵێکدا بـۆ ئێـوە لـە وانـەدا جلك هۆی پۆشش‌و سوودی تر هەیەو لە گۆشتی ئەوانە دەخۆن‌و لەوانەدا بۆ ئێوە زینـەت‌و شکۆ هەیە، لە کاتێکدا کە دەیانگێڕنەوە بۆ جێی حەوانەوەیان،و کاتێ کـە (بەرەبـەیانان) دەیانبەنە دەرو دەشت‌و ئەوانە باری قورسی ئێوە بۆ شاری هەڵدەگرن کە بـە رەنجـێ زۆر نەبێ ناگەنە ئەوێ، بەڕاستی پەروەردگارتان رەئوف‌و دڵاوایەو (هەروەها) ئەسپ‌و هێسترو کەری بەدیهێنا تا سواریان بن‌و هۆی زینەت بن بۆ ئێوە،و شتی دیکەش (هـۆی هـاتووچۆی تر (بەدیدێنێ کە ئێوە نازانن!،و لەسەر خوایە کە رێی راست بە بەندەکانی نیشان بـدات، بەڵام هەندێ لە رێگاکان لا رێن،و ئەگەر خودا بیەوێ هەمووتان (بەزۆر) رێنوێنی‌و هیدایەت دەکات، ئەو کەسێکە لە ئاسمانەوە ئاوێکی نارد کە خواردنەوەتان لەو ئاوەیەو هـۆی شـین بوونی گژوگیایە کە ئاژەڵی خۆتانی لێدەوەڕێنن، خودا بە هـۆی ئـەو (بارانـەوە) زەرحـات‌و زەیتوون‌و خورماو ترێ‌و هەر جۆرە میوەیەك دەڕوێنێ،و لەو هەرجۆرە میوەیەك، بەڕاستی لەمەدا نیشانەیەکی روون هەیە بۆ هۆزێ کە بیر دەکەنەوەو خوا شـەوو رۆژو خـۆرو مـانگی بۆئێوە رام کردو و هەروەها ئەستێرەکانیش بە فەرمانی ئەو رامی ئێوەن، بەڕاستی لەمەدا نیشـانە گـەلێك هەیـە (لـە گـەورەیی خـودا) بـۆ تاقمـێ کـە ئـەقڵی خۆیـان دەخەنـە کـارو (سەرەڕای ئەوە) بوونەوەرانێك کە لە زەویدا بەدیهاتوون رامی (فـەرمانی ئێـوەی)کـرد، لـە حاڵێکدا کە رەنگیان جۆراوجۆرە، بەڕاستی لەمەدا نیشانەیەکی روون هەیـە بـۆ تاقمـێ کـە بیر دەکەنەوەو ئامۆژگاریی وەردەگرن‌و هەر ئەویشە کە زەریای رامی (ئێوە) کرد تـا لـەوە گۆشتی تازە بخۆن‌و شتی زینەتی بۆ لەبەرکردن‌و (کـەڵك وەرگرتـن) لـەوە بهێننـە دەرێ،و کەشتییەکان دەبینی کە ئاوی دەریا لەت دەکەن تا ئێوە(خەریکی بازرگانی بن)و لە فەزڵی خوا کەڵك وەربگرن، بەڵکو شوکری نیعمەتەکانی بکەن‌و لە زەویدا کێوگەلی پتەوی دانا تـا

ئێوە نەهەژێنێ و ئارامیش بە ئێوە بداو رووبارو چۆمی (بەدیهێناوە)، رێگا گەلی سازدا تا بەڵکو هیدایەت بدرێن و رێنوێن بن و (هەروا) نیشانە گەلێکی داناو (بەشەودا) ئەوانە بە هۆی ئەستێرەکانەوە هیدایەت ئەبن جا ئایا کەسێ کە بەدیدێنێ وەکو کەسێ وایە کە بەدیناهێنێ؟ جا ئایا بیر ناکەنەوە،و ئەگەر نیعمەتی خودا بژمێرن بۆتان نابژێردرێ، دیارە خودا غەفورو رەحیمە.

- ﴿أولم يروا إلى ما خلق الله من شيء يتفيأ ظلاله عن اليمين والشمائل سجدا لله وهم داخرون﴾ النحل/٤٨.

واتە: ئایا ئەوانە بەدیهاتوانی خودایان نەدی کە چلۆن سێبەرەکانیان لە راستەو چەپەوە دەجولێن و بە خۆ شکاندنەوە سوژدە بۆ خودا دەبەن.

- ﴿والله أنزل من السماء ماء فأحيا به الأرض بعد موتها إن في ذلك لآية لقوم يسمعون، وإن لكم في الأنعام لعبرة نسقيكم مما في بطونه من بين فرث ودم لبنا خالصا سائغا للشاربين، ومن ثمرات النخيل والأعناب تتخذون منه سكرا ورزقا حسنا إن في ذلك لآية لقوم يعقلون، وأوحى ربك إلى النحل أن اتخذي من الجبال بيوتا ومن الشجر ومما يعرشون، ثم كلي من كل الثمرات فاسلكي سبل ربك ذللا يخرج من بطونها شراب مختلف ألوانه فيه شفاء للناس إن في ذلك لآية لقوم يتفكرون﴾ النحل/٦٥-٦٩.

واتە: و خودا لە ئاسمانەوە ئاوی ناردو زەوی دوای ئەوەی کە مرد بوو، بەو ئاوە بارانە زیندووی کردەوە، بەڕاستی لەمەدا نیشانەیەکی روون هەیە بۆ ئەوانەی کە گوێی ژنەوایان هەیە!،و بەڕاستی لە هەبوونی ئاژەڵ (مەڕو بزن و چێڵ و وشتر) بۆ ئێوە پەند وەرگرتن هەیە، لە ناو زگی ئەوانەدا لە نێو ئالیکی خوراوو خوێن، شیری خالیص بۆ ئێوە دەنۆشێنین کە خۆش مەزەیە بۆ ئەوانەی دەینۆشن (نۆشێنەران)،و لە میوەی داری خورماو ترێ، موسکیراتی (ناپاك)و رسق و رۆزیی چاك و پاك و خاوێن دەگرن، بەڕاستی لەمەدا نیشانەیەك بۆ هۆزێ هەیە کە بیرو هزر دەکەنەوە،و پەروەردگاری تۆ وەحی (ئیلهامی غەریزی) بە هەنگ کرد کە لە نێو تاشەبەردی چیاو لە کونە دارو لە نێو دار

بەستگەلێ کە خەڵکی سازی ئەدەن، پلورەگەلێ بـۆ خۆتـان ساز دەن، لـە پاشـان لـە هـەر میوەیەك بخۆو ئەو ڕێگایانەی پەروەردگارتەنیا بۆی دیاری کردووی بە ئاسانی پێیدا بـڕۆ، لە ناو دەروونی هەنگدا خواردنەوەیەکی تایبەت دێتە دەرێ کە ڕەنگی جۆراوجۆری هەیە کە تێیدا شیفا بۆ خەڵك هەیە، دیارە لەمـەدا نیشـانەیەکی ڕوون بـۆ هـۆزێ هەیـە کـە عـەقڵیان دەخەنە کارو بیر دەکەنەوە!.

- ﴿والله جعل لكم من أنفسكم أزواجا وجعل لكم من أزواجكـــم بنـــين وحفـــدة ورزقكم من الطيبات أفبالباطل يؤمنون وبنعمة الله هم يكفرون﴾ النحل/٧٢.

واتە: و خودا لە جنسی خۆتان هاولفی بۆ داناون‌و لـە هـاولفـو ژنـەکانتان بـە ئێـوە منداڵ‌و نەوەی دا،و ڕسق‌و ڕۆزیی پاکی پێ دان، جا ئایا بڕوا بە بـاتڵ دێنـن‌و بـە نیعمـەتی خودا ناسپاسیی دەکەن؟.

- ﴿والله أخرجكم من بطون أمهاتكم لا تعلمون شيئا وجعل لكم السمع والأبصـــار والأفئدة لعلكم تشكرون، ألم يروا إلى الطير مسخرات في جو السماء ما يمســكهن إلا الله إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ النحل/٧٨-٧٩.

واتە: و خودا ئێوەی لە زگی دایکتان دەرهێنا، لە حاڵێکدا هیچتان نەدەزانیی، بەڵام (خودا)گوێ‌و چاوو ئەقڵی بە ئێوەدا، بـەڵکو شـوکری نیعمـەتی (خـودا) بـەجێ بێنـن، ئایـا ئەوانە تەماشای باڵندە ناکەن کە لە هەوا لە ئاسماندا فەرمانبەرن، بێجگە لـە خـودا کـەس ناتوانێ ئەوان(لە هەوا) ڕابگرێ، بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك بۆ تاقمی بڕواداران هەیە.

- ﴿والله جعل لكم من بيوتكم سكنا وجعل لكم من جلود الأنعام بيوتا تســـتخفونها يوم ظعنكم ويوم إقامتكم ومن أصوافها وأوبارها وأشعارها أثاثا ومتاعا إلى حين﴾ النحل/٨٠.

واتە: و خودا لە ماڵەکانتان جێی دانیشتن (و حەسانەوەی) بۆ داناون، هەروەها لە پشتی ئاژەڵیش (چادر)و خانوو گەلێکی بۆ داناون کە لە بارکردن‌و لە دانیشتندا بە ئاسانی دەتوانن جێبەجێیان بکەن‌و لە خـوریو کـورك‌و (بـەرگن)و مـوو (مـەرەز)ی ئەوانـە خـرت‌و پرت‌و کاڵای بۆ داناون تا ماوەیەکی درێژ.

- ﴿والله جعل لكم مما خلق ظلالا وجعل لكم من الجبال أكنانا وجعل لكم سرابيل تقيكم الحر وسرابيل تقيكم بأسكم كذلك يتم نعمته عليكم لعلكم تسلمون، فإن تولوا فإنما عليك البلاغ المبين، يعرفون نعمة الله ثم ينكرونها وأكثرهم الكافرون﴾ النحل/٨١-٨٣.

واته: و خوا لـه‌وه‌ى به‌ديهێناوه، سێبه‌رى بۆ ئێوه سازداوه‌و لـه نێو كێوه‌كاندا په‌ناگاى (به‌ديهێناوه)و بۆ ئێوه كراس (جلك)ى ساز داوه تا ئێوه لـه گه‌رماو (سه‌رما) بپارێزێ،و هه‌روه‌ها جلك گه‌لێكى بۆ سازداون تا له كاتى جه‌نگدا بتانپارێزێ، ئا به‌م جۆره نيعمه‌ته‌كانى خۆى بۆ ئێوه ته‌واو ده‌كا تا ته‌سليمى فـه‌رمانى ئـه‌و بن، جا ئه‌گه‌ر روويان وه‌رگێڕا (نيگه‌ران مه‌به) تـه‌نيا له‌سه‌رته به ئاشكرا راگه‌ياندن، ئه‌وانه نيعمه‌تى خـودا ده‌ناسن، كه‌چى له پاشان ئينكارى ده‌كه‌ن،و زۆربه‌يان كافرن.

- ﴿ألم نجعل الأرض مهادا، والجبال أوتادا، وخلقناكم أزواجا، وجعلنا نومكم سباتا، وجعلنا الليل لباسا، وجعلنا النهار معاشا، وبنينا فوقكم سبعا شدادا، وجعلنا سراجا وهاجا، وأنزلنا من المعصرات ماء ثجاجا، لنخرج به حبا ونباتا، وجنات ألفافا﴾ النبأ/٦-١٦.

واته: ئايا زه‌ويمان نه‌كردۆته جێى ئـارام گرتـن (بۆ ئێوه)؟و ئايا كێوه‌كانيشمان (نه‌كردۆته) گوڵمێخ؟و ئێوه‌مـان جـووت جـووت به‌ديهێنا،و خـه‌وى ئێوه‌مـان كـرده هـۆى حه‌سانه‌وه‌تان،و شه‌ومان كرده پۆشش (بۆ ئێوه)،و رۆژمان كرده هۆ بـۆ بـه‌ده‌س هێنـانى پێ بژيو،و به بان سه‌رتانه‌وه حه‌وت (ئاسمانى) پته‌مان دانا،و كردمانه چرايـه‌كى روونـاكو به‌تين،و له هه‌ورى بارانزا ئاوى زۆرمان بـاراند، تـا بـه هـۆى ئـه‌وه دانه‌وێڵـه‌و گژوگيـا شـين بكه‌ين،و باغ گه‌لى پڕ دارى تێكئالاو.

- ﴿فلينظر الإنسان إلى طعامه، أنا صببنا الماء صبا، ثم شققنا الأرض شقا، فأنبتنا فيها حبا، وعنبا وقضبا، وزيتونا ونخلا، وحدائق غلبا، وفاكهة وأبا، متاعا لكم ولأنعامكم﴾ عبس/٢٤-٣٢.

واته: جا مرۆڤ با بنوارێته خۆراكى خۆى، به‌ڕاستى ئێمه بارانى زۆرمان بـاراند، لـه پاشـان زه‌ويمـان لـه‌ت لـه‌ت كـرد، جـا دانه‌وێڵـه‌مان لـه‌ودا شـين كـرد، وتـرێ‌و سـه‌وزى‌و

خواردەمەنیی،و دارە زەیتونو دارە خورما،و باغەکانی رازاوەی پڕدا،و میوەو گژوگیـا، تـا بۆ ئیـێوەو ئاژەڵەکانتان ببێتە خۆراك.

- ﴿يا أيها الناس اذكروا نعمة الله عليكم هل من خالق غير الله يرزقكم من الســماء والأرض لا إله إلا هو فأنى تؤفكون﴾ فاطر/٣.

واتە: ئەی خەڵکینە! نیعمەتێ کە خودا بە ئیێوەی داوە بیهێننەوە بیر، ئای بێجگە لە خوا بەدیهێنەری تر هەیە کە لە ئاسمانو زەوی رۆزیتان بدا؟ بێجگە لەو مـەعبودێکی تـر نیە، جا چلۆن درۆ ئەکەنو لە حەق لا ئەدەن.

- ﴿والله الذي أرسل الرياح فتثير سحابا فسقناه إلى بلد ميت فأحيينا به الأرض بعـد موتها كذلك النشور﴾ فاطر/٩.

واتە: و خودا زاتێکە بای نارد تا هەورەکان ببزوێنێو (بڵاویان بکاتـەوە)، جـا ئێمـە ئەوانـە بـۆ سـەر زەویـی مـردوو لێئـەخوڕین، جـا ئـەو زەوییـە پـاش مردنـی زینـدووی دەکەینەوەو هەروا بە (زیندوو کردنەوەی مردووەکان) لە رۆژی بەرێدا.

- ﴿ألم تر أن الله أنزل من السماء ماء فأخرجنا به ثمرات مختلفا ألوانها ومن الجبـــال جدد بيض وحمر مختلف ألوانها وغرابيب سود، ومن الناس والدواب والأنعام مختلف ألوانـــه كذلك إنما يخشى الله من عباده العلماء إن الله عزيز غفور﴾ فاطر/٢٧-٢٨.

واتە: ئایا نەتدی کە بەڕاستی خودا لـە ئاسمانـەوە بـارانی نـاردو بـە هـۆی ئـەوەوە میـوەی جـۆراو جۆرمـان (لـە زەوی) روانـد بـە رەنگـی جۆراوجـۆرو لـە کێوەکـانیش جادەگەلێکمان سازدا بە رەنگی سپیو سورو رەنگـی جیاجیـاو،و جارجـارەش بـە رەنگـی رەشی پڕ رەنگ،و لە مرۆڤـو جوڵندەکانو ئەنعام (وشترو بزنو مـەڕو گـایش) بـە رەنگـی جیاجیاوە (بەدیمان هێناوە)، بەڕاستی لـە نێـو بـەندەکانی خـودادا تـەنیا زانایـان لـە ئـەو ئەترسن، بەڕاستی خودا عەزیزو غەفورە.

- ﴿وهو الذي أنشأ جنات معروشات وغير معروشات والنخل والزرع مختلفا أكلـــه والزيتون والرمان متشابها وغير متشابه كلوا من ثمره إذا أثمر وآتوا حقه يـــوم حصـــاده ولا

تسرفوا إنه لا يحب المسرفين، ومن الأنعام حمولة وفرشا كلوا مما رزقكم الله ولا تتبعوا خطوات الشيطان إنه لكم عدو مبين، ثمانية أزواج من الضأن اثنين ومن المعز اثنين... ومن الإبل اثنين ومن البقر اثنين...﴾ الأنعام/١٤١-١٤٤.

واتە: و هــەر ئــەوە کەسێ کــە بــاغو بێستـانی لــە دارو گیــای ساق بــەرز (خورمـاو هــەنار)و ساق کــورت (شــوتیو هــاروێ)،و دارخورمــاو کێڵگــە بــەتام گــەلێ جــۆر بــە جــۆرو زەیتونو هەناری بەدی هێنا کەلە بابەتێکەوە وەیەکتر دەچنو لە بارێکیشەوە وەیەکتر ناچن، لــە کــاتی میوەدانــدا لــە میــوەی ئــەوە بخــۆنو لــە کــاتی دروێنــەدا مافــەکانی خــۆی بدەنێ،و ئیسرافو زیادەڕەوی مەکەن، بەڕاستی خودا ئیسرافکارانی خۆش ناوێ،و (خــودا زاتێکــە) لــە ئــاژەڵ بــۆ ئێــوە ئــاژەڵی باربــەر (وشــتر)و ئــاژەڵی گچکــە (پــەزو پۆڵــە)ی (بــۆ ئامادەکردنی راخەرو گۆشــت) خولقــاند ، لــەوەی خــودا کردویەتییــە رزقو رۆزی بــۆ ئێــوە بخۆن،و لە هەنگاوەکانی شەیتان پەیڕەوی مەکەن، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرا بۆ ئێوەیە، لە ئاژەڵ هەشت جووت (حەڵاڵ گۆشت)ی بەم جۆرە خولقاند: لە مەڕ دووان (نێرو مێ) لە بزن دووان،.... و لە وشتر دووان،و لە گایش دووان(مان بۆ ئێوە خولقاند).

- ﴿إن الله فالق الحب والنوى يخرج الحي من الميت ومخرج الميت من الحي ذلكــم الله فأنى تؤفكون، فالق الإصباح وجعل الليل سكنا والشمس والقمر حسبانا ذلك تقدير العزيــز العليم﴾ الأنعام/٩٥-٩٦.

واتە: بە حەقیقــەت خــودا لەتکــەری دەنــكو ناوکەیــە، زینــدو لــە مــردوو دەردێنــێو دەرهێنــی مردووە لەزیندوو، ئەمەیە خودا، جا چلۆنو لە کوێوە بە درۆ خۆتان (لە خــودا) لا ئەدەن، خودا دادڕی سپێدەی بەیانە (لە سنگی تاریکــایی شــەو)، شــەوی کردۆتەمایــەی ئارام گرتن،و رۆژو مانگی کردۆتە هــۆی حیســابو ئــەندازە گرتــن، ئەمــە تــەقدیرو ئــەندازە گرتنی خودا تواناو زانایە.

- ﴿وهو الذي أنشأكم من نفس واحدة فمستقر ومستودع قد فصلنا الآيات لقــوم يفقهون﴾ الأنعام/٩٨.

واتە: و هەر ئەوە کە ئێوەی لە یەك نەفس (ئادەم) خەڵق کرد، جـا قـەرار دانـدراوە (لە پشتی بـاوك) ئەمانـەت دانـدراوە (لـە مندالّدانـی دایـك)، ئێمـە نیشـانەکانی خۆمـان بـۆ کەسانێ کە ئەفامن بەیان کردووە.

کۆتایی ئەم ئایەتانەش بە کۆتاییەکانی سورەتی (الأنعام) دێنین:

﴿وهو الذي جعلكم خلائف الأرض ورفع بعضكم فوق بعض درجات ليبلوكم في ما آتاكم إن ربك سريع العقاب وإنه لغفور رحيم﴾ /١٦٥.

واتە: و هەر ئەوە کە ئێوەی کردۆتە جێ نشینان (و نوێنـەرانی خـۆی) لـە زەویـداو هێندێ لە ئێوەی بە پلە بەسەر هێنـدێ تـردا بـەرز کردۆتـەوە تـا بـەوەی بـە ئێـوەی داوە تاقیتـان بکاتـەوە، بەڕاسـتی پـەروەردگار تەنیا زوو بـە عـەزابی (تاقیکراوەکـان) رادەگـا،و بەڕاستی هەر ئەو غەفورو رەحیمە.

✻✻✻

ئەم ئایەتانە کۆکراوەیی بەخششەکانی پەروەردگار دەخەنە روو:

١- بوونـی مـرۆڤ بـە جێنشـین لەسـەر زەویـدا، ئاماژەیـە بـۆ هـەردوو جۆرەکـانی بەخشین:

أ- بە خشینی پەروەردگار؛ تایبەتمەندێتی ئاشکراو پەنـهانی بـۆ مـرۆڤ تێدایـە کـە بەهۆیەوە توانیویەتی بوون رام بێنێت.

ب- هەروەها ئەو بەخشینەی پەورەردگار بۆ مرۆڤ کە زەوی‌و چی لە ناویدایە بۆ وی بەدی هێناوە.

٢- لـەوەدا کـە مرۆڤـەکان هیچیـان وەك یـەك نـابن، بـەڵکو هـەندێکیانی بەسـەر هەندێکیاندا پلەدار کردووە، لەمەدا گەورەترین نیعمەت هەیـە، جـا هـەندێك مـرۆڤ گومـان دەکـات:کەلەمـەدا چ نیعمـەتێك هەیـە، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ کـورت هەڵـهێنانی تێگەیشتنەکان؛ چونکە ژیانی دنیا بە هۆی ئەمـەوە نـەبێت راناوەستێت، جـا گـەر هـەموو مرۆڤـەکان لـە جوانـی‌و زیرەکـی‌و هـێزو ژیـری‌و زانسـت‌و تواناکـاندا وەك یـەك بوونایـەو

هەموویان لە پلەبەرزەکانی ئەم سیفەتانەدا بوونایە، بۆ نموونـە ئـەو کاتـە هیـچ کەنناسـێك نەدەبوو زەوی خاوێن بکاتەوەو هیچ کرێکارێك نەدەبوو بە کارێك هەستێت، بەڵام بـە هـۆی ناوێکچوونیانەوە وای کردووە هەموویان رام بن لـە سـنوری تواناکـانی خۆیـاندا تـا دەگاتـە ئەوەی ببێتە بەشێك لەو کـارەی کـە ژیـانی دونیـاو بـەرژەوەندی بـەدی هاتووەکـان پـێ ی هەڵدەستێت.

بـەم ناوێکچوونیـەرخـەڵکی شـیاوی گوێڕایـەڵی سـەردارەکان بـوون، هـەندێکیش بـۆ پرس‌و راوێژ، هەندێکیش بۆ سوپاو ...... ئیدی بەم جۆرە.

پاشـان ئایەتەکـە حیکمـەتی ئـەم جیاوازییـەی لـە نێـوان مرۆڤـەکانی جـێ نشـینی پەروەردگار دەرخستووە، کە بریتییە لە تاقیکردنەوە لەوەی مرۆڤ پێ ی بەخشـراوە لـە پلەو بەهرەو توانا؛ جا کەسێك ئەمانە بـە رووە راسـتەکانی بـەکار بـهێنێت ئـەوا سـەرفرازو سەرکەوتوو دەبێت‌و ئەگەر نـا ئـەوا دەکـەوێت. رەنگـە لـە مەشـدا کەسـانێك کـە پلەیـەکی بەرزیان هەیە بکەون‌و کەسانێکیش کە شوێن‌و پایەیەکی نزمیان هەیە دەرچن‌و سـەرکەون، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ گەورەترین نیعمەت‌و بەخشین کە خوداوەند بـە مرۆڤـی خـەڵات کردووە ناردنی پێغەمبەرانە بۆیان:

﴿وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين﴾ الأنبياء/١٠٧.

واتە: و تۆمان نەناردووە، مەگەر رەحمەت بۆ جیهانیان.

﴿لقد منّ الله على المؤمنين إذ بعث فيهم رسولا من أنفسهم يتلو عليهم آياته ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة وإن كانوا من قبل لفي ضلال مبين﴾ آل عمران/١٦٤.

واتە: خودا منەتی لەسەر بـڕواداران دانـا (نیعمـەتی گـەورەی پێدان) کاتـێ کـە لـە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردن کە نیشانەکانی خودایـان بەسـەردا بخوێنێتـەوەو ئـەوان لـە روانگەی خوو ئاکار پاك‌و بێ گـەرد بکاتـەوەو کتێـب (قورئـان)و حیکمـەتیان فـێر بکـا،و ئەگەر چی لە بەرا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوون.

چونکە پێغەمبەران ﷺ دەتوانن رێنمونی مرۆڤ بکەن بۆ رێگەی راست کە دەبێت هەموو مەلەکەو تواناو بەهرەکانی تیا وەگەڕ خات، بە جۆرێك کە هیچی نەمێنێتەوە بێ کارو جوڵە، و بە جۆرێك کە لەگەڵ هیچ کامێك لەوانەدا بەرەنگار نەبێت کە مەلەکاتەکانیان بە شێوەیەکی راست فەراهەم بێنن، بە م جۆرەش نیعمەتی خوا دێتە دیو مرۆڤ دەتوانێ سوود لە هەمو ئەو شتانە وەرگرێت کە پەروەردگار بۆی ژێر بار خستووە. گەر ئەمە نەبوایە هەموو هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ سوود وەرگرتن لە بەدیهێنراوە رامەکانی خودا، بەیەکا دەچوونو دژی یەك دەوەستان، ئەو کاتەش ئەم پلەیەی مرۆڤ کە هەموو شتێکی بۆ رام کراوە دەبووە هۆی سەرگەردانیو دروست بوونی کێشمەکێش، وەك لەمڕۆدا بەرچاومان دەکەوێت.

لەمانەی رابوردن دەگەینە ئەوەی کە:

ئەم مرۆڤە بچووکە: تەواوترین بەدیهاتووی پەروەردگارە لە گەردووندا، جا لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی ئەم گەردوونە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە ئاسمانەکانو زەمینو ئاژەڵانو رووەکەکانی، هەر هەموویان رامو گەردنکەچی مرۆڤنو تەنانەت هیچ گەردێکی ئەمانەش لەم یاسایە لانادەن.

سەبارەت بە رووەك ئەوا لە کۆنو نوێدا مرۆڤ بە رێگەی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ سوودی لێوەرگرتووە، بەروبومەکەی بۆ خواردن بەکارهێناوە، قەدی درەختی کردووە بە رەوڕەوەی گواستنەوەو بەکار هێنانی لە خانووبەرەو هەروەها بۆ سوتاندن. گوڵەکەشی بۆ هەنگ دەبێتە خۆراكو ئەویش دەیکاتە هەنگوین بۆ مرۆڤ یاخود گەڵاو لقەکانی دەبێتە خۆراکی ئاژەڵو ئێمەش سوود لە گۆشتەکانی وەردەگرین،و شیرەکەی دەخۆینەوەو توکەکەشی لە رایەخو پۆشاك دروست کردندا کەڵکی لێ دەبینرێت، هەروەها دەرمانو شمەکیشی لێ دروست دەکرێت، با ئەوەش لە یاد نەکەین کە پترۆڵو پێکهاتەکانیشی هەر لەوە دروست بووە.



جا ئەم زيندەوەرانــە، ئـەوەی پێمـان زانيـونو ئـەوەش كـە پێمـان نـەزانيون؛ ئايـا هەمووی لە پێناوی مرۆڤدا بۆ سوود وەرگرتنی بە رێگــەی راسـتەوخۆو ناڕاسـتەوخۆ بـەدی نەهاتووە؟: چ مرواری بێت يا خۆراك يا بۆ چێژی بينين بێت، لەگەڵ ئەمەشدا چەندان پـۆل لە زيدەوەران هەن تا ئێستاش نازانين كە مرۆڤ چ سوودێكيان لێ دەبينێ‌و چۆن كـەڵكيان لێ وەردەگرێت؟ كە رەنگە لـە داهـاتوودا ئەمانـە بزانرێـن، رەنگـە ئـەم بەسـەرهاتەش لـەم بارەيەوە پەندمان پێ ببەخشێت:

جۆرێك لە پەرژينو تـانۆك (الصبير) هەيـە كـە بـۆ پـەرژينی كێڵگـەكان سـوودی لێ وەردەگيرێت، برديـان بـۆ ئوسـتراليـاو لـەوێ ناشـتيان، بـەڵام بــووە هــۆی بــەرپا بوونــی كارەسـاتێكی گـەورە، بـە جۆرێك تەشـەنەی كـرد، وای لێـهات خـەريك بـوو زۆربــەی ئــەو زەوييانە داگير بكات كە بەكەڵكی كشتوكاڵ دەهـاتن، زاناكـان لـەوە زۆر سـەريان سـوڕما، پاشان جۆرێك بەكترياي نەخۆشييان ديتەوە كە تـەنيا لەسـەر ئـەو جـۆرە درەختـە دەژی، هەر بە هۆی هەمان جـۆری درەختــەوە ميكرۆبەكـەيان گواسـتەوە، ئيـدی ميكرۆبـەكان بـە كاری خۆيان هەستانو تا رێژەی درەختەكان گەيشتەوە دۆخی گونجاوی خۆی، جا ئەوەی دەبێت تێبينی بكرێت ئەوەيە: ئەم ميكرۆبە درەختەكانی لە ناو نەبرد، بەڵكو درەختەكـەی بە جۆرێك هێشتەوە كە سوودی هەبێتو زيانی نەبێت.

رەنگە لە بەسەرهاتی دۆزينەوەی (پەنسلين)يشدا پەندێكی تری تێدا بێـت، بـەوەی كە مرۆڤ بە هەر شێوەيەك بێت لە هەموو شتێكی ئەم گەردوونە سوودمەند ئەبێت، ئـەمڕۆ بێت يا سبەی! هەر چۆن بێت! ئەوا مرۆڤ وەك چـۆن چێـژ لـەو پـارووە وەردەگرێـت كـە دەيخواتو ئەو پۆشاكەی لەبەری دەكـاتو چێـژ لـە ديمـەنی جـوان وەردەگرێـت، جـا وەك چۆن چەشە لەمانە وەردەگرێت هەر واش چەشە لە مەعريفە وەردەگرێت، جا ئەمە گەر لـە هـەندێك بەديـهاتووەكانی پـەروەردگاردا نـەبينێت، ئـەوا ئەمـەش دەبێتــە بەڵگــە لەسـەر حيكمەتی پەورەردگارو ميهرەبانیو بـەرفراوانيی گرنگـی پێـدان بـە بەديـهاتووەكانی، وەك بەديهێنانو هێشتنەوە، ژيانو مراندن،و رزقو رۆزی پێدان... ئيدی بەسە..

پاشان، ئایا ئەم هەموو رەگەزەی لە گەردووندا هەیە؛ ئاسنو مسو ئۆکسجینو ئازۆتو هایدرۆجینو زێر .... هەمووی بۆ مرۆڤ رام نەبوون؟! ئەی زەمین کە چۆن راخراوەو بۆتە جێی حەوانەی مرۆڤو شوێنی وەدەست خستنی گوزەرانو رۆزی؟ هەروەها هێزی کێشندەی مانگو سەرنج راکێشانی مرۆڤ بۆ جوانیو روناکییەکەیو زانینی کات بە هۆیەوە بەڵگە نیە؟! و سەرنج راکێشانی خۆرو گەرمییەکەیو رووناکییەکەیو ئەو وزەیەی پەخشی دەکات؟! ئەی ئەستێرە رێنماکارە جوانەکان؟! هەروەها ئاوو سوڕەکانی؟ رەشەباو سوڕەکانی؟ پاشان دروست بوونی مرۆڤ بەم جۆرەی کە لەسەریەتی لە زانستو ئیرادەو تواناو حیکمەتو ژیریی، بەجۆرێك کە زۆربەی شتەکانی پێدەزانیٚ،و دەزانێت چۆن سوود لە شتەکان وەرگرێت، ئایا هەموو ئەمانە بەڵگەی تەواو نین لەسەر ئەوەی کە ئەم گەردوونە بەدیهێنراوە تا لەبەر دەستی مرۆڤدا رام بێت، مرۆڤیش بۆ ئەم گەردوونە رام بووە؟! ئایا لەمەدا بەڵگەی تەواو نیە لەسەر ئەوەی کە زاتێك هەیە هەموو ئەمانەی رێك خستووەو مرۆڤیشی بۆ بەدیهێناوە؟. ئەو پەروەردگارەی کە پەورەردگاری هەموو جیهانەکانە:

﴿وإذ تأذن ربكم لئن شكرتم لأزيدنكم ولئن كفرتم إن عذابي لشديد، وقال موسى إن تكفروا أنتم ومن في الأرض جميعا فإن الله لغني حميد﴾ إبراهيم/٧-٨.

واتە: (بێننەوە بیر) کاتیٚ کە پەروەردگارتان رایگەیاند کە ئەگەر شوکرانە بژێر بن، (نیعمەتی خۆی) بۆ ئێوە زیاد دەکا،و ئەگەر کوفران بکەن، بەڕاستی سزادانم سەختە!،و موسا گوتی: ئەگەر ئێوە (بەنی ئیسرائیل)و هەموو خەڵکی رووی زەوی کافر بن (بەخوا زیانیٚ ناگا)، جا بەڕاستی خودا بیٚ نیازێکی ستودەیە.

﴿وقليل من عبادي الشكور﴾ سبأ/١٣.

واتە: و کەمیٚ لە بەندەکانم شوکرانە بژێرن.

# دیاردەی نۆیەم

## دیاردەی یەکێتیی[٧]

کەسێك لەم گەردوونە بکۆڵێتەوە، بەڕاشکاوی هەست بە دیاردەی یەکێتیی دەکات تێیدا، کە دەبێتە بەڵگەیەکی تەواو لەسەر ئەوەی یەك زات بە یەك زانستو یەك ئیرادەو یەك توانا دۆزیویەتییەوەو هێناویەتییە بوون، ڕووەکانی ئەم دیاردەی یەکێتییەش لە گەردووندا زۆرن، لەوانە:-

١- تەواوکاری لە بەشەکانی ئەم گەردوونەدا هەیە کە بە وردی ئەمانگەیەنێتە ئەوەی یەك پەروەردگار هەموو بەشەکانی ڕێکخستووە،ئابەم جۆرە پڕ وردەکاریو تەواوە!

مامۆستا البنّا -رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێ:-

**تێبینی یەکەم:** (ئەو هەوایەی کە هەڵی دەمژین لە چەند رەگەزێك پێکهاتووە، لەوانە دوو رەگەزی سەرەکیو گرنگ: بەشێك کە بە کەڵکی هەناسەدانی مرۆڤ دێت، بە زاراوەی کیمیازانەکان پێی دەگوترێت ئۆکسجین. هەروەها بەشێکی تریش کە زیانمەندە، پێی دەگوترێت کاربۆن، جا لە وردەکارییەکانی پێکەوە بەستنی نێوان پارچەکانی ئەم

گەردوونە سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە ئەو بەشەی زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت رووەکەکان هەڵی دەمژن‌و بۆیان بە سوودە، کەچی لە کاتێکدا مرۆڤ ئۆکسجین هەڵدەمژێ‌و کاربۆن دەرئەداتەوە، ئەوا رووەکەکان بە پێچەوانەی ئەمەوە دەکەن‌و کاربۆن هەڵدەمژن‌و ئۆکسجین دەدەنەوە) أ.هـ.

(هەر بەم جۆرەش کرداری دۆزینەوەی هاوتایی نێوان دەرچو و هاتووەکان لە گازی خەڵوزو دەریاکان روودەدات، بە جۆرێك کە رووەك هەموو زیادەیەك لەمانە لە هەوادا هەڵدەمژێت گەر بگاتە سەروو رادەی گونجاوو دیاری کراوی خۆی).

(جا تەماشای پەیوەستی هاوکاری‌و تەواوکاری نێوان مرۆڤ‌و رووەك‌و دەریاکان بکە لە شتێکدا کە گرنگترین رەگەزەکانی ژیانە،ئەویش هەناسە دانە).

**تێبینی دووەم:** (تۆ خواردن دەخۆیت‌و ئەویش لە چەند رەگەزێکی رووەکی‌و زیندەگی پێکهاتووە، کە زاناکان بۆ نموونە دابەشی دەکەن بۆ ماددەکانی زولاڵیات‌و نیشاستەیی‌و چەوری، بۆیە دەبینین (خزو- لیك) هەندێ ماددەی نیشاستەیی هەرس دەکات‌و هەندێ لەو ماددە شەکریانە دەتوێنێتەوە کە توانای توانەوەیان هەیە، گەدەش گیراوەکانی ماددەی زولاڵی وەك گۆشت‌و... ئەوانی دی... هەرس دەکات، زەرداوی جگەریش چەورییەکان هەرس دەکات‌و دابەشیان دەکات بۆ چەند بەشێکی ورد کە توانای مژینیان هەبێ، پاشان رۆڵی پەنکریاس دێت‌و چوار جۆر گیراوە دەردەدات، کە هەر یەکەیان هەڵدەستێت بە تەواوکاری کرداری هەرس لە یەکێك لە هەر سێ بەشەکەی نیشاستەیی‌و زولاڵیات‌و چەوری، چوارەمیش شیر دەگۆڕێت بۆ پەنیر، جا سەرنجی ئەم پەیوەندییە سەرەکییە بدە لەنێوان بەشەکانی لەشی مرۆڤ‌و رەگەزە رووەکییەکان‌و ئاژەڵییەکان‌و ئەو خوارنانەی مرۆڤ دەیانخوات).

**تێبینی سێهەم:** (کاتێك سەیری گوڵ دەکەیت دەبینیت پەڕی جوانی سەرنج راکێشی پێوەیە، بە زۆر رەنگی قەشەنگ رازاوەتەوە، جا گەر پرسیاری حیکمەتی ئەوە لە زانایانی رووەکناس بکەیت، ئەوا لە وەڵامدا پێت دەڵێن: مەبەست لەمە بۆ خەڵەتانی مێش

هەنگو ئەو زیندەوەرانەیە کە گوڵ دەمژن، تا پێوەی بنیشنەوە، هەتا کاتێك بەسەر دەزوولە هەڵاڵەییەکانەوە دەنیشێتەوەو بە هۆی پێکانیەوە تۆوی کوتانی رووەکەکە هەڵدەگریّو بەم جۆرە لە گوڵینێرەوە دەچێتە سەر گوڵی میّو کرداری کوتان دێتە دی.

جا سەرنج بدەو بزانە کە چۆن ئەم پەڕە جوانانەی گوڵ بوەتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان رووەكو زیندەوەران، بە جۆرێك کە رووەك: زیندەوەر لە کرداری کوتاندا بەکار دەهێنیّ کە بۆ بەرووبومو بەرهەم پێویستە.

هەر بەم جۆرە ئەم تەواوکارییە لە هەموو شتێکدا دەبینیتەوە؛ لەنێوان شەوو رۆژدا، ئاسمانو زەوی، خۆرو مانگ، ئەندامە نێرینو ئەندامە مێیینەکان، مرۆڤو ئاژەڵو رووەك .....

لەم گەردوونەدا یەکێتییەکی تەواو هەیە لە نێوان بەشەکانیدا کە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی یەك پەروەردگاری تاكو تەنیای هەیە. بەڵام سەبارەت ئەوەی کە ئایا چۆن ئەمە ئێمەی گەیاندە یەکتایی خوای گەورە؟ ئەوا مامۆستا –البنّا– بەم جۆرە وەڵامی ئەداتەوە:

التعدد –لەبیروباوەڕدا– (چەندێتی)دەبێتە هۆی تێکدانو دووبەرەکیو بەرزنوانرن، لە کاتێکدا کە پلەی خوایەتی کبریاءو مەزنیە، جا لەم کاتەدا ئەگەر یەکێك لەو چەندە بە شێوەیەکی سەربەخۆ کار بکات ئەوا سیفاتی ئەوانی تر پووچ دەبێتەوە، گەر هاویەشییش بکەن ئەوا هەر سیفەتی هەندێکیان پووچ دەبێتەوە، پووچ بوونەوەی سیفاتی خوایەتیش پێچەوانەی تەواوێتیو گەورەییو شکۆیەتی، بۆیە دەبێت هەر یەك خوای بیّ هاوەڵ هەبێت).

قورئانی پیرۆز بەڵگەی (تەواوکاری –التكامل)ی لەسەر تاكو تەنیایی بەدیهێنەرمانی لە چەند شوێنێکدا باس کرووە:

﴿قل الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفى آلله خير أما يشركون، أمن خلق السماوات والأرض وأنزل لكم من السماء ماء فأنبتنا به حدائق ذات بهجة ما كان لكم أن تنبتوا شجرها أإله مع الله بل هم قوم يعدلون، أمن جعل الأرض قرارا وجعل خلالها أنهارا

وجعل لها رواسي وجعل بين البحرين حاجزا أإله مع الله بل أكثرهم لا يعلمون، أمن يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الأرض أإله مع الله قليلا ما تذكرون، أمن يهديكم في ظلمات البر والبحر ومن يرسل الرياح بشرا بين يدي رحمته أإله مع الله تعالى الله عما يشركون، أمن يبدأ الخلق ثم يعيده ومن يرزقكم من السماء والأرض أإله مع الله قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين﴾ النمل/٥٩-٦٤.

واتە: بڵێ سوپاس تایبەتی خودایەو سەلام (درود) لەسەر بەندەكانی كە خۆی هەڵبژاردووە، ئایا خودا باشترە یا بتگەلێ كە ئەیكەنە هاوبەشی، یا ئەو زاتەی كە ئاسمانەكانو زەوی بەدیهێناو لە ئاسمانەوە باران بۆ باراندن، جا بە هۆی ئەو بارانەوە باغو بێستانی بە دیمەنو جوانمان بۆ شین كردن، لە حاڵێكدا كە ئێوە توانای شین كردنی دارەكەشتان نیە، ئایا مەعبودی دیكە لەگەڵ خودا هەیە؟ نا نیە، بەڵام ئەوانە هۆزێكن لە حەق لایان داوەو لا ئەدەن، یا كەسێ كە زەوی كردۆتە جێی قەرار گرتنو لە نێو ئەودا چۆمی داناوەو كێوی پتەوی بۆ سازداوەو لە نێوان دوو دەریای (سوێرو شیرین) مانیعی خۆرسكیو تەبیعی (وزنی تایبەتی) داناوە (تا تێكەڵاو نەبن بەم حاڵە) ئایا مەعبودێ لەگەڵ خودا هەیە (هاوبەشی بێ)؟ نا نیە بەڵكو زۆربەی ئەوانە نەزانو (جاهیلن)، یا كەسێ كە وەڵامی هەژاران ئەداتەوە، كاتێ هاواری بۆ بەری كەندو كۆسپی بۆ لادەبا،و ئێوە دەكاتە جێنشینی پێشینان لە ئەرزدا، ئایا مەعبودێ لەگەڵ خودا هەیە، (نا نیە) خودا بەرزتر لەوەیە كە هاوبەشی بۆ دابنێن، یا كەسێ كە ئافەرینیش دەس پێ دەكاو لە پاشان دەیانگێڕێتەوە، و كەسێ كە لە ئاسمانو زەوی رسقو رۆزیتان ئەدا، ئایا مەعبودێ لەگەڵ خودا هەیە؟ (نا نیە) بڵێ: بەڵگەتان بێنن ئەگەر راست بێژن؟.

﴿أم اتخذوا آلهة من الأرض هم ينشرون، لو كان فيهما آلهة إلا الله لفسدتا فسبحان الله رب العرش عما يصفون، لا يسأل عما يفعل وهم يسألون، أم اتخذوا من دونه آلهة قل هاتوا برهانكم هذا ذكر من معي وذكر من قبلي بل أكثرهم لا يعلمون الحق فهم معرضون، وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لا إله إلا أنا فاعبدون﴾ الأنبياء/٢١-٢٥.

واتە: ئایا ئەوانەخوایانێکیان لە زەوی (بۆ خۆیان) هەڵبژاردووە کە ئەوانــە (مـردوو) دەژیێننەوە؟ ئەگەر لەئاسمانو زەوی خوایانــێ غـەیری(اللّٰه) هەبووانـە، فاسـید دەبـوون، سروشتی جیهان تێك دەچوو، جا پاكو بێ خەوشە خودا پەروەردگاری عەرش لـە پەسنێ کە ئەوانە دەیکەن، لە کـارێ کـە دەیکـا ناپرسرێ (و رەخنـەی لێ ناگـیردرێ)،و لـە کـاری ئـەوان دەپرسـرێو (رەخنـە) دەگـیردرێ، ئایـا ئەوانـە بێجگــە لــە خـودا مەعبودگـەلیان هەڵبژاردووە؟ بڵێ: بەڵگەتان بێننەوە، ئەمە قسەی ئەوانەیە کە لەگەڵ منن (و لــە مـن فـێر بوون)و قسەی کەسانێکە (پێغەمبەرانێکە) کەبـەر لـە مـن هـەبوون، بـەلام زۆربـەی ئەوانـە حەق نازانن، جا لەبەر ئەمە (لەحەق رووسورێنەرن)،و ئێمە بەر لە تۆ هیچ پێغەمبـەرێکمان نەناردووە، مەگەر ئەوە کە وەحیمان پێ کردن کە بیـجگە لە من مـەعبودێکی دیکـە نیـە، جا کەوایە تەنیا من بپەرستن.

﴿قل لمن الأرض ومن فيها إن كنتم تعلمون، سيقولون لله قل أفلا تذكرون، قل مـــن رب السماوات السبع ورب العرش العظيم، سيقولون لله قل أفلا تتقون، قل من بيده ملكوت كل شيء وهو يجير ولا يجار عليه إن كنتم تعلمون، سيقولون لله قل فأنى تسحرون، بل أتيناهم بالحق وإنهم لكاذبون، ما اتخذ الله من ولد وما كان معه من إله إذا لذهب كل إله بما خلـــق ولعلا بعضهم على بعض سبحان الله عما يصفون، عالم الغيـــب والشـــهادة فتعـــالى عمـــا يشركون﴾ المؤمنون/٨٤-٩٢.

واتە: بڵێ: زەویو کەسانێ کە لەزەوی دان هی کێیە، ئەگەر دەزانن، (لـە وەلامـدا) دەڵێـن: هـەمووی هـی خوایـە، بڵـێ: ئایـا ناهێننـەوە بـیر، بڵـێ چ کەســێ فــەرمانڕەوایی‌و حکومەتی هەموو شتێـکی بە دەستە؟و بە بێ پــەنایان پـەنا ئـەداو نیازیشـی بـە پـەنادان نیە، ئەگەر بزانن، ئەڵێن: (هەموو ئەوانە) هی خوان، بڵــێ: جـا چلـۆن ئێـوە سـیحرو جـادو لێکراون بەلام ئێمە هەقمان بۆ ئەوان هێناو بەڕاستی ئەوان درۆزنن، خودا منداڵی بـۆ خـۆی هەڵنەبژاردووەو مەعبودێ تر لەگەڵ ئـەودا نیـە (کـە ئەگـەر وا بوایـەو خـوای تـر لـە گـەڵی هەبوایە، لەو کاتە هەر یەکە لە خواکان خەریکی کـاری مـەخلوقی خـۆی دەبـوونو هـەندێ

بەسەر هەندێکدا بەرز دەبوونەوە، خوا لەو پەسنانەی کە دەیکەن پاکو بێخەوشــە، کـە بـە دیارو نادیار ئاگادارە، جا ئەو لەوە بەرزترە کە هاوبەشی بۆ دابنێن.

﴿قل لو كان معه آلهة كما يقولون إذا لابتغوا إلى ذي العرش سبيلا، سبحانه وتعـــالى عما يقولون علوا كبيرا﴾ الإسراء/٤٢-٤٣.

واتە: بڵێ: ئەگەر لەگەڵ ئەو (خوا) مەعبودانێ تر هەبوایە، هەروەکو ئەوان دەڵێن، دەکۆشان رێگایەك بۆ لای(خوای) خاوەن عەرش پەیا کەن (و بەسەر خوادا زاڵ بـن)، خـوا پاكو بەرزترە لەوەی دەیڵێن، زۆر بەرزتر.

٢- لە دیاردەکانی ئەم یەکێتییە لە گەردووندا؛ ئـەو تـەبایی‌و رێك‌و پێکییەیـە کـە پەروەردگار باسی کردووە:-

﴿ما ترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور، ثم ارجع البصر كرتين ينقلب إليك البصر خاسئا وهو حسير﴾ الملك/٣-٤.

واتە: لە ئافەرینشی خوای رەحماندا دژی‌و خەوش‌و بێ نەزمییەك نابینی، جا جارێ تر پیا بچۆوەو بۆی بڕوانە بزانە ئایا لەتبوون‌و کـەم‌و کوڕیـی دەبیـنی؟، لـە پاشـان جـارێ تریش (بەدنیای بوونا) بنواڕە، سـەرەنجام چـاوت (بـۆ دیتـنی کـەم‌و کوڕیـی بـە مـاندوویی) دەگەڕێتەوە لات،و لە حاڵێکدا ماندووو بێ هێزە.

ئەم نمونانەش لە گەردووندا ئاماژەی ئەو یەکپارچـەیی‌و یەکێتییـە سـەراپاگیرو پـڕ هاوکارییە دەکەن:-

أ- ئەلەکترۆن بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوە دەسوڕێتەوە، هەروەها زەویـش بـە پێچەوانـەی میلـی کـاتژمێرەوە دەسـوڕێتەوە، خـۆر بـە پێچەوانــەی میلـی کـاتژمێرەوە دەسوڕێتەوە، ئەسـتێرە گەڕۆکـەکانیش بـە پێچەوانـەی میلی کـاتژمێرەوە دەسـوڕێنەوە، هـەروەها مـانگ‌و هـەموو مانگــەکان بــە پێچەوانــەی میلــی کــاتژمێرەوە دەســوڕێنەوە، هەسارەکان هــەموو بــە پێچەوانـەی میلـی کـاتژمێرەوە دەسـوڕێنەوە، هـەروەها کۆمەڵـەی گەورەی خۆریش کە لەنێوانیاندا کۆمەڵەی خۆری ئێمەیە بە پێچەوانەی میلــی کـاتژمێرەوە

دەسوڕێتەوە، هـەروەها ئـەلکترۆن بەسـەر خولگەیـەکی سـپی ئیـهلیلجیدا دەسـوڕێتەوە، هەروەها زەویش بە دەورەی خۆرا لەسەر خولگەیەکی سپی ئیهلیلجیدا، هەروەها زوهـرەو نیبتـۆن‌و موشـتەری‌و هـەموو ئەسـتێرە گەڕۆکـەکانیش ... چــەقی زەویــش لارە، چــەقی مانگیش لارە، چەقی مەریخیش لارە ... چەقی خۆریش لارە، لەمەش سەیر تر ئەمەیە کـە ڕێژەی نێوان ناوك‌و ئەلکترۆنەکانی وەك ڕێژەی نێوان خۆرو ئەستێرە گەڕۆکەکانی وایە.

ب– گـەردەکانی گـەردوون هـەموویان لەسـەر دوانـەیی وەسـتاون، کارەبا:ســاردو گەرمە، گەر تەماشای ڕووەکیش بکەین هەر بەدووانـەیی پێکـهاتوون‌و هـەر بەهـەمان جۆر ئاژەلانیش، هەروەها مرۆڤ:

﴿سبحان الذي خلق الأزواج كلها مما تنبت الأرض ومن أنفسهم ومما لا يعلمـــون﴾ يس/٣٦.

واتە: پاکە زاتێك کە هەموو جوتێکی (نێرو مێ، چ مرۆڤ چ گوڵ‌و گیـا، چ زەڕراتـی موسبەت‌و مەنفی‌و ئەتۆم‌و هەستەی ئـەتۆم‌و ئەلەکترۆنـەکانی) خولقـاندووە، چ لـەوەی لـە زەوی دەیڕوێنێ‌و چ لە خۆیان‌و چ شتگەلێ کە نایزانن‌و ناینـاسن.

لە زەویشدا هەمان ڕەگەز هەیـە کـە خـۆری لێ پێکـهاتووە،و هـەموو ئەسـتێرەکانی تری لێ پێکهاتووە، گەردوونیش بـە هـەموو ڕەگەزەکانییـەوە لـە ڕەگـەزە سـەرەکییەکانی پرۆتۆن‌و ئـەلکترۆن پێـك هـاتووە، نیترۆنـەکانیش وەك بارگـەی کارەبـایی مامنـاوەندی لـە ناوکی هەندێك ڕەگەزدا هەن.

ج– لەم گەردوونەدا هـێز هەیـەو کـانی‌و سـەرچاوەی هـێز هەیـە، کەچـەندان یاسـا، کـاری لەسـەر دەکـەن. ئەگـەر سـەرنجێکی ورد بـدەی ئـەوا وردترین ماناکـانی هاوکـاری‌و یەکێتیت لە نێوان ئەم هێزو یاسایانەدا بۆ دەردەکەوێت، بۆ نموونە:

لە سەرچاوەکانی هێز وتوانای ئەم گەردوونەدا: ڕووناکی،و گەرمی‌و تیشکی سینی‌و تیشکی لاسـلکی‌و تیشـکی وەنەوشـەیی‌و تیشـکی ژێـر سـوور هـەن، ئـەم هێزانـە هـەمووی

دەگەڕێنەوە بۆیەك شت، ئەویش ئەو هێزە کارەباییــە موگناتیسییەیە کـە هــەموویان یـەك تیژیان هەیە، جیاوازییەکەیان تەنیا لە شەپۆلەکانیان دایە.

هەروەها لە یاساکانی ئەم گەردوونە، یاسای کێشندەیە کــە لـە بچووکـترین گـەردی گەردوونەوە تا گەورەترین ھەسارەکان کاری لەسەریان هەیە، دەقەکەشی ئەوەیە: (هەموو شتێك بارستاییەکی هەیە، شتەکانی تر رادەکێشێ کە بارستاییان هەیە، هـێزی کێشـندەی نێوانیشیان بە شێوەیەکی راستەوانە زیاد ئەبێ بە زیاد بوونی هــەردوو بارسـتاییەکە، ئـەوا هێز بە شێوەیەکی پێچەوانە دەگونجێ لەگەڵ چوارگۆشەی دووری نێوانیان).

ئێستا زانیمان کە هێز دوو جۆرە: هـێزی موگناتیسـی کارەبـایی‌و هـێزی کێشـندە، هەردووکیشیان بۆ یەك سەرچاوە دەگەڕێنەوە.

ئەنیشتاین دەڵێ: گیانی تیۆری جیهان ئەوە هەڵناگرێ کە لە گەردووندا دوو شـێوە هێزی بە یەك نەگەیشتوو هەبن: شێوەیەکیان بۆ کێشندەی پێوانــەیی،و شـێوەکەی تریـش بۆ موگناتیسی کارەبایی.

د- ئەم دوو چیرۆکەش بەڵگەن لەسەر هاوکـاری‌و وێکچوونیـان‌و بەڵگـەی ئـەوەمان دەدەنێ کە گەردوون یەکێتییەکی تەواوی تێدایە:-

یەکەم: جیاوازی رەگــەزە سـەرەکییەکانی گـەردوون شـوێنەوارێکی لـە بـەرەنجامی جیـاوازی ژمــارەی ئەلــەکترۆن‌و پرۆتۆنەکانییــەوە دروســت بــووە، کێشــی گـــەردییش شوێنەوارێکە لە شوێنەواری ئەم ژمارانــە، تایبەتمـەندێتی هـەر رەگـەزێکیش شـوێنەوارێکی ئەم ژمارانەیە، بۆیە زانای روسی "مەندەلیف" توانی رەگەزەکان بە پێی کێشی گەردییان پۆلـێن بکـات، لەسـەر ئـەم بنچینەیــەش خشــتەیەکی بــۆ ســاز کــردن، جــا رێکخســتنی رەگەزەکانی لەم خشتەیەدا پلەدار کردبوو بە پێی یاسـای خـول کـە ئـەو رەگەزانـە رامـی بوون، بە جۆرێکی وا پەیژەیەکی پلەپلەیی سەرکەوتوو پێکبهێنن، بەڵام مەندەلیف تووشی بۆشاییەك هات وەك ئەو بۆشاییەی باسی دەکەین لە نێوان مەریخ‌و موشتەریدا.

بینی کە پلەی پەیژەی خولو سوڕانەوەی رەگەزەکان راستەوانە دەبنەوە بـە دوای یەکدا بێ بۆشایی، تەنیا لە سێ رەگەزدا نەبێت، یاخود دەبێ ئەم یاسای خولـە راسـتەوانە نـەبێتو بـەم جۆرەش راسـت دەرنـەچێ، یـاخود دەبێـت راسـت بێـتو راسـتەوانە بێـت، ئەوساش دەبێت ئەم رەگەزە وردانە لە هەمان پلەی بۆشاییدابن، مەندەلیف دڵنیـا بـوو لـە راستی یاسای خولو سوڕانەوەکەی، بۆیـە هـەوڵیدا جـەخت لەسـەر ئـەوە بکـات ئـەم سـێ رەگەزە ونە هەر دەبێ لەسەر زەویدا هەبن، بەڵکو توانی لەسەر بنەمای کێشی گەردی کە لە پلە بۆشەکاندا دێت دەستنیشانی هەموو تایبەتمەندییە کیمیاوییەکانی بکات کە هەیانـە وەك ئەوەی بینیبێتی، مەندەلیف پێش ئەوەی بمرێ راستی بـیردۆزە زانسـتییەکەی خۆی بینی.ئیدی زاناکان رەگــەزە ونـەکانیان دۆزییـەوە بـە هـەموو تایبەتمەندییەکانیانـەوە وەك ئەوەی مەندەلیف دەستنیشانی کردبوون.

دووەم: نزیکترین ئەسـتێرە لـە خـۆرەوە عـەتاردەو دوورییەکـەی ٣٦ ملیـۆن میلـە، ئەنجا زوهرە دێتو ناوەندی دوورییەکەی ٦٧ ملیۆنو پاشان زەوی ٩٣ ملیۆنو مەریخ ١٤٢ ملیـۆنو موشـتەری ٤٨٤ ملیـۆنو پاشـان زوحـەل ٨٨٧ ملیـۆنو ئۆرانـۆس ١٧٨٢ ملیـۆنو پاشان نیبتۆن ٢٧٩٢ ملیۆن میلن، بەلامانەوە گرنگە رێژەی ئـەم ژمارانـەدا بزانـین چونکـە دووری ئەم ئەستێرە گەڕۆکانە لە خۆرەوە بـە پـێی رێـژەی پێوانـەو راسـتەوانەیە کـە بـە پێی ٩ پلە دێت: یەکەم سفرە، پاشان هەشت ژمارەی بە دوادا دێـت کـە لـە ژمـارە سـێ دەست پێ دەکات پاشان بە شێوەیەکی دووهێندەیی پێ زیاد دەکـات بـەم جـۆرە (٣-٦-١٢-٢٤-٤٨-٩٦-١٩٢-٣٨٤).

جا گەر بۆ هەر یەکێکیان ژمارە (٤) زیاد بکـرێو پاشـان ئـەنجامی کۆ کردنەوەکـە جـارانی (٩) ملیـۆن میـل بکرێـت، ئـەوا رێـژەی دووری هەسـارە گەڕۆکـەکان لـە شـوێنگای ژمارەکان دەردەکەوێ بۆ خۆر؛ یاخود بە زیاد کردنی (٤) بۆ هەر پلەیـەك ئـەوا (٩) پلەکـە بەم جۆرە دەردەچێت: (٤-٧-١٠-١٦-٢٨-٥٢-١٠٠-١٩٦-٣٨٨). جا گـەر ژمارەکـانی ئەم پلانە وەرگرینو هەریەکەیان لەگەڵ (٩) ملیۆندا جاران بکەین، ئەوا دووری گـەڕۆکیمان بۆ دەردەکەوێت کە لە پلەی ئـەو ژمارەیەدایـە لـە خـۆرەوە؛ بـۆ نموونـە عـەتارد نـاوەندی

دوورییەکەی لە خۆرەوە ٣٦ ملیـۆن میلـە، لـە کـاتێکدا کـە شـوێنگاکەی لـە دوورییەکـەیدا یەکەمە، بۆیە ژمارە (٤) وەردەگرێت، جا گەر ٤×٩ بکەین ئەوا ئەنجامی لێکدانەکە دەبێتە ٣٦ ملیۆن میل، ئا بەم جۆرە رێژەکە دەگۆڕێت بە پێی دووری هەر گەڕۆکێك لـە خـۆرەوە لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی کەمدا.

بەڵام بینرا کە شوێنگای ژمارە (٢٨) هیچ هەسـارەیەکی تێـدا نیـە، بـەڵکو لـە دوای ژمارە (١٦)ەوە دێت کە هاوەڵەکەی مەریخە، ژمارە (٥٢)ش کـە هاوەڵەکـەی موشـتەرییە، ئەی دەبێت نهێنی ئەم بۆشاییە چـی بێـت؟ یـان دەبێـت ئـەو رێژەیـەی کـە دۆزراوەتـەوە راستەوانە نەبێت، یان دەبێت ئەستێرەیەکی نـەبینراو هـەبێت لـە پلـەی ژمـارە (٢٨)دا لـە دووری ٢٥٢ ملیۆن میل لە خۆرەوە، یان لە نێوان مەریخو موشـتەریدا، لـەم دواییـەدا ئـەم شتەیان دۆزییـەوە کـە هـەر دەبـوو وابـێ، بـەڵام ئەستێرەیەکی گـەورە نـەبوو؛ بـەڵکو زۆر ئەستێرەی گچکەیان بینیەوە کە هەموویان لەو بۆشاییەدا دەخولێنەوە کە باس کـراو لـە نێـوان مـەریخو موشـتەریدا، یـاخود لـە هـەمان پلـەدا کـە لەپێشـدا بەشــێوەیەکی بــەتاڵ حیسابیان بۆ کردبوو، وەك ئەوەی ئەستێرەیەك بووبێتو تێکشکابێت.

ئەم دوو بەسەرهاتە وێکچووە لە دوو باسی جیاوازدا، هەر یەکەیان ئـەوی تـر تـەواو دەکـات تـا ئـەو هەسـتەت لا تـەواو بکـەن؛ بـەوەی : هـەر یـەك دروسـتکەریان هەیـە کـە یاساکانی ئەم بوونەی هێناوەتە گۆڕێو رەگەزو بەشو هەمەکییەکانی خوڵقاندووە.

هـ- ئەسـتێرەکانیش بەسـەرهاتی خۆیـان هەیـە: مـرۆڤ شـتێکی لەمـەڕ شـــوێنگای ئەستێرەکانەوە زانیوەو بۆی دەرکەوتووە پێوانەیەکی جێگیریان هەیە بە پـێی رووناکیو ژمارەیان، لە پێشدا تەنیا شەش پێوانەیان هەژماردو ئیدی وەستان، پاشان هێـدی هێـدی هی نوێتریان دۆزییەوە هەتا گەیشتنە پێوانەی بیستەم، پاشان بۆ پێوانـەی بیسـتو یـەك، سەیریش لەم پێوانانە ئەوەیە کە بە شێوەی بەرز بوونەوەو نـزم بوونـەوە دەڕۆن، هـەندێ جار بە پێی ژمارەی ئەستێرەکانە، هەندێ جاری تریش بە پێی تیـنی تیشـکەکەیانە، بـە شێوەیەکی زۆر سەیرە کە لە ژمارەی ئەستێرەکان دەردەکرێ، ئیدی لە پێوانەیەکـەوە بـۆ پێوانەیەکی دی زیاد دەکات، ژمارەی ئەستێرەکانی پێوانەی یەکەم (١٤) ئەستێرە دەبـن،

ئیدی زیاد دەکات تا لە پلەی بیستەمدا دەگاتە (٧٦) ملیۆن ئەستێرە، لە پێوانەی بیستو یەکیشدا دەبێتە (٢) ملیار ئەستێرە، بەڵام لـە هـێزی رووناکییـاندا ئـەوە بیـنراوە کـە ئـەو پێوانانە بە شێوەیەکی راستەوانە زیاد دەکەن لە پێوانەی یەکەمــەوە تـا پێوانـەی دەیـەم، جا هەر چەندێك ژمارەی ئەستێرەکان زیاتر بێت لە پێوانەیەکدا ئەوا هێزی رووناکییەکـەش زیاتر ئەبێت. بەڵام لە پێوانەی دەیەمدا پێچەوانە ئەبێتەوەو رووناکییەکە دەست ئەکات بە کز بوون.

و- لـەرووەکانی ئـەم یەکێتییـە لـە گـەردووندا پـەیوەندی کـردن (إتصـــال)ی ئاسۆ(أفق-ئاست)ی (رووەك)ە بە ئاسۆی ئاژەڵەوە،و پەیوەندی کردنی ئاسۆی ئاژەڵانە بە هی مرۆڤەوە، لە رووەکدا پلەیەك دەبینیتەوە لە نزمەوە بۆ بەرز لەگـەڵ وێکچوونێکـدا، تـا دەبینیت کە بەرزترین ئاسۆی رووەك پەیوەستە بە نزمترین ئاسۆی ئاژەڵانـەوە، بـەرزترین ئاسۆی ئـاژەڵیش پـەیوەندداره -جـۆری پـەیوەندی- بـە ئاسـۆی مرۆڤـەوە، تـا کەسـانی هەژمارکـەر گەیشـتنە ئـەوەی کـە لـە تـۆوی یەکەمـەوە گەشـەو پێشـکەوتن روویـداوەو تـا زیندەوەران گەیشتوون بـەم بـارەی ئێسـتایان. ئێمـەش ئـەم بیردۆزەمـان تـاووتوێ کـردو پووچیمان دەرخست لە دیاردەی ژیاندا، بەڵام باس کردنی لێرەدا بەڵگەی ئەوە دەگەیـەنێ کە روونمان کردەوە بەوەی زیندەوەرانی ئەم گەردوونەو بەرز بوونـەوەیان یـەك پارچەیـەو بەڵگەیە لەسەر بوونی یـەك دروست کـار، کـە بـە جۆرەهـا رەگـەزو شـێوە خولقـاندوونی، هەندێکیشیانی لە هەندێکیان بەرزتر کردۆتەوە.

﴿وما من دابة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم﴾ الأنعام/٣٨.

واتە: و هیچ جوڵەندەو جفۆکێك لە زەویدا نیەو هیچ باڵندەیەك نیە کـە بـە دوو بـاڵ بفڕێ و، مەگەر جگە لەوەی ئەوانیش ئومەتگەلێکن وەك ئێوە.

ز-و لە رووەکـانی یـەکێتی لـە گـەردووندا ئەوەیـە کـە مـاددە هـەمووی لـە نـورو رووناکین، چونکە رەگەزەکانی ماددە هەموو دەبرێتەوە سـەر گـەردو کارەبـا، ئـەم گـەردو کارەبایانەش لەت دەبن‌و دەگێڕدرێنەوە بۆ تیشك.

ح-و لە ڕووەکانی یەکێتیی ئەوەیە کە کۆرپەی ئاژەڵو مرۆڤ لە مانگەکانی هەڵگرتنی یەکەمیاندا زۆر بە یەك دەچن، هەر لەم بەیەکچوونەش گیانەوەرە جۆراو جۆرەکان دەردەچن.

❁❁❁

ئەم دیاردانە هەموو بەڵگەن لەسەر بوونی هاوکاریو ڕێك خستن، جا گەر دیاردەی تەواوکارێتی بۆ زیاد بکەین ئەوا بێگومان زاتێك دەبینین، بە یەك زانستو یەك ئیرادەو یەك هێزو تواناوە، کە بەدیهێنەری هەموو ئەمانەیە.

بەڵام سەبارەت ئەوەی کە بۆچی ئەم گەردوونەو یەکێتییەکەی ناویمان بۆ بەدیهێنەر گێڕایەوە؟و بۆچی گێڕامانەوە بۆ پەروەردگارێکی تاكو تەنیا؟ ئەوا وەڵامەکەت لەم سێ بەشەی داهاتوودا بۆ دەردەکەوێ:

(هۆکارێتیی، سروشت، یەکتاپەرستیی)

ئەم سێ بەشەش لە کتێبی "الوجود الحق"ی دکتۆر حەسەن هوەیدی وەرگیراوە.

# هۆكاریتیی

لەوكاتەوەی كە مرۆڤ جیا كراوەتـەوەو ڕێزدار كـراوە بـە بەخشـینی درك كـردن‌و داگیرسانی تیشكی ژیریی بەسەر بووندا، لەو كاتـەوە تـا ئێسـتا لەسـەرەتاو كۆتـایی خـۆی ئەپرسێت، دەپرسیٚ لـەكوێوە هـاتووەو بـۆ كـویٚ دەچیٚ، یەكسـەر واش بیردەكاتـەوە كـە هاتنی ڕاستەوخۆی بۆ ئـەم دنیایـە لـە ڕەحمـی دایكیـەوە بـووە، یـان لـە نوتفـەی بـاوكی، یەكسەر بەم چاو پیاخشاندنە رووكەشیە نزیكە باوەڕ ناكات، بیٚ ئـەوەی تەماشـای یەكـەم سەرەتا نەكات‌و لەو هۆیە سەرەكیە نەكۆڵێتەوە كە هەموو هۆیەكانی بۆ دەگەڕێتەوە.

جا لەبەر بوونی ئەم پاڵنەرە قوڵە لە ناو دەروونی مرۆڤایەتیدا، كە لەگەڵیدا لـەدایك بووەو هێشتاش لەگەڵیەتی، ئـەوا وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە كەسـانی پـەیوەندی داری بەخۆیـەوە خـەریك كـردووە. ئێـدی حوكمـی جۆراوجـۆر سـەریان هـەڵداو بـیردۆزی روون كردنەوە دەركەوتن، كە تیایاندا هەیە هەڵەیەو تیاشیاندا هەیە ڕاستە. بـەڵام ئێمـە كـاتێك تەماشای ئەوە بكەین كە لە ئاسمان‌و زەمیندا لەبەردەسـتماندایە، ئـەوا بـۆ نموونـە بومـان دەردەكەویٚ : باران لە ئاسمانەوە دەبارێت،بـەرووبوومیش لـە درەختـەوە شـین دەبێـت، درەختیـش بـە ئـاوو خـاك دەڕویٚ، ئـاویش لـە دوو ڕەگـەزی ئۆكسـجین‌و هیدرۆجـین پێكدیٚ،مرۆڤیش لەو كاتەوەی كە چاوی كردووەتەوە بە بووندا، هیچ ڕووداوێكی بیٚ خاوەن نەبینیوەتەوە، یـاخود شـتێك دۆزرابێتـەوە بـیٚ بوونـی دۆزەرەوە، بـە جۆرێـك ئـەم واتایـە پەرچڤە بووە ـ بە حوكمی واقیعێكی زاڵ ـ كە ژیریی پێچەوانەی ئەمـە وەرنـاگریٚ‌و بێجگـە

لەمە بەشتی تر دڵنیا نابێت، تـەنیا عـەقڵێكی نـەخۆش لـەم راستیە هـەڵدێ وەك كەسانی یاخیگەر، یان عەقڵێكی كـەمو كـورت وەك هـی منـداڵ نـەبێت كـە شوشـەیەك دەشـكێنیٌو پاشان دەڵێت بۆ خۆی شكا،بەسەرهاتی ئەو بیابان نشینە عەرەبەمان بیستووە كە بەهۆی فیترەی پاكژیەوە ئەم یاسـای هۆكارێتیـەی بـۆ دەركـەوتووە كـە دەڵێـت:(پشـقل بەڵگەیـە لەسەر بوونی حوشتر،شـوێن پێـش بەڵگەیـە لەسـەر رۆیشـتن، شـەوی تـارو رۆژی روونـاكو ئاسمانو بورجەكانی، ئایا بەڵگە نین لەسەر بەدیهێنەرێكی شارەزاو كارامە؟).

لەبەر بوونـی ئـەم واقیعـە راشـكاوانەو درك كردنـە زاڵـەدا، وهەمیشـە تێپـەر بوونـی رووداو وكارەساتەكان بەپـێی ئەم یاسایە، ئەوا ئەم پرێنسیپە ئاشكراو روونە لـــە كتێبـە فەلسەفیەكاندا بە(پرێنسیپی هۆكارێتی)ناو زەد كـراوە، ئەمـەش یەكـەم بنـەمای عەقڵێكـە بیگەیەنێتە مەعریفەی تەواو، چونكە بنەڕەتی حوكمە ژیریەكانو دادگا لۆجیكیەكانە، گـەر سەرنجی وشەكانت بدەیت كـە بـەیانیانو ئێـواران لەگـەڵ خـەڵكیدا پـێی دەدوێیـتو ئـەو حوكمانەی كە كاروباری ژیانتی پێ رێك دەخەیت، ئەوا دەبینیت كە لـە هیـچ قۆنـاغێك لـە قۆناغەكانیدا لە پشت بەستن بـە بنـەمای هۆكـارێتی خـاڵی نیـە. كەواتـە ئـەو وتەیـەی كـە دەڵێت: (دەبێت هەموو رووداوێك رووداو سـازێكی هـەبێت) شـتێكی بـێ گومـانو یـەقینیو تەواوە-وژیریی بەتەنیا بڕوای پێ دەكات، ئیدی مەحاڵە هیچ رووداوێك لـە خـۆڕا روو بـدات، یان شتێك بێ بەدیهێنەر بێتە بوون، قورئانیش ئەم ئاماژەیەی تێدایە:

﴿أم خلقوا من غير شئ أم هم الخالقون﴾ الطور /٣٥.

واتە: ئایا ئەمانە بێ هۆ بەدی هاتوون؟ یا خۆیان خولقێنەری خۆیانن.

بەپێی ئەم رێسایە دەڵێین:ئـەم جیهانـەمان لـە زەوی وشـاخو درەخـتو ئـاژەڵو ئەستێرەو خـۆرەوە ... پێك دێـت، دەبێـت كارسـازو بەدیهێنـەرێكی هـەبێت، ئـەم رووداوە پشكیی ولاوەكییە زۆرانەش بە هۆی هۆكارەوە هاتوونەتە گۆڕێ، ئـەم هۆیانـەش بـە هـۆی هۆكاری ترەوە هاتوونەتە ئاراوە كـە كـەمترن لـە هۆكارەكـانی پێـش خۆیـان، دەبێـت لـە ئەنجامدا بگەینە ئەوەی كە هۆی هـەموو ئـەم هۆكارانـەو بـەرپا كـاریی هـەموو ئـەم رووداو وبووانە چییـە؟ چونكـە هەرچـەندێك ئێمـە بگەڕێینـەوە بـۆ ئـەو سـەرچاوانەی هۆكارەكـانی لێوەهاتوون، ئەوا فاكتەری پاڵنەرەكان كەمتر ئەبنەوە، تا لـە كۆتـاییدا دەگەینـە یـەك هـۆ

ساز، وەك ئەوەی تەماشای لقە زۆرو بەیەکا چووەکـانی درەخـت دەکـەین، هەرچـەندێك لـە هۆکارەکەی بکۆڵینەوە ئەوا لەزۆرەوە دەگەینە سەر کەم، تا دەگەینە سەر قەدەکەی، لەم بارەیشەوە نموونەی تر زۆر هەن، کـە زۆر ئاشـکران‌و پێویسـت بەلەسـەر وەسـتانی درێـژو نموونە هێنانەوە ناکات.

کەواتە نکوڵی کردنی کارلێکراوەکان بۆ کارلێکەر، ولەبەدیهێنراوەوە بۆ بەدیهێنـەر، لەگەڵ ژیریدا پێچەوانە دەبێتەوە، وبە هەڵەدا چوون دادەنرێت، بۆ ئەم ئیلزامە مەنتیقیـەی کە ناتوانین لێی هەڵبێین (ئیبن سینا) ناوی ناوە بە(واجب الوجود) وەك ڕێزێـك بـۆ ئـەوەی کە ژیری بپارێزێ لە تێهـەڵکێش بـوون‌و نـاکۆکی‌و دژایـەتی، یـان نـەفامی‌و گێژیـی،چونکـە مەحاڵە لە نەبوون‌و عەدەمەوە بوون بێتە دی.

هەرچەندیشە ئەمە بکرێتـە بـاوەڕو زۆر بـاس بکرێـت‌و لـە بـەرگی بەڵگـە نەویسـتاندا بخرێتە ڕوو، کە پوچەڵ نەکرێتەوە، ئەوا ئەم حەقە هـەر پوچـەڵ نابێتـەوە، چونکـە عـەقڵ دەیخوێنێتەوەو واقیعیش پشتیوانیەتی، ئەمە تەنیا لای کەسـانێکەوە دروست دەبێـت کـە نکوڵی بکەن، و خۆبەگەورە بزانن‌و شتە کۆنەکان ڕەفز بکەنـەوە، یـان مافـە بـێ خـەوش‌و ڕەواکانی ژیریی پێشێل بکەن، یان شوێن ئارەزووی چەوت‌و چەوێڵ بکەون، وەك نموونـەی کەللە ڕەق‌و نەخۆش‌و لەخۆبایی بووان.

ڕەنگـە یـەکێك بڵێـت: سـازێنەری ئـەم ڕووداوو بووانـە سروشـتە! ئـەوا باسـیش لـە سروشت دەکەین، یان یەکێکی تر بڵێت ئەگەر دانمان بە بەبوونی بەدیهێنەردا نا، ئـەوا کـێ ئەو بەدیهێنەرەی هێناوەتە بوون؟ ئەوا لەمەش ئەدوێین[٢].

ئەوەی کە ئێستا ئەمانەوێ بە پوخت‌و ئاشـکرایی لێی بدوێـین ئەوەیـە کـە: هـەموو ڕووداوێك دەبێت ڕووداو سازێکی هەبێت،کەواتە دەبێت ئەم گێتـی وجیهانـە بەدیهێنـەرێکی هەبێت.

---

[٢] لەبەر ئەوەی لەدیاردەی یەکەم لێی دواین، بۆیە وتەی مامۆستا لەم بارەوە لا ئەدەین‌و باسی ناکەین.

لێرەوە هەندێك لە رەخنەگران كێشەی كۆنو نوێی رووداني گەردوون دەهروژێنین، ئەم رێسایە كاتێك راست دەبێت كە بڕوامان بەوە هەبێت ئەم جیهانە نوێ یـە، یـان بـووەو كۆن نیە؟

ئێمەش دەڵێین: بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە كە جیـهان نـوێ یـە وكـۆن نیـە، ئیمـامی غەزالی بەپێی تێبینی كردنی جوڵانو وەسـتان دەڵێـت: سـوڕێك لەگـەردوون، یـان جووتـە یاخود تاك، ئەگەر جووت بێت ئەوا ژمارەیەكی تاك تەواو دەكات، ئەگەر تاكیش بێـت ئـەوا ژمارەیەكی جووتی تەواو كـردووە،كەواتـە ژمـارەی پێشـوو لـە هـەروو حاڵەتەكـەدا دیـاری كراون، مادامیش دیاری كراون كەواتە بە شێوەیەكی بـڕاوەو كۆتـایی هـاتوو بەدیـهێنراوە.. جا گەر رەخنە گر هەر بەردەوام بوو گوتی: سەرچاوەی جیهان (هیۆلا)و كۆنــە، جوڵـەش لە ناكاو بووە، ئێمەش لە وەڵامدا پێی دەڵێین: لە كوێوە ئــەم جوڵەیـەی هێنـا؟ ئەمەش دا ئەنرێت بە دان پیانانێكی راشكاوانە لەسەر ئەوەی كە (بەسەرادراو ـ مرجح) ێكی تر كـاری لە جیهان كردووە بە دۆزینەوەی جوڵە بۆی، بەڵكو ئەمە پەلەكردنێكی روونو راشكاوە بـۆ دان نان بە بوونی بەدیهێنەری ئەم جیهانەدا كەواتە رەخنە گرەكە لە نێوان دوو شت دایـە: یان دەبێت بگەڕێتەوە بۆ قسەكەمان؛ بەوەی كە بەدیهاتووە بە هــۆی بەدیهێنـەرەوە، یـان دەبێت دان بە بوونی (بەسەرادەر ـ مرجح)ێكدا بنێتو ئەمـەش دان نانـە بـە بەدیهێنـەردا، كەواتە رەخنەی رەخنەگران هیچەو نەگەیشتوەتە پلەی چەسپانو تەواویو گونجـان، ئـەو وتەیەش كــە دەڵێـت جیـهان كۆنـە، شـتێكی پووچـەو پشـت بـە راسـتی نابەسـتێت[٣]، بـەم جۆرەش (ماددیی جەدەلیی) هـەرەس دێنێـت كـە دان بـە كۆنـی جیـهاندا بنێـت، ئەمـەش لەبەر هەڵهاتنــە لـەوەی كـە دان بـە بوونـی بەدیهێنـەری جیـهاندا نـەنێت، بـێ بوونـی هیـچ بەڵگەیەكی پەیوەستدارو یەكلاكەرەوە!.

---

[٣] بەڵكو هەموو بەڵگە گشتیيەكان پشتیوانی گوتەی رووداني جیهان دەكەن، وەك لە یەكەم دیاردەدا لێی دواین.

رەنگە لات سەیر بێ كە چۆن وا بە زوویی ئەم رایە هەرەسی هێنا، لە وەڵامدا دەڵێم: بەستن و گرێیەك لە یاسا ئەگەر لە سەد دەنك پێكهاتبێ، ئەوا كەمرەوی لە هیچیاندا ناكەین بە سڕینەوەی یەكەم گرێ، ئەگەر ئەمەش نەگوترابێت، ئەوا لە ماددیی جەدەلیی هەموو ئەوانە لابە كەلەسەر بنەمای (كۆنی جیهان) بنیاتنراون لە حوكمەكانیدا، ئەوا یەكەم حوكم لەحوكمە سەرەكیەكانی كە تێیدا پوچ دەبێتەوە بێباوەڕییانە بە بوونی بەدیهێنەر. لە كاتی گوتنی گوتەی بەدیهێنەری بوونیشدا؛ حوكمی تر سەر هەڵئەدەن كە حوكمە لقیی و پشكییەكانی تر پوچەڵ دەكەنەوە وەك لەمەودوا دەیبینین، بۆ ئەوەی باسەكەش لە لقە تایبەتییەكان بدوێ، بەڵكو دەرخستنی راستی لە سەرچاوەكەدا بە شێوەیەكی هەڵەشەیی هەموو پوچگەرییە لقییەكان وەلا دەنێت.

# سروشت

دوای ئەوەی بێگومان بوویت لە بوونی بەدیهێنەری یەکەم، کە زاتێکی تەواوی رەهایە، پرسیار کردنیش لە بارەی بەدیهێنەرێکی کامڵی رەها راست نیە،و ئەو گومانانەت لە بەردەمدا رەوینەوە.ئەوا گومانێك دەمێنێتەوە کە؛ بەگومانی سەردەم ناوی دەبەن‌و بە گومڕاییەك لە گومڕاییەکان دائەنرێت ئەویش ـ وەك دەرئەکەوێت ـ دروستکراوێکە وەك دروستکراوەکان، باڵی کێشاوە بەسەر خەونەکاندا وەکو خەیاڵ، بەڵام بە داخەوە کە ئەمە هێنراوەتە ئاراوەو پشت بە هیچ بنەمایەك نابەستێت دەبینین زاڵ بووە بەسەر بیری زۆر لەوانەی خۆیان بە رۆشنبیرو خاوەن مەعریفە دەزانن، لە کاتێکیشدا ئەمە دەڵێن بواریان بە خۆیان نەداوە کە نارەحەتی لێکۆڵینەوەو بە دواداچوون ببینن، ئەم گومانەش سروشتە. کەوای دائەنێت خوای دانراوی ئەم سەردەمەیە.

کاتێك بە یەکێك لەم سروشتییانە بڵێین: کێ ئاسمانەکان‌و زەمینی بەدیهێناوە؟ پێت دەڵێت: سروشت.

گەر پێی بڵێی کێ رووەك‌و ئاژەڵی بەدیهێناوە؟ دەڵێت: سروشت.

گەر پێشی بڵێی کێ مرۆڤی بەدیهێناوە؟ هەردەڵێت: سروشت.

کێ ئەم هەموو کاروباری گەردون‌و زیندەگی‌و غەریزییانە رادەپەڕێنێت بەو پەڕی حسابێکی وردو رێسایەکی بێ سنورەوە؟ ئەوا هەر دەڵێت سروشت.

کاتێك پەنا بۆ ئەم وتانە دەبەن کە ناتوانن پێت بڵێن بۆ خۆی بەدیهاتووە، یا لە خۆیەوە بەدیهاتووە، نکۆڵی یاسای هۆکارێتیش دەکەن، ئەمە راست دەکات کاتێك دان بە

هۆدادەنێ و، هەڵـەش دەكـات كـاتێك هۆسـاز لـە يـاد دەكـات، كـاری ئێمـەش لـەم لێكۆڵینەوەیەدا تەنیا بە نەفام دانانو دزێو كردن نیە، بەڵكو ئێمـە لـە هـەموو رووەكانـەوە گفتوگۆ لەسەر باسەكان دەكەین، ئەوەی حەق بێـت دانـی پیـا دەنێـین، ئـەوەش پوچـەڵی بێـت پشـت گـوێی دەخـەین، مرۆڤـی ژیریـش ئەوەیـە گـوێ لـە هـاواری ژیریـی دەگرێـت، نەفامیش ئەوەیە شوێن ئارەزووەكانی دەكەوێت، هەر لەسـەر گـەندەڵی بـەردەوام دەبێـت ئەگەر حەقیشی بۆ روون بێتەوە.

كەواتە سروشت چییە؟ مەفهومەكانی چین؟ حەقیقەتی كاریگەرییەكانی چین؟.

لە زماندا سروشت مانـای: رەوشـتو ئاكـارو سـیفەتو خولقـەت دەگەیـەنێ. بـەڵام ئێستا لە بیری خەڵكدا بە پێی جیاوازیان دوو بۆچوونو تێگەیشتن دەگەیەنێ:-

**مەفهومی یەكەم**: بریتییە لـە خـودی شـتەكان بـەو واتایـەی بـێ گیـانو رووەكو ئـاژەڵ؛ هـەر یـەك لـەم بوونەوەرانـە سروشـتن. ئەمـەش مەفـهومێكی ورد نیـە، حوكمێكـی راستیش نیە وەك لەمەولا بۆمان دەرئەكەوێت.

**مەفهومی دووەم**: بریتییە لە سیفەتو تایبەتمەندێتی شتەكان؛ ئەم سیفەتانە: هەر لە گەرمیو ساردیو شێ و وشكاییو لووسیو نەرمیو زبری، ئـەم توانایانـەش: لـە جوڵـەو وەستان،و گەشەو خواردن، جووت بوونو لە دایك بوون، هەموو ئەم سیفاتو ئامادەگیانـە بریتین لە: سروشت.

جـا گـەر یەكـەم وتـنـــە یـاخود دووەم تـەعبیر لـە سروشـــت بكـات بـە شـێوە راستەكەی، ئەوا لەمەدا چیمان لە حەق بۆ دەردەكەوێ؟.

سەبارەت وتەی یەكەم: -سـەبارەت دروسـت بوونـی بوونـەوەران- سروشـت لـەوە دەرەناچێ كە راڤەی ئاو بە ئاو بكات، زەویش زەوی بەدیهێنابێت، ئاسمان ئاسمانی دروست كردبێـت، هـەموو پۆلـەكان یـەكتریان پۆلێـن كردبێـت، شـتەكان خۆیـان دۆزیبێتـەوە، هـەر خۆیان رووداو رووداوو سازبن، لـە یـەك كـاتدا بەدیـهاتووو بەدیهێنـەر بن، جـا لـە راسـتیدا پوچەڵ كردنەوەی ئەم وتەیە ئاشكرایە، ئەمەش یان ئەوەیە كە شتەكان بۆ خۆیان دروست

بوون بێ هیچ هۆیەك ـ ئەمەش بە پێی یاسای هۆکارێتی پووچ کرایەوە— یـان بەدیهێنـەرو بەدیهاتوو لە یەك بووندا بکرێتەوە، جا هۆ بوو بێتە هۆی دەست نیشان کردنـی هۆکارەکـە: ئەمەش شتێکی مەحاڵە، بەڵکو ئەمە دائەنرێت بەو سەرگەردانیو ناتەباییـەی پێویست بـە کات ناکات بۆ شیتەڵ کردنیان.

بەڵام سەبارەت وتەی دووەم: ئەمەش بریتییە لە پشت بەستن بە توانـا (القابلیـة)ی شـتەکانو تایبەتمەندییـەکانیان لـە پێکهاتندا، سـەبارەت ئەمـەش دەڵێـین: لـە راسـتیدا ئەمانەی کە بەدیـهاتووو بوونـەوەران دەگێڕنـەوە بـۆ تواناو تایبەتمەندییـەکانیان، بـە هیـچ دانانرێن جگە لەوەی تەنیا وەسفی ئەو دیاردانە دەکەن، کە سەرچاوەو بنەڕەتیان نـازانن، خۆشیان ماندوو نەکردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکانیان، جـا گـەر وا بکـەن ئـەوا ئـەو توانـا (القابلیـة)یـە کـە پشـتی پـێ دەبەسـتن لـە بەدیـهێنانی شـتەکاندا تراویلکەیـەکی خەڵەتێنـەرەو تینـوو بـە ئـاوی تێدەگـات، کـاتێك دەشـیگاتێ هیـچ نابینێتـەوە، بـۆ روون کردنەوەی ئەمە بە رێگەیەکی زانستیانە ئەم نموونە دێنینەوە:

ئەگـەر تۆوێـك بچێنـینو بیخەینـە زەوییـەوە،و ئـاوی بدەیـن هـەڵدەتۆقێ، پاشـان دەردەچێو چەکەرەو چزووی لێـوە دەردێ، رەگـەکان بـەرەو زەوی دەچـنو لقەکـەش بـۆ سەرەوە، ئەنجا گـەڵاو گـوڵو بـەرووبوم دەدات، ئیـدی تۆوەکـە(بـۆ نموونـە) سـێو بەرهـەم دێنێت.

جا گەر ئـەم توانایـەی لـە تۆوەکـەدا هـەبووەك هـەڵتۆقینو دەرچـوونو چەکـەرە کردنو ... ئەوا گەر ئەم توانا یـەك لـە دوا یەکانـە نەبوونایـە ئـەوا ئـەو دیـاردە زیندووانـە بەرپا نەدەبوون، ئەوساش بەرووبوم بەدی نەدەهات. جا ئێستا با بێین لەسـەر ئـەو تواناو قابیلیاتانە بکۆڵینەوەو راستییەکانیانمان بۆ ئاشکرا ببێت:

ئەگەر تۆوێك هەڵنەتۆقێو نەتەقێتەوە هیچ شتێك پێك نایێت، ئـەی دەبـێ کـێ بـەم کـارە هەسـتابێ؟ ئەگـەر تۆوەکـان عـەقڵو ژیرییـان هەبوایـە ئەوسـا دەمـانگوت: عـەقڵیان ئەوەیان نیشان دانو بۆیان ئامادە کردن، جا ئەگەر بڵێین ئاو هەڵدەستێ بـەم کـارە، ئـەوا

ئەگەر وا بوایە دەیتوانی بە هەمان جۆریش کار لە ئاسن بکات، کەواتە دەبێت کارتێکەرێك هەبێتو قبوڵی کاریگەری ئەو کارلێکەرەش بکەین، ئەگەر ـ وەك جەدەلێك ـ تۆوەکە خۆی هەڵبستێت بەم کارانە، ئەدی بۆچی نەیبەستو نەپووکایەوە لە بری ئەوەی هەڵبتۆقێو گەشە بکات؟ جا بۆ ئەوەی زیاد بوونو مانەوە رووبدات لە رووەکەکەدا، ئەم کارە پێویست بە عەقڵو دەرك كردن دەكات، هەروەها بەرنامەیەکی نەخشە کێشراو لە لایەن ئەو تۆوەوە، لە راستیشدا تۆوەکان خاوەندارێتی هیچ کام لەمانە ناکەن! کەواتە چۆن لە خۆیەوە بەرووبوم دێنێتە دی؟ بەڵکو چۆن ئەو هەموو بەرووبومە جۆراوجۆرانە بەرهەم دێن،و چۆن مەبەستێکی دیاری کراوی تیا چەپاوو پەنهان دراوەو سیفەتی مەبەست دار لە ناوەرۆکی هەموو تۆوێکدا هەیە؟.

لەراستیدا ئەوەی سەرنجی وتەی سروشتییەکان بدات کە پشتیان بە قابلیەتو تواناکان بەستووە: بەوەی رووەك لەسەر ئەوەی مۆرك دار بووە، یان تەقینو روانی تۆو و، لە دایك بوونی خانە، خانەی زیندوو حەز بە دابەش بوون دەکات؛ ئەو کاتە دەزانێت هەموو ئەمانە کرداری نەزانراون (أفعال مبنية للمجهول) چونکە بکەرە راستەقینەکە نەناسراوە، وەك ئەوە وایە کەسی سروشت دۆست چاوی لە هۆکارە راستەقینەکان نوقاندبێت، کردارەکەشی داوەتە پاڵ نەزاندراو بۆ رزگار بوونی خۆی. ئەی کێ بوو تۆوی رواندو چەکەرەی پێ کرد؟ کێ بووە هۆی لە دایك بوونو زۆربوون؟ کێ بوو خانەکانی راهێنا لەسەر دابەش بوون؟ هەموو ئەم راستییانە چاوی کورتی کەسانی سروشتیی پێناگات، بەڵکو کورتیان هەڵهێناوە لە وەسف کردنی رووکەشەکاندا، بێ گەڕانەوە بۆ هۆکانی، بەڵکو زۆر بە هەڵە داچوون کە سیفەتە کارلێك کراوەکە دەکەنە هۆی کاریگەر،و قابیلیەتی کارتێکەر،و دیاردەی نەزانراو هۆکارێکی بەدیهێنان بن، چونکە چەکەرە کردن سیفەتێکە لە ئاکامی هۆکارێکی دەرەکی ئەو شتەوە هاتووە لە وەرگرتنو قبوول کردنی کاریگەرییەکەی ئەو شتەدا. هەروەها گەشەو روانو بەرز بوونەوە هەموو سیفەتن ....

کەسی سروشتی هیچ شتێکی زیاد نەکردووە تەنیا ئەوە نەبێت لەم کۆمەڵە سیفاتانە تێگەیشتنێکی تێکەڵی پێك هێناوە کە ناوی ناوەی بە (قابلیاتی لە دایك بوون‌و گەشە کردن). جا قابلیەتی کردووە بە هۆی بەدیهێنان کەچی خۆی لە راستیدا نیشانەیەك لە نیشانەکانی شتەکانە،و سیفەتی هەڵچوون (الإنفعال) کە هیچ هەست‌و هۆشێکی نیە کردویەتییە هۆیەکی کاریگەری وشیار لە دروست کردنی شتەکاندا! کەواتە کێ بوو سروشتی لەو رەگەزانە پێك هێنا؟و کێ بوو جۆراوجۆریتی بەو مۆرکانە بەخشی؟. گەر تۆوی هەڵوژەو تۆوی قەیسی بخەینە ناو خاکەوە، هەریەکەو جۆرە بەروبوومێکی جیا لەوی تر بەرهەم دێنێت، چ لە رەنگدا، یا لە تامدا، یا لە بۆندا، لە کاتێکدا هەر بە یەك ئاویش ئاو دەدرێت، لەگەڵ ئەوەدا کە هەموومان کۆین لەسەر ئەوەی : تۆوەکان عەقڵیان نیەو درەختەکان سوسە (إدراك)یان نیە، ئەی چۆن رەگەکان ئاو دەمژن؟ و تەنانەت گەردیش دەپاڵێون؟ پاڵ بە شلەمەنیەکانی ناوییەوە دەنێن‌و دەینێرن بۆ بەروبومەکان، ئیدی گیراوەیەك دەردەچێ‌و تامی خۆش دەبەخشێ؟! هەموو ئەمانە وامان لێ دەکەن لە هۆکە بپرسین و، نەك لەسەر شتی نەزانراو بوەستین، نەك تەنیا لەسەر شتی نەزانراو دابمێنین،و تەنیا بە وەسف کردنی رووکەشەوە نەوەستین، تەنانەت نەك دیاردەکان بە هەڵە وەسف بکەین کە گوایە ئەوان هۆی راستەقینەی وەدیهێنانن.و ئێمەش دەزانین کە قابلیەت تەنیا سیفەتێکە لە سیفەتی شتەکان، ئیتر چۆن بەدیدێنێت؟ تۆویش سەبارەت بە رووەك بێ گیانەو هۆش‌و فام ناکاتەوە؛ ئەی جۆراو جۆریەتیەکەی چۆنە؟ جا گەر تێبینی بکەیت ئێمە ناچارین بە پێی ئەم تێڕوانینە بۆ سروشتی شتەکان (طبائع الأشياء) کە دەبێت لە راستی ئەو سروشتە بکۆڵینەوە لەوەش بپرسین کە ئەو شتانەی نەخشاندووە لەسەری؟ و چۆن کاریگەری ئەنوێنێ؟ و ئایا داهێنەرە یان پۆلێن دەکرێ‌و رێك دەخرێ؛ و ئایا بۆ خۆی کارلێکەرە یان کار لە شتانی تر دەکات؟ ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە کەسانی سروشتیی ئێمەیان لە یەك نەزانراوەوە گواستۆتەوە بۆ زۆر نەزانراو، و لەیەك بنەڕەتی گرنگ‌و یەکلاکەرەوەوە بۆ چەندان لقی دیاردەیەك کە یەکلا ناکرێنەوە، لە کاتێکدا ئێمە لە

بەدیهێنەری تۆوو چەکەرەی ناوکەکەی دەپرسین. ئەوا بەو تێڕوانینە کورتەوە(بەبێ ئاگایی) چوینە سەر سیفەتە کارلێکراوەکان کە هیچ تواناو بەشیان لە بەدیهێناندا نیە،و ئەگەر ئـەو کورت بینیە نەبوایە لە لایەن کەسانی سروشتییەوە بۆ ئەم هۆ نامۆ دۆشدامانکەرانە بە بـێ بوونی هیچ بیانویەك، ئەو کاتە وەڵامێکی تێرو تەسـەلو لۆجیکیمـان دەسـت دەکـەوت کـە هاوتا دەبوو لەگەڵ ئەو راستییە زانستیانەدا وەك لەم ئایەتەدا باسیان هاتووە:

﴿إن الله فالق الحب والنوى يخرج الحي من الميت ومخرج الميت من الحي ذلكم الله فأنى تؤفكون﴾ /٩٥.

واتە: بـە هەقیقـەت خـوا لەتکـەری دەنـكو ناوکەیـە، زینـدوو لـە مـردوو دەردێنـێو دەرهێنەری مردووە لەزیندوو، ئەمەیە خوا، جا چلۆنو لە کوێوە بە درۆ خۆتان (لە خوا) لا ئەدەن.

و بەمـەش بۆمـان روون ئەبێتـەوە کـە هـەموو هۆکارەکـان دەگەڕێنـەوە بـۆ یەکـــەم بەدیهێنەرو ئیدی نەزانراوەکان دەزانرێنو باسەکە یەکلا دەبێتەوە.

جا بۆ ئەوەی ئەمە زیاتر روون بکەینەوە، نموونەیەك دێنینەوە. ئەویش جوڵێنـەری ئامێری ئۆتۆمبێلە. چونکە جوڵاندنی بەشەکانی ئامێرو سووتاندنی بەنزین، و هێزی پاڵنـــەر لە بـەرەنجامی تەقینـەوەی نـاوەکیدا، ئـەوا هـەموو ئـەم تایبەتمەندییانـە قابلیـاتو توانـاو مۆرکـن، ئایـا وای دەبیـنی کـە شـیاوێتی سـووتانو تایبەتمـەندێتی تەقینـــەوەو یاســاکانی میکانیك بەدیهێنەری ئامێر بوونو ئۆتۆمبیلیان داهێنا؟ بێگومان[شیاوێتی]مەبەست خـودی شتەکان نیە، هەرچەندە هۆیەکە بۆ پاڵنانی دیاردەکە،و دەرکەوتنی رووەکانی، بەڵام تەنیا لە سنووری رێکخستنو ریزکردندا دەمێنێتەوە، نەك لە سنووری بەدیهێنانو داهێنـاندا، لـە کاتێکدا ئـەو شـتە لەقۆناغـەکانی کۆتاییدایـە نـەك لـە قۆناغـەکانی سـەرەتایی بەدیـهێنانی بووندا، جا ئەگەر کەسێك بیروباوەڕی سروشتی هەبێت بۆ بەدیهێنانو بیەوێت لەو هەڵدێرە خۆی قورتار بکات،و لەگەڵ ئێمەدا دانی نا بەوەی کە ئەم مۆرکانە هۆی لاوەکین لە بـــواری

زۆربوون و جۆراوجۆر بووندا، بەڵام لە راستیدا جۆرێك نیە کە پشتیوانی هۆکان بکـات وەك لە پرەنسیپی هۆکارێتیدا لێی دواین.

ئـەوا پـێی دەڵێـین: گەڕایـەوە سـەر ئـەو بنەڕەتـەی کـە لەمـەوپێش لێی دوایـن‌و چەسپاندمان،و نەشیتوانیوە لە سروشتی هیچ بوونەوەرێکدا هۆی راستەقینەی بوونـی ئـەو شتە لە نەبوونەوە بچەسپێنێ‌و بیسەلمێنێ.

جا گەر ئەتەوێ ئەم بارە دەروونیە لە پێکهێنانی ئەم خوا درۆیینەدا (سروشت) لای هەندێك بزانین، ئەوا لەم زنجیرەیەدا دەیدۆزیتەوە.

مرۆڤێك سیفەتی شتێکی دیاری کـرد، پاشـان سـیفەتەکانی هـەمووی خسـتنە سـەر یەك، ئەنجا لەم کۆمەڵە سیفاتانە مەفهومێکی پێك هێنـا، پاشـان ئـەم مەفهومـەی دانـا بـە قابلیـەت یـان سروشـت، دەروونیـش حـەز بـە پشـووکورتکردنـەوەی دەکـات، ئیـدی ئــەو سروشتەی لـە خەیاڵیدایـە کـردی بـە زاتێکـی سـەربەخۆی کارتێکـەر. بـەم جـۆرە خـەیاڵی مرۆڤایەتی لەسەر ئەمە دەمەیێت، خاوەنەکەشی وای دێت بە خەیاڵدا کە خوای بوونـەوەری دۆزیوەتەوە، ئیدی گوێڕایەڵی دەکات،و گەردن کەچ‌و تەسلیمی ئەبێت، دوای ئەوەی کە بە دەستی خۆی دروستی کردووە، هەروەك چۆن بت پەرستان وا دەکەن، بۆ خۆیان دروسـتی دەکەن پاشان وا دەزانێت سوودو زیانی هەیەو پاشتریش دەیپەرستێ!

زۆر لێکچوون هەیە لە نێوان ئەوانەی بتیـان دەپەرسـت لـە پێشـانداو دەمـەقاڵێیان لەسـەر دەکـرد، لەگـەڵ ئەوانـەی کـە ئـەمڕۆ سروشـت دەپەرسـتن‌و دەمەقاڵێشـی لەسـەر دەکەن، هۆی دەروونی ئەمانە هەر یەکە، جۆری هەڵەکەشیان هەر یەکـە، ئەمـەش بریتییـە لە دروست کردن لە سەرەتاداو پاشان خەیاڵ کردن لەوەی کە کارتێکەری هەیـە، قورئـانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ ئەم فێڵە کردووە لە ئایەتەکانیدا، لەوانە:

﴿ما تعبدون من دونه إلا أسماء سميتموها أنتم وآباؤكم ما أنزل الله بها من سـلطان إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكـن أكـثر النـاس لا يعلمـون﴾ يوسف/٤٠.

واته: ئەم مەعبودانەی کە بێجگە لە خوا ئەیپەرستن، شتێ بێجگە لە ناوگەلێ (بێ ناوەڕۆك)نین کە ئێوەو باووباپیرانتان ناوتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئێوە نازڵ نەکردووە، حوکم و دەستور نیە مەگەر بۆ خوا، فەرمانی داوە بێجگە لەو کەسی تر نەپەرستین، ئەمەیە ئایینی پایەدار، بەڵام زۆربەی خەڵك (بەمە) نازانن.

﴿قالوا أجئتنا لنعبد الله وحده ونذر ما كان يعبد آباؤنا فأتنا بما تعدنا إن كنت من الصادقين، قال قد وقع عليكم من ربكم رجس وغضب أتجادلونني في أسماء سميتموها أنتم وآباؤكم ما نزل الله بها من سلطان فانتظروا إني معكم من المنتظرين﴾ الأعراف/٧٠-٧١.

واته: وتیان: ئایا هاتویە لای ئێمە کە خوای تاقانە بپەرستین و ئەوەی کە باووباپیرانمان دەیانپەرست، تەرکی بکەین؟ جا کەوایە ئەوەی بەڵێنت پێداوین (لە هاتنی بەڵا) بیهێنە، ئەگەر لە راست بێژانی، (هود) وتی: پیسی و غەزەبی پەروەردگارتان ئێوەی داگرتووە، ئایا لەگەڵ مندا لە بابەت نێوگەلێکەوە شەڕە قسەم لەگەڵ دەکەن کە ئێوەو باووباپیرانتان (لەسەر بتەکان) داتاننـاوە، لە حاڵێکدا خوا هیچ فەرمانێکی لە بابەت ئەوانەوە نەناردووە، جا لەبەر ئەمە ئێوە چاوەڕوان بن‌و منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕوان ئەبم.

بڕوانە مرۆڤی پێشین لە چ بوارێکەوە گومڕا بوون، ئەمڕۆش چۆن گومڕا دەبن، ئەم کێشانەش لە سەرەتادا تەنیا چەند ناوێکەو دایان دەنێن، پاشان لە کۆتاییدا وەك حەقیقەتێکی دروست‌و رووداو لێی دەدوێن.

کورتەی قسان لە سەر سروشت ئەوەیە کە: یان شتەکان بۆخۆیان دروست بوون؛ ئەم وتەیەش بە پێی هەموو پێوانەیەك وەلا نراوە.

یان ئەو وتەیەی کە(سیفەت) زات دروست دەکات، ئەمەش زیاتر پوچترەو وەلا دەنرێ لە وتەی یەکەم؛ چونکە گەر زاتی شتێ دەستەوسان بێت لە دروست کردنیدا، چۆن سیفەتەکانی ئەو شتە دروستی دەکەن!

بەلاّم سەبارەت ئەوەی کە شـیاویێتیو قابلیـەت هۆیـەکی پاشـەکییە وەك سـەرجەم هۆیەکانی تر، ئەوا ئاتاجی هۆی یەکەم دەبێو ئەمەش ئەوەیە کە دەیڵێینو مەبەستمانە.

کەواتە لـە هەرسـێ حاڵەتەکـەدا دەبـێ بگەڕێینـەوە بـۆ یەکـەم بەدیهێنـەر، پاشـان سروشتیش زۆر لە دواوە دێت کە بەو، کارلێکراو بووەو پێویستی پێ بووە.

بەم جۆرە دەبینیت کە سروشت–خوای دانراوی ئەم سەردەمە– لەبەردەم رەخنەی لۆجیكو راڤەی زانستیدا خۆی نەگرتووەو تواوەتەوە، سـەبارەت بـە بوونـەوەرانیش تـەنیا سیفاتو شیاویێتیو یاساکان کە لەسەری دەڕۆن شك دەبەن، چونکـە سروشـتیش شـتەکان بەدییان ناهێنێ، کەسێکیش گەر لە زاتێکـی سـەربەخۆیان دەگـەڕێت، داهێنـەرو کارتێکـەر بێت، بەدەر بێت لە سنووری شتەکان، ئەوا بێگومان بە دوای عەنقائی مەغریبیدا گەڕاوە.

# یەکتاپەرستیی

گەر تراویلکەی سروشت لەبەرچاوانتا ڕەویەوەو وای لێهات ئاسۆی زانینی یەکەم بەدیهێنەرت لا روون بۆوە، ئەوا دەتوانیت مەعریفەو زانیاریت تەواو بکەیت سەبارەت ناسینی ئەو سیفاتانەی - وات لێدەکات - لێی بکۆڵیتەوە، بە پشت بەستن بەو راستیانەی لەمەو پێش باسمان کردن،و ئەو سیفەتانەی کە لەمەوە بۆ مان دەردەکەوێت، ئەوا دەڵێین:

ئەو زاتە یەکەمینە (الأول) هیچ شتێك لە پێشیەوە نەبووە، چونکە گەر شتێ لە پێشیەوە بووبێ ئەوا سنوری بۆ دادەنرێت، سنوریش لە سیفەتی رووداوو بەدیهاتووەکانە، لە پێشیشەوە وەلا خستنی ئەمەمان بۆ روون بووەوە.

ئەو کۆتایە (الآخر) لە دوایەوە هیچ شتێك نیەو ترسێنەرو ئاگادار کەرەوە هەر خۆیەتی، کەواتە ئەو (ئەزەلیو ئەبەدییە).

و ئەو زیندووە (الحي): ژیانێکی رەها، چونکە ئەو بەخشەری ژیانە بە زیندەوەران، بۆیە ڕێی تێناچێت گەر رەها نەبێت، چونکە رێژەییەتی: لە سیفەتی بەدیهێنراوو بەرپابوەکانە.

و ئەو بیسەری زانایە (السمیع العلیم)، بینای بەتوانایــە (البصـیر القدیـر)ە، چونکـە ئەم سیفەتانە پەیوەستو داخوازیی سیفەتی ژیانن، جا کاتێك ڕەهایی سیفەتی ژیانی بوو، ئەوا ڕەهایی پەیوەستی سـەرجەم سیفاتەکانی تریـەتی، بـە جۆرێك کـە بیسـتنو بینـینو زانستو توانای، دەسەوسانی ڕووبانەتێ ناکات بە هیچ جۆرێك.

ئەو تاكو تەنیایە (الواحد): کە هیچ هاوەڵێکی نیە لە موڵکدارێتیدا، ئەم سیفاتانەش لەبەر ئەو گرنگییە مەزنانەی هەیانەو ئەو مەترسییە گەورانەی لێی بەرپا دەبن پێویستە بە شێوەیەکی درێژتر لێیان بدوێین:

ڕەنگە لەم بەدوایەگـداهاتنی باسەداو باس کردنی ئەم سیفاتانەی پێشو،و لە دڵنیا بوونو سوور بـوون لەســـەر تــەواوێتی ڕەهــای پــەروەردگار، ئــەوە دەرگــــەوێت کــە یەکتاپەرستیی دێتــە دیو پێویسـتی بـە بەڵگـە هێنانـەوە نیـە، بـەڵکو چـەندێتی (التعـدد) پێویستی بە بەڵگە هێنانەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا باسـی یەکتاپەرسـتیی زیـاتر درێـژە پێ ئەدەین بە هۆی پەیوەندییەکی بنەڕەتییەوە بە واقیعی ژیانەوە.

گوتنی گوتەی چەندێتی ئەتوانین کورتی بکەینەوە لە (دوانەیيەتیی– تثنیـة)دا، جـا گەر (تثنیة) چەسپاو هاتە دی، چەندێتی دروست دەبێت بێ دەستنیشان کـردنو ژمـاردن، جـا گـەر چـەندێتی پـووچ بۆوە لــە بنــەڕەتدا ئــەوا ئــەویش پــووچ دەبێتــەوە، ئەوسـا یەکتاپەرستی پێویست دەبێت.

جا گوتەی دوانەیی (تثنیة) وا پێویست دەکات سـیفەتێکی جیاکـەرەوە هـەبێت لـە نێـوان دوو شـتدا، چونکـە یەکسـانیی تـەواو لـە هـەموو ڕووەکـاندا شــتێکی پووچــە، بـۆ چوونەکانمان لەهیچ کاتێکدا نایەتەدی، گەر بە تەواوی یەکەم بەسەر دووەمـدا نەچەسـپێ، ئیدی لە کۆتاییدا یەك (بوو – کائن) دەمێنێتــەوە، جـا گـەر سـیفەتی جیـا کـەرەوە نـەبێت ئەوسا جیا کردنەوەش نامێنێت. جا گەر لە حاڵەتێکدا خۆ بـە زل زانێـك گوتـی دەتوانرێـت جیاکردنەوە لەنێوان دوو حاڵەتی یەکسانی تەواودا بکەین، ئەوا پێی دەڵێـین: تـۆ بەڵگـەت لەسەر خۆت هێنایەدی کـاتێك لەیـەکت جـودا کردنـەوە، ئـەم جیاکردنەوەیەشـت بـە دەرك

کردنی سیفەتی جیاکارییەوە بوو. جا بوونی سیفەتی جیاکاریش یەکسانی تــەواو پووچــەڵ دەکاتــەوە، ئەوساش (تفاضل) لـە نێـوان دوو شـتدا دێتـە دیو بــەمجۆرەش یــەکێك لــە مەفضولەکان دەکەوێتو تەنیا دانەیەکیان دەمێنێتەوە.

گوتەی (تثنیــة)ش لـە روانگـەی بیرکاریـەوە دوو شـتی رەهـا دەگەیـەنێت، ئەمـەش شتێکی مەحاڵە، چونکە بوونی یەکێکیان رەهایی ئەوی تریان وەلا دەنێ، لـەم حاڵەتەشدا یا رەهایی یەکەم دێتە دی، ئەوسا بە تەنیا یەکەم دەمێنێتەوە، یاخود لە سـنووری یەکـەم دەرئەچێو ئەوساش رەهایی یەکەمی گریماناوی دەکەوێتو دووەم دێتە دی، بە واتایـەکی تر رەهایی دەورە دراوە،و دەورەی نادرێو پەی پێ نابرێ، لە ئاکامیشدا تەنیا یـەك رەهـا دەمێنێتەوە.

ئەمە وێـڕای ئـەوەی بەڵگەیـە لەسـەر یەکتاپەرستیی، هـەروەها بەڵگەشـە لەسـەر بەرپا بوونی گێتیو نەرێ کردنی کۆنیەتی، چونکە وتەی کۆنیەتی دوو ڕەهایی دەگرێتەوە. ئەمەش وەك زانیت شتێکی مەحاڵە. لێرەوە واتای قوڵی ئەو ئایەتەت بۆ دەردەکـەوێ کـە دەفەرموێت ﴿ألا له الخلق والأمر﴾ الأعراف/٥٤.

واتە: ئاگادار بن کە بەدیهێنانو تەگبیری (جیهان) بۆ ئەو (خواو بە ئەمری ئەو)ە.

نەك تـەنیا گۆڕانـی گــەردوون رووداوو بەرپابویەکــە، بــەڵکو گــەردوون هــەمووی بەدیهاتووەو گۆڕانکاریش (تصریف)تیایدا لــە ژێـر دەسـەڵاتی بەدیهێنەرەکەیدایە، کەواتـە گەردوون بەرپا بووە بە ماددەو ماناکەشییەوە.

جا گەر بمانەوێ ئەم مانایە ســەبارەت یەکتاپەرستییو چەندێتی (التعـدد) روونـتر کەینەوە ئەوا دەڵێین لە کاتی بوونی دوو هــەبوودا ئــەوا دەبێـت یـەکێکیان تواناو زانسـتی بەسەر ئەویترياندا بشکێت. جا گەر ئەمەی نەتوانی ئەوا شایسـتەی خوایـەتی نیـەو تـەنیا یـەکێکیان دەمێنێتـەوە، بـەڵام گـەر توانـای لەسـەر ئەمــە هــەبوو ئــەوا خوایــەتی دووەم نامێنێتو تەنیا یەکەم دەمێنێتەوەو، هەندێك لە فەیلەسوفان ئەمە بە (برهان التمـانع) نـاو دەبەن، بۆیە دەڵێین: گەر دوو خودا هەبێت، یەکێکیان بیەوێت (زەید) هەسـتێو لـە هـەمان

کاتیشدا ئەوی تریان بیەوێ دانیشێ، ئەوسا کاریگەری ئەم دوو ویستە دەبێتە شتێکی مەحاڵ، چونکە مەبەستەکە نایەتەدیو دوو شتی دژ، لە یەك کاتدا پێکەوە کۆناکرێنەوە، جا گەر توانای یەکێکیان زاڵ بوو بەسەر ئەوی تریاندا ئەوا ئەوی دووەم دەستەوەسانو ژێر کەوتوو دەبێت، کەواتە نابێتە خوداو لەم حاڵەتەشدا تەنیا یەکێکیان دەمێنێتەوە.

ئیبن جریر الطبري ئاماژەی بەم مانایە داوە کە دەڵێت: (هیچ یەکێك لەم دوانە نابنە بەهێز یان دەستەوەسان، ئەگەر دەستەوەسان بن ئەوا دەستەوەسان ژێر کەوتووە، شایستەی خوایەتی نیە،و ئەگەر بەهێز بن ئەوا هەر یەکێك لەوان سەبارەت ئەوی‌تر کەم تواناتر دەبێت، کەم تواناش نابێتە خودا. گەر هەر یەکەشیان بەهێزتر بێت لەوی ترەئەوا لەژێر دەسەلآتی ئەویتردا دەسەوسان ئەبێت).

کەواتە هەر ئەو تاكو تەنیایە دەمێنێتەوە کە هیچ شتێك لە زەمینو ئاسمانەکاندا دەستەوەسانی ناکات، هیچ کەسێکیش گوتەی چەندێتی (التعدد) ناڵێت مەگەر خاوەنی عەقڵییەتێکی سەرەتایی‌و بیرۆکەی رەچەڵەکایەتی بێت (فکرة وثنیة)و خودانی ئەندێشەیەکی دروست کراوە، کە هاتنە دی زۆر دوورەو لەگەڵ ژیرییدا بەرەنگار دەبێتەوە.

بۆیە هیچ کەسێك نیە لە دنیادا پابەندی ژیریی‌و لۆجیك بێتو وتەی چەندێتی بدرکێنێ. بەڵکو لێکۆڵینەوە هەر دەمانگەیەنێتەوە یەکتاپەرستیی، کە دوورە لە سیفەتی بەرپابوونەوە، وەك پێکەوە لکاندنو لقێتی‌و لە دایك بوون (الإلصاق والتفریع والولادة). هەروەك چۆن چەندێتی‌و هەژماردن پووچە، ئەوا لەمەولا ناکاوێتی‌و یەکسەرێتی (طروؤة) زیاتر جێی پووچەڵ کردنەوەیە، بەم جۆرەش هەژمارەیی‌و چەندێتی هەرەس دێنێ، وەك دوانەیی‌و سیانەیی‌و ....هتد.

مەخابن لەگەڵ ئەمەشدا خەڵکانێکی زۆر ئەمڕۆ لەسەر ئەم باوەڕەن، بەڵام گەر کەمێك بۆ ژیری‌و لۆجیك بگەڕێینەوە ئەوا لەبەردەمیانا هەموو بتەکانی رەچەڵەك بازی‌و چەندێتی پووچەڵ دەبێتەوە بە هۆی بەهێزی بەڵگەکانو راشکاوییانەوە،و لەبەردەم شۆڕشی ژیریی‌و ئەقڵ ئەم ناتەباییە بەدە خۆی ناگرێ، جا نازانم کەی ئەو کاتە دێت

بیرمەندە ئازادەکانی گێتیی‌و ئەو هۆشمەندانەی کە داماڵراون لەم رەچەڵەکبازییە پەردەو تەونی جاڵجاڵۆکەکان دەدڕن‌و جیهان بەرەو یەکتاپەرستیی دەبەن؟!.

قورئانی پیرۆز بوو مەشخەڵی یەکتاپەرستیی بۆ مرۆڤایەتی هەڵگرت، لە دوو توێیدا ئاماژە بە مەحاڵی چەندێتی دەکات‌و پووچێتی دەخاتە روو و جەخت لەسەر یەکتاپەرستیی‌و چەسپاندنی دەکات، لە ئایەتانێکی زۆردا چاکترین‌و بەهێزترین بەڵگەی بۆ خستوینەتە روو:

﴿ما اتخذ الله من ولد وما كان معه من إله إذا لذهب كل إله بما خلق ولعلا بعضهم على بعض سبحان الله عما يصفون، عالم الغيب والشهادة فتعالى عما يشركون﴾ المؤمنون/٩١-٩٢.

واتە: خودا منداڵی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووەو مەعبودێ تر لەگەڵ ئەودا نیە (کە ئەگەر وا بوایەو خوای تر لە گەڵی هەبوایە، لەو کاتە هەر یەکە لە خواکان خەریکی کاری مەخلوقی خۆی دەبوون‌و هەندێ بەسەر هەندێکدا بەرز دەبوونەوە، خوا لەو پەسنانەی کە دەیکەن پاک‌و بێخەوشە، کە بە دیارو نادیار ئاگادارە، جا ئەو لەوە بەرزترە کە هاوبەشی بۆ دابنێن.

﴿هو الأول والآخر والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم﴾ الحديد/٣.

واتە: هەر خوایە ئەوەڵ‌و ئاخرو زاهیرو باتین،و هەر ئەوە بە هەموو شتێك ئاگایە.

﴿ألا إنهم في مرية من لقاء ربهم ألا إنه بكل شيء محيط﴾ فصلت/٥٤.

واتە: ئاگادار بە! کە بەڕاستی ئەوانە لە دیداری پەروەردگاریان لە دوودڵیدان، ئاگادار بە! کە بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و بەدەسەلاتە.

﴿قل هو الله أحد، الله الصمد، لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفوا أحد﴾ سورة الإخلاص.

واتە: بڵێ: خوا تاکو تەنیایە، خوایەکی بێ نیاز (کە نیازمەندان روو دەکەنە ئەو کە نیازیان جێبەجێ بێت)، (هیـچ شـتێك) لێـی نـەبووەو (لـە هیـچ شـتێکیش) نـەبووە،و هیـچ هاولفـو هاوتایەکیش بۆ ئەو نیە.

بەم جۆرە راستی یەکتاپەرستیی بەدیهێنـەری دێریـن دەچەسـپێت، بـە جۆرێکـی وا هیچ بواری گومانو دوو دڵی نەهێڵێتەوە.

بۆیە زانای لێکۆڵەرەوە زۆر لە پێشترە بەوەی مـەردومان بـۆ ئـەم راسـتییەبانگێش بکات. گومانو دەردی چەندێتی لایان بڕەوێنێتەوە،و پووچیو گـەندەڵیان ئاشـکرا بکـات، تاکو لە تاریکییـەوە بچنـە نـاو رووناکیی، هـەروەها تـا لـە دژ یەکییـە(بەتە)کانـەوە بگەنـە تەبایيو هاوتایی ژیریێژیی روونو ئاشکرا. بەم جۆرە دەروونـی مرۆڤایـەتی لـە دڵەڕاوکێو گومانو سەرکوتکردنو دوودڵی رزگاری دەبێتو لە ئاکامی مانەوە لـە رێچکـە لادراوەکـانو بەرنامە سوك وبێ نرخو پێکەنیناویو گریاناوییەکان رزگـار دەبن، کـە شـیکاری دەرونیـی سەلماندویەتی ئەمانە تـەنیا وێنەیـەکی بەرهەسـتێن کـە دەربڕیـن لـە ئیفلاسـی مرۆڤایـەتی دەکات لە کاتێکدا رێگەی راست نەگرێتە بەر.

جا بۆ زیاتر تەواوکاری هەموو لایەنە برِوا پێکەرەکانی ئەم باسە ـ باسی سروشـتو هۆکارێتیو یەکتاپەرستیی– ئەوا ئەم نامە رێكو پێکـەی بـەدیع الزمـان سـەعید نورسـی ـ رەحمەتی خوای لێ بێ– دەخەینە روو کە لەم بارەوە روونی دەکاتەوەونووسیویەتی:

﴿قالت رسلهم أفي الله شك فاطر السماوات والأرض﴾ إبراهيم/١٠.

واتە: رەسولانی ئەوان وتیان: ئایا لەسـەر خوایـەك کـە بەدیهێنـەری ئاسمانـەکان و زەوییە گومانتان هەیە.

بیر لەم ئایەتە بکەرەوە بزانە چۆن نیشانەی سەرسوڕمانو نکۆڵیـکاری تێدایە، کە بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی دان نـان بـە تـاكو تـەنیایێتی (اللَّهُ)ی پـەروەردگاردا لـە روونـترین راستییەکانە لای کەسانێك گەر جارێك بە چاوانیان ئەم ئاسمانو زەمینە ببینن و چاوی پێدا بخشێنن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئـەوەی ئـەمڕۆ هـەندێ لـە موسـڵمانان بـە چـەند وشـەیەك

دەیڵێن، بە لایەنی کەمەوە کەمترینی سەردەکێشێت بۆ بێباوەڕ بوون بەم راستییە گەورەیە.

جا لێرەدا لە سێ وشە دەکۆڵمەوە کە تەنیا کەسانی بێ مێشکو بێ ئاگا لە راستی شتەکان دەیدرکێنن، هەروەها بێباوەڕێکیش شانازی بە بێباوەڕییەکەیەوە بکاتو دەهۆڵی بۆ بژەنێت، ئەوانیش یەکەمیان ئەوەیە کە **(هۆکان بەدییان هێناوە)** دووەم **(لەخۆڕا بەدیهاتووە)** سێیەم **(سروشت دروستی کردووە)**.

لە راستیدا زۆر مەحاڵە ئەم گوتنە بێ ماناو پوچانەوە دروست دەبن، کە ئەگەر بە درێژەپێدانێکی زانستیی بەرفراوان بیژمێرین؛ ئەوا زیاد لە نەوەد مەحاڵ دەبێت کە زانستی هیچ زاناو ژیریی هیچ هۆشمەندێك دانیان پێدا نانێت بەڵام من تەنیا لە(دە)یەکی ئەدوێمو بەم رستە کورتانە باسیان دەکەم.

**یەکەم مەحاڵ ئەوەیە:** لە بەرەنجامی وشەی (هۆکان بەدیهێناون) سەری هەڵداوە، پوچەڵی ئەم گوتەیەش لەم نمونەیەوە دەردەکەوێت: گەر پێویستمان بە گیراوەیەك بێت کە لە چەند دەرمانو گیایەکی جۆراوجۆر دروست بکرێت بە تێکەڵ کردنی رێژەیەکی دیاری کراو، کەسی دەرمانسازیش هەستا بە ئامادە کردنی ئەم گیراوەیە بە پێی پێوانەی پڕ وردەکاری، بە جۆرێك کە بەشێك لەم گیراوەیە کەمتر یان زیاتر بێت ئەوا بە پێچەوانەی سودەکەیەوە دەشکێتەوە، جا بۆ نمونە گەر بومەلەرزەیەك روویداو ئەو ماددانەی گیراوەکەی لێ دروست دەبێت هەمووی خستنو شوشەکانی شکاندو دەرمانەکانی ناوی رژاندو تێکەڵ بە یەك بوون، ئایا دەبێ لە ئاکامی ئەم تێکەڵ بوونەدا بڵێین ئەو گیراوەیەی دروست بووە وەك ئەو گیراوەیە وایە کە دەرمانسازەکە بە پێوانەیەکی وردو شارەزایی زانستیو حیسابێکی رێكو پێك پێی هەستاوەو دروستی کردووە؟و ئایا کەس بەمە باوەڕ دەکات جگە لە کەسێك نەبێت بەخششی بیرکردنەوەو ژیریی لە دەست دابێت؟.

هەموو خاوەن ژیانێك لەسەر ئەم زەوییەدا گیراوەیەکی قەشەنگە، لە مەلایین بەشی سەرسوڕهێنەری جیاواز پێك دێت، کە بە پێوانەیەکی رێژەییو حیکمەتو یاسا

بەدیهاتوون، بێگومان گێڕانەوەی ئەمە بۆ کاری هۆکاری ماددی وشك‌و رەگەزی بێ گیانی بێ دەنگ، دائەنرێت بە خراپترو بۆگەنتر لەوەی کە بڵێین دەرمانەکان لە ئاکامی بەریەك کەوتن‌و رژاندیان گیراوەیان لێ پێك هات.

**دووەم مەحاڵ**: گێڕانەوەی بەدیهێنانی شتەکان بۆ هۆکارە ماددییەکانی، وا پێویست دەکات کە زۆر رەگەزو هۆکاری وردو دژ یەك کاریگەری راستەوخۆی لە بەدیهێنانی شتەکاندا هەبێت. وەلێ پێك گەیشتنی هۆکارە جیاوازە ئاشکراکان:هەندێکیان بە هەندێکی تریان، بە رێکەوتن لە لایەکیانەوە بێت‌و بەوپەڕی وردەکاری هاوکێش لە لایەکی ترەوە، بۆ نموونە لە بەدیهێنانی مێشدا ئەگەر لەوپەڕی مەحاڵەکان نەبێت ئەوا لە دژوارترین رێ تێنەچووەکانە،چونکە لەشی ئەو مێشە لەگەڵ بچووکیدا پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی رەگەزو هۆکارە ماددییەکاندا هەیە کە لە گەردووندا بڵاو بۆتەوە، بەڵکو بەڕاستی پاڵفتەو کرۆکییەتی، جا گەر بڕوا بەوە بکەین ئەم بوونەوەرە بچووکە بۆ ئەو هۆکارانە دەگەڕێنەوە ئەوا پێویست دەبوو کە هەموو رەگەزو هۆکارەکان لە زاتێکدا کۆببنەوە لە کاتی بەدیهێنانیدا، بەڵکو دەبێت هەمووی لە لەشیدا هەبێت، بەڵکو لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی لەشیدا، چونکە هۆکاری ماددی دەبێت بوونی هەبێت لەگەڵ هۆسازێنەرەکە لە ناویدا، بە واتایەکی تر دەبێت ئەم رەگەزە ماددییە دژانە بەردەوام تێیدا کۆبێت. کاری خۆی بکات لە هەموو سوچ‌و پەنایەکی لەشی مێشەکەدا، بێ ئەوەی هیچ شتێ پاڵی پێوە نێ بۆ ئەو پێگەیشتن‌و کاریگەرییە.

ئایا ئەمە تەنیا خەیاڵێکی پووچ نیە کە تەنانەت نەفامانی سۆفستائییەکانیش باسی ناکەن؟

**سێیەم مەحاڵ**: رێسایەکی بەڵگە نەویست دەڵێت (یەك تەنیا لە یەکەوە دەردەچێت)، واتا هەر شتێك بە یەکێتیی یاساو رێکخستن‌و پێکەوە گونجان وەسف کرابوو لە شێوەو رووکەشیدا، بێگومان دەبێت کارلێکەرەکەی یەك بێت، پێویستی هاوکۆکی نێوان پێچەوانەکان‌و کۆکردنەوەی نێوان شتە جیاکان لە یەك جۆرو رەگەزدا تەنیا بەوە دەبێت

کە زیاد لەتواناو دەستێك تێیدا هاوبەش بێت، بێگومان ئەم جیهانە بەرفراوانەش یەکێتییەکی تەبایی‌و ڕێکخستن کۆی دەکاتەوە، جا پاش ئەوە گێڕاندنەوەی بوونی بۆ هۆ بێ گیانە تێکەڵاوەکان کە هیچ هەست‌و ژیرییەکیان نیە بە گەورەترین ئەفسانەی پێکەنیناوی دادەنرێ. چونکە هۆ ماددییەکان تەنیا بە هۆی بەیەك گەیشتن‌و ڕاستەوخۆییەتی کاری تێدەکرێت، بێگومان هاورەگەزەکانیشیان لە رووکەشی بوونەوەرو شێوەکانیاندا دەبێت، لە کاتێکدا لە ناوەڕۆکیانداو لە پشت سنووری هەستەوە ئەو پەڕی یاساو ڕێکوپێکی‌و سەرسامی‌و تەبایی تیایاندا هەیە کە لە رووکەشیاندا نیە، ئەدی کوا هۆکارە ماددییەکان کە دۆزیونیەتیەوە؟ بەڵکو ئەو کەسە لە کوێیە کە دەتوانێ پەی بە پەنهانی ئەو ناوەڕۆکە ببات؟ لەنێوان هۆ کارلێکەرو هۆ کارلێکراوەکەداو لێکیان جیا بکاتەوە، و بتوانێ لە کات‌و ناوەڕۆك‌و سنووردا لێکیان جیا بکاتەوە.

بەڵام سەبارەت وتەی دووەم (کە لەخۆڕا دروست بووە): ئەمیش چەندان مەحاڵ لەخۆ دەگرێ کە چاوان لە ئاستیا کوێر دەبێ. تەنانەت بیرمەندی مووچیڕ رەنگە(خۆ بە زل زانین)بەرگی کەللە رەقی‌و نەفامی بەبەر ببڕێ بەڵام مرۆڤی ئاسایی ڕەنگە گەردن کەچی یەك مەحاڵ نەبێت کە بە بیریا بێت، کەچی نموونەی ئەو کەسە مووچیڕە؛ لای گرنگ نیە بەرگری لە چەندان مەحاڵ بکات، کە لە پوچگەرێتییەوە هەڵقوڵاوەو سوێندی خواردووە نابێ دەست بەرداری ببێت. ئەی مرۆڤ تۆ ماددەیەکی ساکار نیت‌و بە شێوەیەکی بێ گیان‌و نەجووڵاو لەسەر بووندا فڕێ نەدراوی، بەڵکو تۆ ئامێری کاریگەرییەکی زۆر وردەکاری گەورەی، لە وردەکاریدا ئەوپەڕی سەرسامی وتەبایت لە خۆ گرتووە، لە لەشتدا گەردی کارگەر هەیە کە بەردەوام لە کاردان.. لەشی تۆ کارلێکەری هەیە -لەوپەڕی ڕێك‌و پێکیدا- لەگەڵ هەموو دیاردەکانی بوونەوەردا لە دەوروبەرتدا، کە لە کاریگەری کڕین‌و فرۆشتن‌و وەرگرتن‌و بەخشین دەچێت.. مەلایین گەردی کارگەر لە لەشتدا بەردەوام لە پاراستنی رەوتی ئەم کارلێکەرییەو وردەکاری یاساکەیدان، لێرەوە بۆت دەردەکەوێت تەنیا هاوتایی وتەبایی لە نێوان گەردەکانی لەشی تۆدا نین، بەڵکو لە نێوان کۆی ئەم گەردانەو بوونی دەرەکی

دەوروبەردان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە یەکێتییەکی ڕێكو پێکی بەردەوام هەیە لەوپـەڕی وردەکارییدا لـەنێوان بوونـی ئـەندامیی- عضـوي: فسـیولۆجی- تـۆو بوونـی سـەرجەم بوونەوەرانی دەوروبەری تۆدا!

جا گەر ویستت ڕەفزی ئەو باوەڕە بکەی کە ئەو گەردانەی لە لەشـتدا کـار دەکـەن بە پێی یاسای بەدیهێنەری ئەزەلیو مەزن دەجولێن، ئەوا پێویست دەبێت لەسەرت بڵێیت ئەو گەردانەی(بۆ نموونە لە شانەیەکی چاوتدا کار دەکەن) ئەقڵێکی فەیلەسوفی مەزنیان تیـا جێگیر بووە، کە یاسای ڕێکـەوتنو هاوتـایی لـە نێـوان هـەموو گـەردی لاشـەت لـە لایـەكو گەردێك لە گەردەکانی ئەم بوونەی دەوروبەرت لە لایەکی ترەوە سازاندووە، ئیتر ئایـا ئـەو بوونەوەرە هەوا بێت یان ڕووناکی یان خواردنو خواردنەوە بێت، یان هەر شتێکی تر. وەك چۆن دەبێت هەر یەك لەو گەردانە خـاوەنی بـیرو هـزری خـۆی بێـت، کـە لەسـەرچاوەکانی زەمانەکـەت (سـەردەم) تێبگـات،و ڕەگـەزەکانی باوباپـیرانت حـاڵی ببێـت،و ڕابـوردووو داهـاتووی تـۆ پێشـبینی بکـات... بەڕاسـتی ئـەم پوچگەرێتییـە کەللـەرەقی خـۆ بـە زل زانینە!!.

بەڵام ئەگەر وەڵامدانەوەت بۆ جیهانی گەردەکانو یاساکەی هەمان وەڵامـت بـێ بـۆ جیهانی هەست پێکراوت، بەو واتایـەی کـە هـەمان هۆکـاری مـاددیو کارلێکـە زاتییـەکانی لەسەرە، ئەوا پرسیار لە جیهانی سێیەمەوە ڕووبەڕووت دەبێتـەوە کـە لـە پشـتیانەوەیە،و کە لە هەردووکیان وردترە، بەم جۆرە فاکتەرو هۆکارەکان بە شـێوەیەکی دوایـی نـەهاتوو بە دوای یەکدا دێن، بە جۆرێك درێـژ دەبێتـەوە تـا ئـەو شوێنەی لە پشـتییەوە موچـڕیی کەللە ڕەقانو نکۆڵی خۆ بە زل زاناندا خۆی دەبینێتەوە.

وتەی سێیەم کـە دەڵێـن (سروشـت بەدیهێنـەرە): ئـەمیش زنجیرەیـەك هەڵەشـەیی پێکەنیناوی بەدوادا دێت، کە بەم جۆرە کورتیان دەکەینەوە:

١- خـاوەنی ئـەم وتەیـە دەبێـت وای دابنێـت کـە هـەموو گـەردێك لـە گـەردەکانی بوونـەوەر کۆمـەڵێك فاکتـەرو کاریگـەریی لـە خـۆ گرتـووە کـە ئـەم کۆمەڵـە گەردوونیـەیان

پێکهێناوە، بە جۆرێك هێنــدە تواناو وزەی تیا بێت ئەو جیهانە تەواوەی دەوروبەرمان دەبینیت بەدیبێنێت، ئەو توانایە دەبێت بەو کارە هەستێ و جێبەجێی بکات.

گەر وابێت مادام لە هەر گەردێکی ئەم بوونـەوەرەدا سروشـتێکی بەدیهێنـەر هەیە، کە کارسازی حەکیمە، جیـا لـە شـتانی تـر، پـەیوەندیی بـە پێشـەواییتیی گشـتیی خۆی و هاونموونەکانیەوە نیە، ئەوا هیچ دەرفەتێك نیە بۆ پەیوەستی بەم بیردۆزەوە... وەك ئـەو کەسـەی تیشـکی خـۆر دەبینێتـەوە کـە لـە تنۆکـی ئـاودا دەردەکـەوێت یـان لـە پارچـە شووشەیەك و تەنە ناسکەکاندا، کەچی نکوڵی دەکات و دەڵێت لە هەر یەکێ لەو تەنانەدا (لە سروشتەکەیاندا) تیشکی سەربەخۆی خۆیان هەیە. بێگومان دەبێت پەیوەست بێت بەوەی کە دان بنێـت بـە بوونـی خۆرێکـی راسـتەقینەدا، سەربەخۆ بێـت لـە هـەر یـەکێ لـەو تەنـە گەشانە.

جا کەسێك بیەوێت بەو ئاکامە گەندەڵە پێبکەنێت، ئەوا با لە پێشدا بەو ئەفسانەیە پێبکەنێت کە لە سەرەتادا بانگەوازی دەکردو بنیاتی ئەنا.

٢- خاوەنی ئەم گوتەیە دەبێت پەیوەست بێت بەوەی بسـتێ لـە هـەر پارچەیـەك زەوی شـتانێك لـە خـۆ دەگـرن کـە هیـچ دەوڵـەتێکی جیـهان نایگرێتـە خـۆ، لـە کارگـەو چاپەمەنی و ماددەی سەرەتایی جیاواز؛ بە جۆرێك کە پەرداخێك خاك کـە رووبەرەکـەی لـە بستێك تێپەڕ ناکات ڕێی تێدەچێـت سـەرجەم جـۆرە جیاوازەکـانی رووەك و گوڵزارەکـانی جیهانی تیا بڕوێت، بە شێوەی بە دوای یەکدا هاتن.. جا گەر توانستی پەروەردگاری نەزن نەبێت کە لـەو زەوییـەدا توانـای کـارلێکردنی بـەرپا کـردووە، لەگـەڵ پێشـوازی کـردن لـە جۆرەهـا رووەك و تـۆو، کـە بـۆ هـەر یەکـەیان زات و شـێوەو تایبەتمـەندیی جیـاوازی پـێ دەبەخشێ، کەواتە دەبوو لەو خاکەدا توانستی جیاوازو دژ یەك هەبوایـە، بـەڵکو وەکـو وتم دەبوو وزەی پیشەسازییەکانی ئەوروپا هـەمووی لـەو بسـتە زەوییـەدا بوایـە، چونکـە وەك ئاشکرایە ماددەکانی تۆو (نطف و بذور) هەر یەکن و جیا نین، ئەویش بریتییە لە تێکەڵەیەك لە: پێکهاتـەی ئـاوی، پێکهاتـەی ترشـەڵۆکی، کـاربۆن، ئـازۆت، ماددەکـانی ئـاو، و هـەواو

گەرمایی‌و تیشك، ئەمەش شتێکی ساکارەو لە هاتوو چۆیدا جیاوازی نیە لە رووەکێك‌و رووەکێکی تردا.

لەگەڵ ئەمەشدا؛ ئەو هەموو رووەکانە لەسەر یەك زەوی دەڕوێن، هەر یەکەیان سیفەت‌و تایبەتمەندی‌و رەنگ‌و بۆنی خۆی هەیە، کەواتە دەبێت لەو خاکەدا شتێکی تر هەبێت جگە لە ماددە ناسراوەکانی خاك‌و تۆوو هەوا، وا لەم تۆوانە بکات خاسیەتی دروست بوون‌و جیاکاریان پێببەخشێ، جا بیر کەرەوەو تەماشای دووریی ئەم قسەیە بکە لە ژیریی‌و هزرەوە ! ! .

٣- لێرەدا نموونەیەك دەهێنمەوە وەك لە هەندێ نامەکانی ترمدا باسم کردووە، حاڵی ئەو کەسانە دیار دەخات خۆیان سەر بە سروشت لە قەڵەم دەدەن.. با وای دانێین لە ناو جەرگەی بیابانێکدا کۆشکێکی قەشەنگی تیایە، بە باشترین شێوەو لەسەر وردترین ئەندازە بنیات نراوە.. وای دابنێ بیابان نشینێکی گێل‌و نەزان دەچێتە ناو ئەو کۆشکەوە، کە لە ماوەی ژیانیدا لە خێوەت زیاتر خانووی نەبینیوە، جا بیری لە رازاوەیی‌و نەخش‌و رووکەشی وردەکارییەکانی کردەوە، پاشان بە دەروونی خۆی گوت لەم بیابانەدا کەسێکی وای تیا نیە بتوانێت شتێکی وا ساز بکات، ئیدی وا دێت بە بیریدا بیناکەرەکە لە خودی بیناکەدا بەرجەستە دەبێت.. پاشان ئەم دیوو ئەو دیو ئەکات‌و بە دوایدا دەگەڕێت، کەچی هیچ کەسێك نابینێتەوە، بەڵام چەند کاغەزێك دەبینێت کە تێیدا نەخشەی بیناسازی‌و کەرەسەکان‌و باسی ئەندازەیی تێدایە، پاشان بیر دەکاتەوە ئەم کاغەزانە دەست‌و چاویان نیە، بۆیە ناتوانن کاری بیناسازی ئەنجام بدەن... بەڵام پاش کەمێك بەردەوام ئەبێ‌و ئەڵێ؛ بەڵام ئەوەتا:کاغەزەکان لە دوای یاسای دامەزراندن‌و چۆنیەتی پێك هێنانی دەکۆڵێتەوە، کەواتە جگە لەوە هیچ بیناسازو دروستکەرێکی نیە.

هەروەها بیابان نشینێکی نەفامی تر کە هزری تەنیا جێی ناوی سروشتی تیا ئەبێتەوە دەچێتە ناو ئەو گەردوونە مەزنەوە، زۆر سەرسام دەبێت بەو داهێنانەی کە داهێنەرەکەی لە دەورووپشتیا هەست پێ ناکات- بەهۆی کورتی ژیرییەوە- بیر ئەکاتەوە

لە دوو توێو لاكانیدا، ئیدی ئەو پارچەیە ئەدۆزێتەوە كە یاساكانی فیترەی خوایی و ڕێسای دەستكردی داهێنەرانەی لەسەر نووسراوە، كە بە هەڵە بە سروشت ناوزەد كراوە، پێی سەرسام دەبێ و لەگەڵ خۆیدا دەدوێت - لە كاتێكدا لە بێ ئاگاییەكی تەواو دایە- بێگومان دەبێت ئەم پارچەیە بە یاساكانیەوە كە لەسەری نووسراوە داهێنەرەو ئەم داهێنانانەی بەخشیوە،و ئەم دروستكراوانەی دروست كردووە.

و ئێمەش دەڵێین: ئەی بێ هۆشی كەللە ڕەق، سەرت لەسەر بیری سروشت هەڵبڕەو لە پشت خۆتەوە تەماشای بەدیهێنەری گەردوون بكە، ئەوەی كە ئەم بینایەی بەدیهێناوە، لە توێكانیدا لە بەرچاوتا یاساكانی داناوەو ڕاگیری كردووە،و دەستووری بەدیهێنانی ئاشكرا كردووە كە ئەو پەروەردگارە بەدیهێنەرە ئەزەلییەیە كە خواوەندیی هەردوو جیهانە ﷻ ، نەك ئەو سروشتەی تۆ لەو ئینكارترو نەفامتری.

سروشت دروستكراوە نەك دروستكەر، نەخشێنراوە نەك نەخشێنەر، حوكمە نەك حاكم، شەریعەتە نەك شەریعەت ساز، بەدیهێنراوە نەك بەدیهێنەر، كارتێكراوە نەك كارتێكەر، سەرچاوەی گرتووەو بەخشراوە نەك سەرچاوە بەخش.

أهـ. وتەی شێخ سەعید نورسی ڕەحمەتی خوای لێ بێت تەواو بوو.

# بەڵگەی دیاردەکان

# لەسەر خوداو ناوە پیرۆزەکانی

ڕێسایەك هەیە دەڵێت: شوێنەوار بەڵگەیە لەسەر ناوەکان، ناوەکانیش بەڵگەن لەسەر سیفاتەکان، سیفەتەکانیش بەڵگەن لەسەر زات، با نموونەیەك لەم بارەوە بۆ ڕوونکردنەوە بهێنینەوە: ئەگەر کتێبێك بخوێنیتەوە ئەوا بە هۆیەوە دەتوانیت زۆر لە سیفەتەکانی خاوەنەکەی شارەزا ببیت، ئیدی بە تەواوی ئەتوانین بیناسین، گەر کتێبەکە لەمەڕ ئەدەب بوو ئەوا دەتوانین حوکم بەسەر نووسەرەکەیدا بدەین کە ئەدیبە، گەر داهێنەر بوو ئەوا ئەتوانین بڵێین خاوەنەکەی داهێنەرە، یان گەر لە سنووری یاساکانی (نەحو)دا ئەدوا، ئەوا دەتوانین بڵێین کەسێکی نەحوییە، یان گەر ڕەوانبێژ بوو ئەوا دەتوانین بڵێین خاوەنەکەی ڕەوانبێژە، یان گەر پەی بە باسەکانی بردبوو ئەوا دەتوانین بڵێین کەسێکی پەی پێ بەرە، یاخود گەر وردەکاری تێدابوو لە خستنە ڕووو جوانیو قەشەنگیدا، دەشێ بڵێین نووسەرەکەی خاوەن سەلیقەو وردەکاریە، یان ئەگەر هاتوو کتێبەکە ڕێکخراوو ڕێكوپێك بوو بە شێوەیەکی تەباو گونجاوو زنجیرەداری لە بیرۆکەدا، ئەوا دەتوانین حوکم بەسەر نووسەرەکەیدا بدەین بەوەی کەسێکی پێگەیشتووە، یان گەر لە کتێبەکەدا زانستێکی زۆری تیا بوو دەشێ بە نووسەرەکەی بڵێین خاوەنی زانینە، ئا بەم جۆرە هەر دیاردەیەك لە کتێبەکەدا سیفەتێك لە سیفەتەکانی خاوەنەکەیمان بۆ دەست

نیشـان دەکـات، هـەر بـەو بۆنەیـەوە نـاوێکی پێکهاتوو بـۆ خاوەنەکـەی ئەدۆزینـەوە، کـە پەیوەندیی پێوە هەبێت، بۆیە دەتوانین جۆری مەعریفەی خاوەن کتێبەکە بزانین.

جا با ئەم رێسایەی رابوردوو بەسەر باسەکەماندا بچەسپێنین.

لە لاپەڕەکانی رابوردوودا نۆ دیاردەی گەردوونیمان باس کرد، هەر دیاردەیـەك لـەو دیاردانـە بەڵگەیـە لەسـەر نـاوێك یـان چـەند نـاوێکی پـەروەردگار، گــەردوون شــوێنەواری پەروەردگارە ﴿فانظر الى آثار رحمة الله﴾ الروم/٥٠.

واتە: جا بنوارە شوێنەوارانی رەحمەتی خوا.

شوێنەوارەکانی پەروەردگاریش بەڵگەن لەسەر ناوەکانی، ناوەکانیش دەمانگەیەننە سیفەتەکانو سیفەتەکانیش دەمانگەیەننە زاتی پەروەردگار.

بۆ نموونە دیاردەی کۆنو بەرپابوونی گێتی بەڵگەیە لەسـەر نـاوی (الأول والآخـر)ی پەروەردگار، دیاردەی ژیان بەڵگەیـە لەسـەر نـاوی (المحـي والبـاری، الممیـت)، دیـاردەی رێپیشاندان بەڵگەی دوو ناوی ( هادي ومضل)، دیاردەی داهێنانیش بەڵگەیـە لەسـەر نـاوی (البدیع)ی پەروەردگار، دیاردەی وەڵام دانەوە گەواهی دەری نـاوی (المجیـب)ە، دیـاردەی بەخشین گەواهی ناوی (المنعم المعطي)یە،و دیـاردەی یـەکێتیی:گـەواهی نـاوی (الواحـد)ی (ﷲ)یە،و دیاردەی حیکمەتیش بەڵگەیە لەسەر ناوی (الحکیم)ی خوداوەند.

بەم پێیە هەموو دیاردەیەك لەم گەردوونەدا گەر باسمـان کردبێـت یـاخود باسمـان نەکردبێت بەڵگەن لەســەر نـاوێك لـە ناوەکـانی پـەروەردگار. دیاردەی رۆزی دانـی هـەموو بوونەوەران بەڵگەیە لەسەر نـاوی (الـرزاق)ی (ﷲ)، دیـاردەی سـەرفرازو زەلیـل کردنیـش بەڵگـەن لەسـەر دوو نـاوی (المعـز والمـذل)،و دیــاردەی چەسـپاوی یاســاکانی گــەردوون گــەواهیدەری نـاوی (المـهیمن)ی (ﷲ)و دیـاردەی بوونــی بوونــەوەران بەڵگەیــە لەســەر ناوەکـانی (القـادر والمقتـدر)ی پــەروەردگار، و دیـاردەی رێكو پێکـیو تـەرتیبی شـتەکان هەندێکیان لە دوای هەندێکیان بەڵگەیە لەسەر دوو ناوی (المقدّم والمؤخّر)ی پەروەردگار،و دیـاردەی پەشـیمانی بەڵگەیــە لەســەر ناوەکـانی (التــوّاب والغفّــار والعفــو)ی (ﷲ)ی

بەدیهێنەرمان، و دیاردەی تۆڵە سەندنەوە بەڵگەیە لەسەر ناوی (المنتقم)و دیاردەی سوودو زیان گەیاندن بەڵگەیە لەسەر ناوی (النافع والضار)، و دیاردەی بواردان بە سەرپێچیکەرانی فەرمانەکانی خوداوەند بەڵگەیە لەسەر ناوی (الصبور)ی کردگار، ئا بەم جۆرە هەر دیاردەیەك بەڵگەی سیفەتو ناوێکی (ﷲ)ی پەروەردگارە.

بەڵام دەلالەتی دیاردەکان لەسەر ناوو سیفاتەکان بە پێی جیاوازی پەیوەستتدارەکەو جیاوازی پەیوەندییەکەوە دەگۆڕدرێت:

هەیانە بەڵگەو گەواهیدەرە لەسەر سیفەتی فرمان (فعل).

و هەیانە بەڵگەیە لەسەر سیفەتی زاتی وجودیو بوون.

هەشیانە بەڵگەیە لەسەر سیفەتی زاتی سلبی، و هەمووشیان بەڵگەن لەسەر (بوو-موجود) جا بۆ روونکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان ئەم سیفەتانە، دەڵێین: ئەگەر بڵێین سەبارەت مرۆڤێك کە بکوژ بێت، ئەوا ئەوە سیفەتێکی کارلێکە لە کارەکان،و گەر بڵێین: بیسەرە، ئەوا سیفەتێکی بوونە بۆی،و ئەگەر بڵێین: کەسێك کە مەی ناخواتەوە ئەوە سیفەتێکی سلبییە بۆی،و هەر یەکێ لەم سێ بەشە بەڵگەیە لەسەر بوونێکی مرۆیی دیاری کراو.

لەراستیدا ئێمە سیفاتی بوون (وجودی) بە هۆی سیفەتە فرمانیو کردارییەکەوە دەدۆزینەوە (صفات الفعل). و سیفاتە سلبییەکانیش بە سیفاتەکانی فرمان دەدۆزینەوەو زاتیش بە هەموو سیفاتەکان دەناسینەوە.

جا پێش ئەوەی ئەمەی کە رابوورد بەسەر ناسینی خوداوەندا بچەسپێنین، پێمان خۆشە باسی ئەوە بکەین مەبەستمان لە : ـ ( سیفەتە وجودییەکان، یان سیفاتی فیعل، یان سیفاتی سلبی) چییە؟

مەبەست لە سیفەتە سلبییەکان سەبارەت زاتی خوداوەند ئەو سیفەتانەیە بەڵگەیە لەسەر دوور خستنەوەی هەموو ئەوانەی کە شایستەی پەروەردگار نینو پێی ناگونجێن، وەك بوونی سیفەتی تاكو تەنیایی خودا. مەبەست لە سیفەتە وجودییەکان سەبارەت زاتی

خوداوەند ئەو سیفەتانەیە کە بەڵگەن لەسەر مانایەکی زیاتر لەسەر زات وەك زانستو بیستن.و مەبەست لە سیفەتی فیعل پابەند بوونی توانایە (قدرة) بە ڕێ تێچووەکانەوە (الممكنات)، جا هەر پەیوەستییەکی توانای زاتی خوداوەند بە ڕێ تێچووەکانەوە بەڵگەیە لەسەر ناوو سیفەتو کردار.

هەموو ئەمانەش بەڵگەن لە سەر بوونی زات، سیفەتی بوونی زاتی خودایش ناو دەبرێ بە سیفەتە دەروونیەکان یان خودییەکان (الصفات النفسية)، چونکە بەڵگەو ئاماژەی خودی زاتە بێ هیچ مانایەکی زیادە. کەواتە ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر زات بێ هیچ مانایەکی تر ناوی دەبەین بە سیفەتە نەفسییەکان، ئەوەش بەڵگە بوو لەسەر سیفەتێ مەدلولەکەی وجودیی‌بێ، بێ هیچ مانایەکی تر، بە سیفەتی وجودی ناوی دەبەین، ئەوەش کە بووە بەڵگە لەسەر سیفەتێك کە مەدلولەکەی عەدەمی بوو، ناوی دەبەین بە سیفەتی سلبی، ئەو وتەیەشمان نەفی کردنی سیفاتەکانی بیستن ناگەیەنێ چونکە قسە کردنمان لە سیفەتە نەفسییەکان شوێنی خۆیان هەیە بۆ لێدوان، بەڵام مەبەستمان لێرەدا سیفەتە بەرزەکانە کە تەنیا بە ژیرییەکی ساغ دەیگەینێ، بە لێکۆڵینەوەیەکی دروستی گەردوون، دەقی قورئانو سوننەتیش بۆ ئەم مەبەستە ڕێپیشاندەرمانە، یەکانگیر بوونی ژیرییش لەگەڵیدا بەڵگەیە لەسەر ساغیو دروستی ژیریی.

جا هەمودیاردەکان لەم گەردوونەدا دەیانبینین بەڵگەن لەسەر چوار سیفاتی وجودی: (زانست، علم/ ویست، الأرادة/ توانا، القدرة/ ژیان، الحياة) چونکە گەر توانا نەبوایە ئەم گەردوونەش بوونی نەدەبوو،و گەر تایبەتمەندکردنی ویست لەسەر شتەکان نەبوایە کە بەم جۆرەی ئێستایە ئەوا ئەم گەردوونە نەدەبوو، گەر زاتیش نەبوایە هیچ شتێك نەدەبوو، هەر بەشێك لە بەشەکانی جیهان بەڵگەیە لەسەر زانستێکی پێشین، ئیرادەش تایبەتی شتەکان دەکاتو هێزو تواناش دەریان دەخات، لە پێداویستییەکانی ئەوەش کە زاتێك بە زانستو ویستو توانا وەسف بکەین ئەوەیە دەبێت ژیانی هەبێت.

هەموو بەڵگەکان ئاماژەی ئـەوە دەکـەن کـە ئـەو زاتـە وەسـف کـراوە بـە زانسـتو ویستو توانـاو ژیـان، و گـەردوونی بەدیـهێناوەو سیفەتی کۆنـی (القـدم)و بـێ سـەرەتایی هەیەو دەمێنێتەوە بێ کۆتایی، تاکو تەنیاو بێ هاوەڵە، وەکو بەدیهاتووەکانی نیـە، هیـچ شتێکی بـە دروسـتکراوەکانی نـاچێت، بـۆ خـۆی بـووە بۆیـە پێویسـتی بـە بەدیهێنــەرو تایبەتمەند نیە.

هەروەها هەموو دیاردەکانیش ئاماژەی ئـەوە دەکـەن ئـەم زاتـە تـەواوەو پاکـە لـە هـەموو کەموکوڕییـەك، بـۆ نموونـە لـە کەموکوڕییـەکان: کوێرییـە، ئـەو زاتـە بیینایـە، لــە کەموکوڕییەکان: کەڕییە، ئەو زاتە بیسەرە، لـە کەموکوڕییـەکان: لاڵییـە، ئـەو قسـەکەرەو ئاخاوتن دەکات.

هەموو دیاردەکان ئاماژەو بەڵگـەی ئـەوەن کـە ئـەم زاتـە هـەموو ئـەم سیفەتانەی تێدایە.

هەبووەو سەرەتای نیە کەواتە یەکەمینە،و کۆتایی نیە کەواتە دواهەمینـە (الآخـر)، هیـچ هـاوەڵو هاوشێوەیەکیشـی نیـە کەواتـە تـاکو تەنیایـە، هیـچ هاونموونەیەکیشـی نیـە کەواتە (قدوس) پیرۆزە، هیچ پێداویستیەکیشی بە کەس نیـە کەواتـە (قیـوم)-وەسـتاوە. بوویەکە سـیفەتی توانـای هەیـە کەواتـە (قـادر)ە، سیفەتی ژیـانی هەیـە کەواتـە زینـدووە (حي)، سیفەتی بیستنی هەیە کەواتە (سمیع)ە، سیفەتی بینینی هەیـە کەواتـە (بصـیر)ە، قسە دەکات کەواتە قسەکەرە (متکلم)، سـیفەتی زانینـی هەیـە کەواتـە (علیـم)ە، ئـیرادەو ویستی هەیە کەواتە (مرید)ە.

پێداویستی زۆری کاروفرمانەکانی پەروەردگاریش کە لە شـوێنەواری (العلم والإرادة والقدرة) بـەرپا بـووە، وا دەخوازێـت کـە (اللَّهُ)ی پـەروەردگار نـاوی زۆری هـەبێت، بـەڵام ئەدەب لەگەڵ پەروەردگاردا بەوە دەبێت کە هـەر بـەو ناوانـە نـاوی ببـەین خـۆی پـێ نـاو بردووە، بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەسەر ڕۆشنایی سروشـی چەسپاوو جێگیرەوە؛ چونکـە پـەروەردگار ﷻ تـەنیا خـۆی شـکۆی خـۆی دەزانێـت، تەنانـەت ئەوانـەش ناخەینـە پــاڵ

پـەروەردگار كـە پـێی دەشـێتو شایسـتـەیەتی "چاكـە هـەمووی لـە دەسـت خـۆت دایـەو شەڕیش ناگێڕدرێتەوە بۆ تۆ- الخير كله بيديـك والشـر لا ينسـب إليـك" كەواتـە هـەر بـەوە ناوی دەبەین كە خۆی پێ ناوناوە، سەرجەم ئەو ناوانەش لە زاتی خۆی ناوە بـە (الأسمـاء الحسنى) ناوزەد دەكرێن.

﴿الله لا إله إلا هو له الإسماء الحسنى﴾ طه/٨.

واتە: (خوا)یەك كە بێجگە لـەو مـەعبودێ تـر نیـە، هـەر بـۆ ئـەوە ناوگـەلێ جـوان و چاكە.

﴿قل ادعوا الله أو ادعوا الرحمن أيا ما تدعوا فله الأسماء الحسنى﴾ الإسراء/١١٠.

واتە: بڵێ: خوا یا ڕەحمان بانگ بكەن، هەر كامیان بانگ بكەن بۆ ئەو ناوگەلێ چاك هەیە.

﴿ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها وذروا الذين يلحدون في أسمائه﴾ الأعراف/١٨٠.

واتە: و هەر بۆ خوایە جوانترینی ناوەكان، جا بەوانە بـانگی بكـەن، و ئەوانـەی كـە دەست ئەدەن لە ناوی خوا خۆ لائەدەن (هاوبەشی بۆ دائەنێن) وازیان لێ بێنن.

هەموو ناوێكیش لەو ناوە پیرۆزانەی كە لە قورئـانو سوننەتدا هـەن لـە گـەردووندا دیاردە هەن ئاماژەیان بۆ دەكات.

ئەم ناوانەش وەك لــە قورئانو سوننەتدا هاتووە، هەندێ جار ئاماژەی سیفەتە سلبییەكانمان بۆ دەكەن، هەندێ جاری تریش سیفەتە وجوودییەكان، هەندێ جاری تریش ئاماژەی سیفاتە كـەمالیو تـەواوەكانمان بـۆ دەكـات، چـەند جـارێكیش سـیفەتە كرداریو فرمانیەكانمان بۆ دەست نیشان دەكەن، سەرجەم كۆی ڕەسەنایەتی ئـەم سـیفاتانەیان لـە خۆ گرتووە.

ئەو ناوانەی (ﷲ)ی پەروەردگاریش كە لە قورئانو سوننەتدا هاتوون زۆرن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموو سیفەتەكان نین. چونكە لە فەرموودەدا هاتووە ((اللهم إني أسألك بكل إسم هو لك، سميت به نفسك، أو أنزلته في كتابك، أو استأثرت به في علم الغيب

عندك)) مانای: پەروەردگارا پەنا ئەگرم پێت‌و داواکارم لێت بە هەموو ناوەکانت کە خۆتت پێ ناوناوە، یان لە پەڕاوەکەتدا دات بەزاندووە، یان لە زانستی پەنهان –علم الغیب– لای خۆت هێشتووتەوە.

لێرەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت ئـەوەی کـە باسـکراوە هـەموو ناوەکـان نـین، چونکـە شکۆو مەزنی‌و پیرۆزی پەروەردگار تەواو نابێت‌و بە پایان ناگات، بـەڵام ئـەوەی باسـکراوە دیاردەکانی گەردوون بە شێوەی ئاشکرا یـا نـاواخنەوە ئاماژەیـان پێداوە، جـا هـەچ کـاتێك بەڵگەی ژیریی لەگەڵ بەڵگەی دەقدا یەکانگیر بوون، ئەوا بەڵگەی ساغ‌و دروسـتیی ژیریـی‌و دەقە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت لە دوو توێی باسی ناو وسیفەتەکاندا تێبینی دوو خاڵی گرنگ بکەین کە مامۆستا (بەننا) ئاماژەی پێداوە:

مامۆستا بـەننا لـە ژێـر ناونیشـانی (لـە نێـوان سـیفەتی خوداوەنـدو سـیفەتی بەدیهاتووەکاندا) دەڵێ:

ئەوەی کە بڕوادار دەبێت پەی پێ بەرێت، ئەوەیە بزانێ مەبەسـت لـە مانـای زاراوەی سیفاتەکانی خوای گەورە چییە؟ بە شێوەیەکی هەمەکی:جیاوازە لەو مانایەی کە مەبەستە لە هەمان زاراوەدا سەبارەت سیفەتی بەدیهاتووەکان، بۆ نموونە تۆ دەڵێیت: (الله)زانایـەو زانینیش سیفەتێکێتی،و دەڵێیت فـلان کـەس زانایـەو زانسـتیش یەکێکـە لـە سـیفەتەکانی خەڵك، ئایا ئەوەی مەبەستە لە هەردوو زاراوەکـەدا یەکە؟ حاشـا وا نیـە، چونکـە زانستی پـەروەردگار زانسـتێکە تەواوێتییەکـەی بـە پایـان ناگـات، زانسـتی هیـچ بەدیـهاتووێکیش ناتوانرێت لە تەنیشتییەوە دابـنرێت‌و تەماشـا بکرێـت. هـەروەها ژیـان، و بیسـتن‌و بینـین‌و قسـەو دووان‌و هـەروەها توانـاو ویستەکانیشـی، ئەمانـە هـەمووی مانـای زاراوەیـەکن کـە جیـاوازن لـە مانایـان سـەبارەت مـاف بەدیـهاتووەکان، لـە رووی تـەواوێتی –الکمـال–و چۆنێتییەوە:جیاوازییەکی بنەڕەتیان هەیە، چونکە خوداوەنـدی مـەزن‌و پـڕ شـکۆ لـە هیـچ دروستکراوێکی ناچێت، جا پـەی بـەم مانایـە بـەرە چونکـە زۆر وردە تـۆش داواکـراو نیـت بەوەی کـە حەقیقـەت‌و کونهەکـەی بزانیـت، بـەڵام هێنـدە بەسـە شـوێنەوارەکانی لـەم

گەردوونەدا ببینیت و تێبگەیت، داخوازیو پێداویستییەکانی لە تۆ چییە، خوازیارین لە پەروەردگار لە هەتڵەبوون بمانپارێزێو باشترین تەوفیقمان بدات.

هەروەها مامۆستا (بەننا) لە ژێر سەردێڕی ( بیر کردنەوە لە زاتی خودا) دەفەرموێت:

لە ئیبن عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە کۆمەڵێك هەبوون بیریان لە خودا دەکردەوە(ﷻ).پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون:((**تفكروا في خلق الله ولا تتفكروا في الله، فإنكم لن تقدروا قدره**)) قال العراقي: رواه أبو نعيم في الحلية بإسناد ضعيف، ورواه الأصبهاني في الترغيب والترهيب بإسناد أصح منه، ورواه أبو الشيخ. هەر چۆنێك بێت ماناکەی دروستە.

مانای ئەوە دەدات: بیر لە دروستکراوەکانی خودا بکەنەوە نەك لە زاتی خودا، چونکە ئێوە پەی پێ نابەن.

ئەمەش نابێتە ئاستەنگ لە رووی سەربەستی بیر کردنەوەدا، وەستانو مەینیش نیە لە لێکۆڵینەوەدا، تەنگەبەر کردنی ژیرییش نیە، بەڵام پاراستنە لە لارێ بوونو کەوتنە ناو گومڕاییەوە،و دوور کەوتنەوەیە لە باسێك کە هۆکاری لێکۆڵینەوەیمان لە بەر دەستدا نیە، تەحەممولو توانای هێزەکەی ناکەین هەرچەندە چارەسەرەکەی گەورە بێت، ئەمەش رێی پیاوچاکان بووە(لە بەندە خواناسەکان)کە گەورەیی زاتو شکۆیی وتوانای پەروەردگاریان هەست پێکردووە، جا تۆش هیممەتت جەم کە لە درك کردنی گەورەیی پەروەردگارتا، بەوەی بیر لە دروستکراوەکانی بکەیتەوە، پابەندی پێداویستیو خواستی سیفاتەکانی بیت.

۞۞۞

پێمان خۆشە لەم برگەیەدا تێڕوانینی قورئانو سوننەت لەم بارەیەوە بخەینە روو بەو پێیەی دوو تاکە سەرچاوەی مەعریفەن بۆمان، لە رێی سروشتێکی راستەقینەوە کە بەڵگەی تەواوی لەسەر دادەمەزرێت، بە پشتیوانی خودا وەك دەیبینیت سەرجەم

سیفاتەكانی خودای گەورە باس دەكەین كە لە قورئاندا هاتووە، هەندێك لە ناوە پیرۆزەكانیشی دەخەینە روو كە لە قورئان‌و سوننەتدا باسیان كراوە، تا بۆمان دەركەوێت لەوەی كە بە عەقڵ دیاردەكان بەڵگەی خۆیان سەلماند لەم روانەوە، ئەوا قورئان‌و سوننەتیش بە سروشتی راستەقینە لە رێی گواستنەوە (النقل) دەیگەیەنێت.

مامۆستا البنّا لە ژێر ناونیشانی (مجمل صفات الله في القرآن) دەڵێت:-

قورئانی پیرۆز ئامارەی بە هەندێك لە سیفەتە واجبەكانی خوای گەورە داوە، كە تەواوێتی خوداوەند پێویستیان ئەكات، ئەمەش هەندێكن لەو ئایەتانە:

١- بوونی خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الله الذي رفع السماوات بغير عمد ترونها ثم استوى على العرش وسخر الشمس والقمر كل يجري لأجل مسمى يدبر الأمر يفصّل الآيات لعلكم بلقاء ربكم توقنون، وهو الذي مد الأرض وجعل فيها رواسي وأنهارا ومن كل الثمرات جعل فيها زوجين اثنين يغشي الليل النهار إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون، وفي الأرض قطع متجاورات وجنات من أعناب وزرع ونخيل صنوان وغير صنوان يسقى بماء واحد ونفضل بعضها على بعض في الأكل إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون﴾ الرعد/٢-٤.

واتە: خوایە!ئەوەی كە ئاسمانەكانی بێ كۆڵەكەیێ كە ببینین بەرز كردۆتەوە، لەپاشان بەسەر عەرشدا دەسەڵاتی پەیاكرد (كاروباری گرت بە دەستەوە) و مانگ و رۆژی فەرمانبەر كرد، هەر كامیان تا رۆژگاری دیاری كراو دەگەڕێن، ئەو تەگبیری كارەكان دەكا، ئایەتەكان (بۆ ئێوە) شی دەكاتەوە تا بەڵكو بە دیداری خوا یەقین پەیا بكەن، و هەر ئەوە كە زەوی راكێشاوەو پانی كردۆتەوەو لەوێدا چیاو زەریای داناوەو لە هەموو بەرومیوەیەك جوتێ (نێرو مێی) خولقاندووە، (پەردەی رەش) شەو دەكاتە بەر رۆژ، بەڕاستی لەمانەدا نیشانەگەلێك هەیە بۆ ئەوانەی بیری لێدەكەنەوە، ولەزەویدا كەرت (پاژ)گەلێ لە كەناری یەكتر هەن كە لێك جیان، و باخگەلێك لە ترێی جۆراوجۆر و كشتوكاڵ و بێستان و

باخەکانی خورما کە لکەکانی لەسەر یەکن، واتا (بن و ریشە)ی پێ دەڕوێن، هەموو ئەوانە لە یەك ئاو، ئاو ئەدرێن، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لەوانە لە بابەت میوەو تام و مەزەوە بەسەر هەندێ تریاندا سەر دەخەین، بەڕاستی لەمەدا نیشانە گەلێك هەیە بۆ ئەوانە ئەقڵی خۆیان دەخەنە کار.

﴿وهو الذي أنشأ لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلا ما تشكرون، وهو الذي ذرأكم في الأرض وإليه تحشرون، وهو الذي يحيي ويميت وله اختلاف الليل والنهار أفلا تعقلون﴾ المؤمنون/٧٨-٨٠.

واتە: ئەو زاتێکە، گوێ و چاو و دڵ (ئەقڵ)ی بۆ ئێوە ساز داوە، بەڵام زۆر کەم سپاسی ئەو بەجێ دێنن، و ئەو زاتێکە ئێوەی لە زەوی بەدیهێناو لای ئەو حەشر دەکرێن، و ئەو زاتێکەو زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ و هاتووچۆی شەوو رۆژ بەوە، ئایا بیر ناکەنەوە ؟!.

جا هەموو ئەم ئایەتانە سەبارەت بوونی خوای گەورە وریات دەکاتەوە، مامەڵەو هەڵس و کەوتی خوداوەندیش لە کاروباری ئەم گەردوونە سەراسیمەیەدا بەڵگەیە لەسەر وتەکەمان.

**٢-٣- دێرینی و مانەوەی پەروەردگار:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هو الأول والآخر والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم﴾ الحديد/٣.

واتە: هەر خوایە ئەوەل و ئاخرو زاهیرو باتین، و هەر ئەوە بە هەموو شتێك ئاگایە.

و دەفەرموێت: ﴿ولا تدع مع الله إلها آخر لا إله إلا هو كل شيء هالك إلا وجهه له الحكم وإليه ترجعون﴾ القصص/٨٨.

واتە: و لەگەڵ خوا کەسێ تر بانگ مەکە، هیچ مەعبودێ بێجگە لە خوا نیە، هەموو شتێك تیا دەچێت، مەگەر زاتی پاکی ئەو نەبێت، فەرمان و حکومەت تایبەت بەوەو تەنیا بۆ لای ئەو دەگێڕدرێنەوە.

و دەفەرموێت: ﴿كل من عليها فان، ويبقى وجه ربــــك ذو الجــلال والإكــرام﴾ الرحمن/٢٦-٢٧.

واتــە: هــەرچی لەســەر رووی زەوی دایــە تیـا ئـەچێت،و تـەنیا زاتـی خـاوەن شـكۆو بەرێزی پەروەردگارت دەمێنێتەوە.

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە ئامـاژەی هـەردوو سـیفەتی دێرینـیو مانـەوەی پـەروەردگار هەیە.

٤- جیاوازی و موخالەفەی خوای گەورە بۆ رووداو وبەرپابووەكان:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل هو الله أحد، الله الصمد، لم يلد ولم يولد، ولم يكـن له كفوا أحد﴾ سورە الإخلاص.

واتە: بڵێ: خوا تاكو تەنیایە، خوایەكی بێ نیاز (كە نیازمەندان روو دەكەنە ئەو كە نیازیان جێبەجێ بێت)، (هیــچ شـتێك) لێـی نـەبووەو (لـە هیـچ شـتێكیش) نـەبووە،و هیـچ هاولفـو هاوتایەكیش بۆ ئەو نیە.

و دەفەرموێت: ﴿السماوات والأرض جعل لكم من أنفسكم أزواجا ومـــن الأنعــام أزواجا يذرؤكم فيه ليس كمثله شيء وهو السميع البصير﴾ الشورى/١١.

واتە: (خوا) بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوییە، بۆ ئێوە هەر لە خۆتــان هاولفـانێكی داناوەو هەروا بۆ ئاژەڵیش لفی بەدیهێناوە لە رێگەی هاولفانتانــەوە ژمارەتـان زیـاد دەكـا، شتێك بە وێنەی خوا نیە،و هەر ئەویشە ژنەواو بینا.

ئەمانەش ئاماژەی نـاوێكچوونی خـوای گـەورە دەردەخـەن بـۆ پێكهاتووەكانی لـە رووی خەلقو نەبوونی منداڵو باوكو هاو وێنەو هاو شێوەوە.

٥- قیام و وەستانی خودا بۆ خۆی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يا أيها الناس أنتم الفقراء إلى الله والله هو الغني الحميد﴾ فاگر/١٥.

واتە: ئەی خەڵكینە هەمووتان نیازتان بــە خوایــە،و هــەر خوایــە بـێ نیـازو شـیاوی حەمدو پەند.

و دەفەرموێت: ﴿ما أشهدهم خلق السماوات والأرض ولا خلق أنفسهم وما كنت متخذ المضلين عضدا﴾ الكهف/٥١.

واتە: لە کاتی بەدیهاتنی ئاسمانەکانو زەویدا حازرم نەکردنو هەروەها لە کاتی بەدیهاتنی خۆیان(حازرم نەکرد)، من لاڕێیان ناکەمە دەست یاری خۆم.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إن الله يمسك السماوات والأرض أن تزولا﴾ فاطر/٤١.

واتە: بەڕاستی خوا ئاسمانەکانو زەوی رادەگرێ تا تێك نەچن (لە رێـڕەوی خۆیان لا نەدەن).

﴿الله لا إله إلا هو الحي القيوم﴾ البقرة/٢٥٥.

واتە: ﷲ (زاتێکە داگری هەموو جۆرە سیفاتی کەماڵە) کە هیچ مەعبودێ نیە بێجگە لە ئەو کە زیندووو راوەستاو بە زاتی خۆیەتی.

لەمەشدا ئاماژەی وەستانی پەروەردگار دەگەیەنێت بۆ خۆیو پێداویستی نەبوونی بە دروستکراوەکانی، بەڵکو بەدیهێنراوان هەموو ئاتاجی خوداوەندن.

**٦- تاك و تەنیایی (ﷲ):**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وقال الله لا تتخذوا إلهين اثنين إنما هو إله واحد فإياي فارهبوني، وله ما في السماوات والأرض وله الدين واصبا أفغير الله تتقون، وما بكم من نعمة فمن الله ثم إذا مسكم الضر فإليه تجأرون﴾ النحل/٥١-٥٣.

واتە: و خوا فەرمانی داوە دوو مەعبوود نەگرن، مەعبودی (ئێوە) تەنها یەکێکە، جا تەنیا لە من بترسن،و ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی ئەوە،و دین (تاعەت) هەمیشە بۆ ئەوە، جا ئایا لە غەیری خوا دەترسن؟!و ئەوەی لە نازو نیعمەت هەتانە لە خواوەیە لە پاشان هەر کاتێ تووشی دەردو رەنجێك بوون، هاوار بۆ ئەو دەبەن.

و دەفەرموێت: ﴿لقد كفر الذين قالوا إن الله ثالث ثلاثة وما من إله إلا إله واحد وإن لم ينتهوا عما يقولون ليمسن الذين كفروا منهم عذاب أليم، أفلا يتوبون إلى الله ويستغفرونه والله غفور رحيم﴾ المائدة/٧٣-٧٤.

واتە: بە هەقیقەت کافر بوون کەسانێ کە وتیان: بەڕاستی خوا یەکێکە لە سێ خوا، (لە حاڵێکدا) مەعبودێ بێجگە لە خوای تاقانە (مەوجود) نیە،و ئەگەر دەست لەو قسانە هەڵنەگرن، عەزابی دەرداوی بە کەسانی لەوان کە کافر بوون دەگا، جا ئایا لای خوا تۆبە ناکەن (و لە گوناح کردن ناگەڕێنەوە)و داوای لێخۆشبوون لە خوا ناکەن؟و خوا غەفورو رەحیمە.

و دەفەرموێت: ﴿أم اتخذوا آلهة من الأرض هم ينشرون، لو كان فيهما آلهـة إلا الله لفسدتا فسبحان الله رب العرش عما يصفون، لا يسأل عما يفعل وهم يسألون، أم اتخذوا من دونه آلهة قل هاتوا برهانكم هذا ذكر من معي وذكر من قبلي بل أكثرهم لا يعلمون الحـق فهم معرضون، وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إليه أنه لا إله إلا أنا فـاعبدون﴾ الأنبياء/٢١-٢٥.

واتە: ئایا ئەوانەخوایانێکیان لە زەوی (بۆ خۆیان) هەڵبژاردووە کە ئەوانە (مردوو) دەژیێننەوە؟ ئەگەر لەئاسمانو زەوی خوایانێ غەیری(ﷲ) هەبوانە، فاسید دەبوون، سروشتی جیهان تێك دەچوو، جا پاكو بێ خەوشە خودا پەروەردگاری عەرش لە پەسنێ کە ئەوانە دەیکەن، لە کارێ کە دەیکا ناپرسرێ (و رەخنەی لێ ناگیردرێ)،و لە کاری ئەوان دەپرسرێو (رەخنە) دەگیردرێ، ئایا ئەوانە بێجگە لە خودا مەعبودگەلیان هەڵبژاردووە؟ بڵێ: بەڵگەتان بێننەوە، ئەمە قسەی ئەوانەیە کە لەگەڵ منن (و لە من فێر بوون)و قسەی کەسانێکە (پێغەمبەرانێکە) کەبەر لە من هەبوون، بەڵام زۆربەی ئەوانە حەق نازانن، جا لەبەر ئەمە (لەحەق رووسوڕێنەرن)،و ئێمە بەر لە تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە، مەگەر ئەوە کە وەحیمان پێ کردن کە بێجگە لە من مەعبودێکی دیکە نیە، جا کەوایە تەنیا من بپەرستن.

و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل لمن الأرض ومن فيها إن كنتم تعلمون، سـيقولون لله قل أفلا تذكرون، قل من رب السماوات السبع ورب العرش العظيم، سيقولون لله قل أفلا تتقون، قل من بيده ملكوت كل شيء وهو يجير ولا يجار عليه إن كنتم تعلمون، سـيقولون لله

قل فأنى تسحرون، بل أتيناهم بالحق وإنهم لكاذبون، ما اتخذ الله من ولد وما كان معه من إلـه إذا لذهب كل إله بما خلق ولعلا بعضهم على بعض سبحان الله عما يصفون، عـالم الغيـب والشهادة فتعالى عما يشركون﴾ المؤمنون/٨٤-٩٢.

واتە: بڵێ: زەویو کەسانێ کە لەزەوی دان هی کێیە، ئەگەر دەزانن، (لـە وەڵامـدا) دەڵێـن: هـەمووی هـی خوایـە، بڵـێ: ئایـا ناهێننـەوە بـیر، بڵـێ چ کەسـێ فـەرمانڕەوایی و حکومەتی هەموو شتێکی بە دەستە؟و بە بێ پـەنایان پـەنا ئـەداو نیازیشـی بـە پـەنادان نیە، ئەگەر بزانن، ئەڵێن: (هەموو ئەوانە) هی خوان، بڵـێ: جـا چلـۆن ئێـوە سـیحرو جـادو لێکراون بەڵام ئێمە هەقمان بۆ ئەوان هێناو بەڕاستی ئەوان درۆزنن، خودا منداڵی بـۆ خـۆی هەڵنەبژاردووەو مەعبودێ تر لەگەڵ ئـەودا نیـە (کـە ئەگـەر وا بوایـەو خـوای تـر لـە گـەڵی هەبوایە، لەو کاتە هەر یەکە لە خواکان خەریکی کـاری مـەخلوقی خـۆی دەبـوونو هـەندێ بەسەر هەندێکدا بەرز دەبوونەوە، خوا لەو پەسنانەی کە دەیکەن پاکو بێخەوشـە، کـە بـە دیارو نادیار ئاگادارە، جا ئەو لەوە بەرزترە کە هاوبەشی بۆ دابنێن.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قل الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفـى آلله خير أما يشركون، أمن خلق السماوات والأرض وأنزل لكم من السماء ماء فأنبتنا بـه حدائق ذات بهجة ما كان لكم أن تنبتوا شجرها أإله مع الله بل هم قوم يعدلون، أمن جعـل الأرض قرارا وجعل خلالها أنهارا وجعل لها رواسي وجعل بين البحرين حاجزا أإله مع الله بـل أكثرهم لا يعلمون، أمن يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الأرض أإلـه مع الله قليلا ما تذكرون، أمن يهديكم في ظلمات البر والبحر ومن يرسل الرياح بشرا بـين يدي رحمته أإله مع الله تعالى الله عما يشركون، أمن يبدأ الخلق ثم يعيده ومن يرزقكـم مـن السماء والأرض أإله مع الله قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين﴾ النمل/٥٩-٦٤.

واتە: بڵێ سـوپاس تایبـەتی خودایـەو سـەلام (درود) لەسـەر بـەندەکانی کـە خـۆی هـەڵیبژاردووە، ئایـا خـودا باشـترە یـا بتگـەلێ کـە ئەیکەنـە هاوبەشـی، یـا ئـەو زاتـەی کـە

ئاسمانەکان‌و زەوی بەدیهێناو لە ئاسمانەوە باران بۆ بـاراندن، جا بـە هـۆی ئـەو بارانـەوە باغ‌و بێستانی بە دیمەن‌و جوانمان بۆ شین کردن، لە حاڵێکدا کە ئێوە توانای شـین کردنـی دارەکەشتان نیە، ئایا مەعبودی دیکە لەگەڵ خودا هەیە؟ نا نیە، بەڵام ئەوانە هۆزێکن لە حەق لایان داوەو لا ئەدەن، یا کەسێ کە زەوی کردۆتە جێی قـەرار گرتـن‌و لـە نێـو ئـەودا چۆمی داناوەو کێوی پتەوی بۆ سازداوەو لە نێـوان دوو دەریـای (سـوێرو شـیرین) مـانیعی خۆڕسکی‌و تەبیعی (وزنی تایبەتی) داناوە (تا تێکەڵاو نەبم بەم حاڵە) ئایا مەعبودێ لەگەڵ خودا هەیە (هاوبەشی بێ)؟ نا نیە بەڵکو زۆربەی ئەوانە نەزان‌و (جاهیلن)، یـا کەسـێ کـە وەڵامی هەژاران ئەداتەوە، کاتێ هاواری بۆ بەری کەندو کۆسپی بۆ لادەبا،و ئێـوە دەکاتـە جێنشینی پێشینان لە ئەرزدا، ئایا مەعبودێ لەگـەڵ خـودا هەیـە، (نـا نیـە) خـودا بـەرزتر لەوەیە کە هاوبەشـی بـۆ دابنێـن، یـا کەسـێ کـە ئافـەرینیش دەس پـێ دەکـاو لـە پاشـان دەیانگێڕێتەوە،و کەسێ کە لە ئاسمان‌و زەوی رسق‌و رۆزیتان ئەدا، ئایا مـەعبودێ لەگـەڵ خودا هەیە؟ (نا نیە) بڵێ: بەڵگەتان بێنن ئەگەر راست بێژن؟.

و چەندان ئایەتی تر جگە لەمانە ئەوە دەردەخەن کە پەروەردگار تاک‌و تەنیایـە لـە زاتیدا، تاکە لە سیفاتیدا، تاکە لە کردارو رەفتارو هەڵس‌و کەوتیدا، هیچ پەروەردگارێکی تر نیە جگە لە ئەو،و هیچ خوایەکی تریش نیە جگە لە ئەو.

**٧- توانای (اللهﷻ)ی مەزن:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يا أيها الناس إن كنتم في ريب من البعث فإنا خلقنـاكم من تراب ثم من نطفة ثم من علقة ثم من مضغة مخلقة وغير مخلقة لنبين لكم ونقر في الأرحام ما نشاء إلى أجل مسمى ثم نخرجكم طفلا ثم لتبلغوا أشدكم ومنكم من يتوفى ومنكم من يرد إلى أرذل العمر لكيلا يعلم من بعد علم شيئا وترى الأرض هامدة فإذا أنزلنا عليها الماء اهــتزت وربت وأنبتت من كل زوج بهيج، ذلك بأن الله هو الحق وأنه يحيي الموتى وأنه على كل شيء قدير، وأن الساعة آتية لا ريب فيها وأن الله يبعث من في القبور﴾ الحج/٥-٧.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەگەر لە زیندوو بوونەوە دڕدۆنگن، جا (سەرنجی ئەمە بدەن) بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە خاك بەدیهێنا، لە پاشان لە نوتفەو دوای ئەوە لە خوێنی مەییو، لە پاشان لە گۆشتی جەویو کە هەندێ تەواوەو بڕێکیش ناتــەواوە، (مەبەست ئەمەیە) تا بۆتان روون بکەینەوە (کە بەسەر هەر شتێکدا توانایین)،و هەر پڕێك کە بمانەوێ لە پزدانـدا تا ماوەیەکی دیاری کراو رایدەگرین (و ئەگەر بشمانەوێ بەری پێدەخەین)، لــە دواییـدا بـە وێنەی زارۆك (کچ یا کوڕ) دەتان هێنینە دەرێ، جا ئامانج ئەمەیە کە پــێ بگـەن‌و بلوغتـان ببێ،و (لەم نێوەدا) هەندێکتان دەمرن‌و هەندێکیشتان ئەوەندە عومـر دەکـەن تـا دەگەنـە ئەو پەڕی پیری، بە جۆرێکی وا کە لە زانست‌و زانینی خۆتان شتێکتان وەبیر نایەتەوە، (لە لایەکی دیکەوە لە زستاناندا) زەوی ویشك‌و بێ گیـان دەبینـی، جـا کاتـێ بـارانی بەسـەردا دەبارێنین، دەبزوێ‌و بە جوڵە دەکەوێ‌و هەڵ دەدا،و لە هەموو هاولفەکان گیایـەکی جـوان دەڕوێنـێ ئەمـە لەبـەر ئەوەیـە کـە بزانـن خـوا هەقـــەو مردووەکــان زینــدوو دەکاتــەوە،و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە،و بـە هەقیقـەت رۆژی بـەرێ دێ‌و شـکی تێـدا نیـەو بەڕاستی خوا هەموو ئەو کەسانەی کە لە قەبردان زیندوویان دەکاتەوە.و دەفەرموێت ﴿مـا أشهدهم خلق السماوات والأرض ولا خلق أنفسهم وما كنت متخـــذ المضلــين عضـــدا﴾ الكهف/٥١. واتە: لە کاتی بەدیـهاتنی ئاسمانـەکان‌و زەویـدا حـازرم نـەکردن‌و هـەروەها لـە کاتی بەدیهاتنی خۆیان(حازرم نەکرد)، من لارێیان ناکەمە دەست یاری خۆم.

و دەفەرموێت: ﴿ولقد خلقنا السماوات والأرض وما بينهما في ستة أيام وما مسنا من لغوب﴾ ق/٣٨.

واتە: و بە هەقیقەت ئێمە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی لەنێوان ئەواندایە لـە شـەش رۆژ (دەوران)دا خوڵقاندمان‌و رەنج‌و ماندوو بوونیشمان پێ نەگەیی.

و دەفەرموێت: ﴿وهو الذي مرج البحرين هذا عذب فرات وهذا ملح أجاج وجعـل بينهما برزخا وحجرا محجورا، وهو الذي خلق من الماء بشرا فجعله نسبا وصهرا وكان ربـك قديرا﴾ الفرقان/٥٣-٥٤.

واتە: ئەوە كە دوو دەریای لە كەناری یەك(وەك نیـوە تێكـەڵاو) دانـاوە، یـەكێكیان زۆر خۆشەو ئەوی تریان سوێرو تاڵو داغو تفتەو لە نێـوان ئـەواندا پەردەیـەكی داناوە(تـا تێكەڵ یەك نەبن، دەڵێی بـە یـەك دەڵێـن:) بـەدوور بـەو خـۆم لێ لادە، ئـەوە كـە لـە ئـاوی (مرۆڤ) ئینسانی بەدیهێناوەو ئەوی كردۆتە دوو بەرە(پیاوو ژن)،و پەروەردگارت هەمیشە توانایە.

و دەفەرموێت: ﴿ألم تر أن الله يزجي سحابا ثم يؤلف بينه ثم يجعله ركاما فترى الـودق يخرج من خلاله وينزل من السماء من جبال فيها من برد فيصيب به من يشاء ويصرفه عن من يشاء يكاد سنا برقه يذهب بالأبصار، يقلب الله الليل والنهار إن في ذلك لعبرة لأولي الأبصار، والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ومنهم من يمشي على أربع يخلق الله ما يشاء إن الله على كل شيء قدير﴾ النور/٤٣-٤٥.

واتە: ئایا نەتدی كە خوا بە ئارامی پەڵە هەورەكان لێ ئەخورێ، لـە پاشـان لـە نێـو ئەواندا پێوەند سـاز ئـەداو لـە پاشـان لەسـەر یـەك كەڵەكـەیان دەكـا، لـەم حاڵـەدا دڵۆپـە بارانەكان دەبینی كە لە لابەلای ئەوە دێتە دەرێو بیەوێ بەمە زیـانی پـێ دەگەیـەنێ هـەر كەسیش كە بیەوێ ئەم زیانەی لەسەر لا دەبا، نێزیكـە گرشـە گرشـی بـەرقی ئـەوە (پەڵـە هەورەكان) چاویان ببا (و لە كاریان بخا)، خوا شەوو رۆژ دەگۆڕێ (یەكیان كورتو ئـەوی تریان درێژ دەكاتەوە یا گەرماو سەرماو شتی تـر لـە شـەوو رۆژدا بـەدی دێنـێ)، بەڕاستی لەمەدا پەندێـك بۆ خاوەن ئاقڵان هەیە،و خوا هەر خزۆكو جوڵندەیەكی لە ئاو بەدیهێناوە، جا هـەندێ بـە زگ دەخشێن، هـەندێ لەسـەر دوو پـێ دەڕۆنو هـەندێ لەسـەر چـوار پـێ دەڕۆن، خوا هەچی بیەوێ خەڵقی دەكا، بەڕاستی خوا دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شـتێكدا هەیە.

و چەندان ئایەتی تر بەڵگەن لەسەر گەورەیی توانای پـەروەردگاری بـەرزو پـیرۆز،و سەراسیمەیی گەورەییو مەزنی.

٨- ویستی خودا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إنما أمره إذا أراد شيئا أن يقول لـــه كـــن فيكـــون﴾ يس/٨٢.

واتە: بەڕاستی فەرمانی ئەم ئەوەیە کە هەر کاتێ بیەوێ شتێ بەدی بهێنێ پێی دەڵێ: ببە، جا بێ درەنگ دێتە دی.

و دەفەرموێت: ﴿وإذا أردنا أن نهلك قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها فحـــق عليـــها القول فدمرناها تدميرا﴾ الإسراء/١٦.

واتە: و هەر کاتێ بمانەوێ شارو دێیەك لە ناو بەرین لە سەرەتاوە فەرمانی خۆمـان بۆ موترەفین (ماڵدارانی لە خوا بێ خەبەر) بەیان کرد، جا نا فەرمانی(فەسادیان) کرد، جا شیاوی سزادانیان پەیا کرد، جا بە توندی ئەوانە دەکوتین.

و خوای گەورە لـە بەسـەرهاتی خضر لەگەڵ موسا پێغەمبەردا (عليهما السلام) دەفەرموێت: ﴿فأراد ربك أن يبلغا أشدهما ويستخرجا كنزهما رحمة من ربك وما فعلته عـــن أمري ذلك تأويل ما لم تستطع عليه صبرا﴾ الكهف/٨٢.

واتە: جا پـەروەردگارت ویستی بگەنە تەمەنی بلوغو گەنجەکەیان بێننە دەرێ، ئەوە رەحمەتێ بوو لە پەروەردگارتەوە (بۆ ئەوان) من لەخۆمەوە ئەو کارەم نەکردو ئەمە رازی ئەو کارانە بوو کە تۆ تا بشتت لەسەر ئەوان نەهێنا.

و دەفەرموێت: ﴿يريد الله ليبين لكم ويهديكم سنن الذين من قبلكم ويتوب عليكـــم والله عليم حكيم، والله يريد أن يتوب عليكم ويريد الذين يتبعون الشهوات أن تميلوا ميـــلا عظيما، يريد الله أن يخفف عنكم وخلق الإنسان ضعيفا﴾ النساء/٢٦-٢٨.

واتـە: خـوا ئەیـەوێ (رێگـای بەختـەوەری) بـۆ ئێـوە روون بکاتـــەوەو بـەرەو رێو رەوشـتی (دروسـتی) پێشـینان رێنوێنیتـان بکـاو تۆبـەتان قـــەبووڵ بکـا،و خـوا عـەلیمو حەکیمە،و خوا ئەیەوێ تۆبەتان لێ قەبووڵ بکا (تـا لـە لاڕێ لاتـان بـدا)،و کەسـانی کـە بـە دوای دامرکاندنی ئارەزووەکانی نەفسانیدا ئەڕۆن، ئەیانەوێ بە تـەواوی ئێـوە لاڕێو خـوار

بن، خوا ئەیەوێ کارتان بۆ ئاسان بکا، (چونکە) ئینسان لە راسـت ئـەویندا، زەعیـفو بـێ هێز خولقێندراوە.

جگە لەمانەش چەندان ئایەتی پیرۆزی تر ئاماژەی چەسپانی ویستی خـوای گـەورە دەکەن،و ویستی ئەو لەسەر هەموو ویستو تواناو خواستێکەوەیە: ﴿وما تشـــاءون إلا أن يشاء الله رب العالمين﴾ التكوير/٢٩.

واتە: و ئێوە ناتانەوێ مەگەر (ئەوەی کە) خوا بیەوێ کە پەروەردگاری جیهانیانە.

٩- زانستی خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الحمد لله الذي له ما في السماوات وما في الأرض ولـــه الحمد في الآخرة وهو الحكيم الخبير، يعلم ما يلج في الأرض وما يخرج منها وما يـــترل مـــن السماء وما يعرج فيها وهو الرحيم الغفور﴾ سبأ/١-٢.

واتە: هەموو سـتایش بـۆ خوایـە کـە هـەرچی لـە ئاسمانـەکانو هـەرچی لـە زەویدایـە تایبەتی ئەوە،و لەو دونیاش ستایش بەوەو هەر ئەویشـە حەکیمو ئاگا، هەرچی بـە زەویـدا رۆچێو هەرچی لە زەویدا بێتە دەرێ هەرچی کە لە ئاسمان بێتە خوارێو هەرچی بە ئاسماندا هەڵگەڕێ دەیزانێ،و ئەو دڵاواو لێبوورە.

و دەفەرموێت: ﴿يعلم ما في السماوات والأرض ويعلم ما تسرون وما تعلنـــون والله عليم بذات الصدور﴾ التغابن/٤.

واتە: هەرچی لە ئاسمانـەکانو زەویدایـە دەزانـێ،و بـەوەی ئەیشـارنەوەو ئاشـکرای دەکەن ئاگایەو خوا ئەوەی لە نێو دڵو دەرووندایە دەزانێ.

و خوای گەورە لە بەسەرهاتی لوقماندا لە ئامۆژگاری کوڕەکەیدا دەفەرموێت: ﴿يـــا بني إنها إن تكن مثقال حبة من خردل فتكن في صخرة أو في السماوات أو في الأرض يأتِ بها الله إن الله لطيف خبير﴾ لقمان/١٦.

واتە: ئەی کوڕە چکۆلەکەم! ئەگەر بە ئەندازەی دەنکە ئالەتێك (کردەوەی چاك یا خراپ) لە نێو دڵی بەردا یا لە گۆشەیەك لە ئاسمانەکانو زەویدا هەبێ، خوا لە (ڕۆژی بەرێدا) دەی هێنێتە حیساب، بەڕاستی خوا وردبینو ئاگادارە.

وخوای گەورە لە بەسەرهاتی نێوان شوعەیبو خێڵەکەیدا دەفەرموێت: ﴿قال المــلأ الذين استكبروا من قومه لنخرجنك يا شعيب والذين آمنوا معك من قريتنا أو لتعودن في ملتنا قال أولو كنا كارهين، قد افترينا على الله كذبا إن عدنا في ملتكم بعد إذ نجانا الله منها ومــا يكون لنا أن نعود فيها إلا أن يشاء الله ربنا وسع ربنا كل شيء علما على الله توكلنــا ربنــا افتح بيننا وبين قومنا بالحق وأنت خير الفاتحين﴾ الأعراف/٨٨-٨٩.

واتە: ئەشراف هۆزی، ئەوانەی کە خۆیان بە زل ئەزانی، وتیان: ئەی شوعەیب! بێ شك کە تۆو ئەوانەی بڕوایان بە تۆ هێنــاوە لە ئاوایی خۆمان دەریان ئەکەین یان ئەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینی ئێمە، وتی: ئای هەر چەند پێشمان خۆش نەبێ؟!، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئایینی ئێوە، دوای ئەوەی خوا لەوەی ڕزگاری کردووین، بە حەقیقەت درۆمان بە دەم خواوە کردووە،و شیاو نیە کە ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئەوە، مەگەر خوایێ کە پەروەردگارمانە بیەوێ، ئاگاداری پەروەردگارمان هەموو شتێکی داگرتووە، تەنیا پاڵپشتمان بە خودایە، ئەی پەروەردگاری ئێمە، گرێ بوچکەی نێوان ئێمەو ئەوان بەحەق بکەوە (و داوەریمان بکە)،و هەر تۆ چاکترین (داوەرو) گرێ کوێرە کەرەوەی.

و دەفەرموێت: ﴿ألم تر أن الله يعلم ما في السماوات وما في الأرض ما يكون من نجوى ثلاثة إلا هو رابعهم ولا خمسة إلا هو سادسهم ولا أدنى من ذلك ولا أكثر إلا هو معهم أين ما كانوا ثم ينبئهم بما عملوا يوم القيامة إن الله بكل شيء عليم﴾ المجادلة/٧.

واتە: ئایا نەتزانیوە کە بەڕاستی خوا ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە ئەی زانێ، هیچ کاتێ سێ کەس پێکەوە سرتە ناکەن مەگەر ئەوەی کە خوا چوارەمینیانەو هیچ دەمێ پێنج کەس پێکەوە بە سرتە قسە ناکەن مەگەر ئەوەی کە خودا شەشەمینیانە،و نە کەمترو نەزیاتر لەوە، مەگەر ئەوەی کە خوا لەگەڵیانە، لە هەرکوێ بن، لە پاشان ئەوان

لەو کارەی کە کردوویانە لە رۆژی قیامەت ئاگاداریان دەکا، بەڕاستی خوا بـە هـەموو شتێ زانایە.

و دەفەرموێت: ﴿وما تكون في شأن وما تتلو منه من قرآن ولا تعملون من عمـــل إلا كنا عليكم شهودا إذ تفيضون فيه وما يعزب عن ربك مـــــن مثقـــال ذرة في الأرض ولا في السماء ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتاب مبين﴾ يونس/٦١.

واتە: لە هیچ حاڵو (ئەندێشەیەکدا) نین‌و هیچ بەشێ لە قورئـان ناخوێننـەوەو هیـچ کردەوەیەك ناکەن، مەگەر ئـەوە کـە ئێمـە بەسـەرتاندا چاودێرین، لـەو دەمـەی‌کە دەچنـە نێوی (نێو ئەو کارە)و هیچ شـتێ لـە زەوی‌و لـە ئاسمـاندا لـە پـەروەردگارت ون نابـێ، بـە ئەندازەی تۆزقاڵێك نە بچکۆلەتر لەوە نە گەورەتر لەوە، مەگەر ئەوەی (هەموو ئەوانـە) لـە کتێبی ئاشکراکەرەوەدا هەیەو نووسراوە.

و چەندان ئایەتی تر بەڵگەن لەسەر بەرفراوانی زانستی خوای گـەورەو پـەی بردنـی بە هەموو شتێك، هەرچەندە کەم بێت یان زۆر، ورد بێت یان گەورە.

**١٠- ژیانی خوای گەورە:**

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿الله لا إله إلا هو الحي القيوم لا تأخذه سنة ولا نوم له مـا في السماوات وما في الأرض﴾ البقرة/٢٥٥.

واتە: ﷲ (زاتێکە داگری هـەموو جۆرە سـیفاتی کەماڵـە) کـە هیـچ مـەعبودێ نیـە بێجگە لە ئەو کە زیندووو راوەستاو بە زاتی خۆیەتی، هیچ کاتێ وەنـەوزو (چـۆرت)و خـەو دایناگرێ (و چاولێکنانێك لە تەگبیری جیهان غافڵ نیە)، هەر بۆ ئەوە، ئەوەی لە ئاسمان‌و زەوی دایە.و دەفەرموێت ﴿الم، الله لا إله إلا هو الحي القيوم، نزل عليك الكتـــاب بـــالحق مصدقا لما بين يديه وأنزل التوراة والإنجيل، من قبل هـــدى للنـــاس وأنـــزل الفرقـــان﴾ آل عمران/١-٤. واتە: ئەلف، لام، میم، (ﷲ) زاتێکی وایە کە بێجگـە لـەو مـەعبودێ تـر نیـە، هەر ئەویشە زیندووی پایەدار، ئەم کتێبەیی (قورئانی) بە هەق بۆ تـۆ نـاردووە، لەبـەرا بـۆ

ڕێنوێنی خەڵك (تەوراتو ئینجیلی ناردووە) وفورقـانی (كـە جیاكـەرەوەی هـەق لـە باتڵـە)
ناردووە.

و دەفەرموێت: ﴿الله الذي جعل لكم الأرض قرارا والسماء بناء وصوركم فأحسـن صوركم ورزقكم من الطيبات ذلكم الله ربكم فتبارك الله رب العالمين، هو الحي لا إله إلا هو فادعوه مخلصين له الدين الحمد لله رب العالمين﴾ غافر/٦٤-٦٥.

واتە: خودا زاتێكە زەوی بۆتان كردۆتە جێی ئارام گرتنو ئاسمانیشی (وەكو میچـێ لە بان سەرتانەوە) ڕاگرتووە،و وێنەی كێشاون، جـا جوانیشـی كێشـاوە،و لـە شـتی پـاكو خـاوێن ڕزقو ڕۆزیشـی پێداون، ئەمەیـە خـوای پـەروەردگارتان.جـا پـاكو بـێ خەوشـە پەروەردگاری جیهانیان، هەر ئەوە زیندوو، مەعبودێ بێجگە لەو نیە، جا ئـەو بـانگ بكـەن لـە حـاڵێكدا كـە خاڵیسـانە عیبـادەتی دەكـەن، حـەمد هـەموو تایبـەتی خودایـە كـە پەروەردگاری جیهانیانە.

و چەندان ئایەتی تر هەن بەڵگەن لەسـەر ئـەوەی خـوای گـەورە خـاوەنی سـیفەتی ژیانێكی تەواوە، كە هیچ تەواویەكی تر لەسەرییەوە نیە.

**١١-١٢- بیستن و بینینی كردگار:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلى الله والله يسمع تحاوركما إن الله سميع بصير﴾ المجادلة/١.

واتـە: بـە هەقیقـەت خـوا قسـەی ئـەو ژنـەی بیسـت كـە لـە بـارەی مێردەكەیـەوە دەمەقاڵـەی لەگـەڵ تـۆدا دەكـردو لای خـوا شـكایەتی ئـەكرد (و خـوا دادخـوازی ئـەوی وەرگرت)، خوا وتووێژتان دەبیستێ، بەڕاستی خوا بیسەرو بیینایە (لـە بابـەت (خُولـە) لـە هۆزی خەزرەج خێزانی ئەوسی كوڕی صامت نازل بوو) ئیمام فەخری ڕازی ڕوح المعـاني في ظلال.

و دەفەرموێت: ﴿أرأيت الذي ينهى، عبدا إذا صلى، أرأيت إن كان على الهـدى، أو أمر بالتقوى، أرأيت إن كذب وتولى، ألم يعلم بأن الله يرى﴾ العلق/٩-١٤.

واتە: ئای دیتت ئەو کەسەی کە بەرگری دەکرد، لەبەندەیێ، کاتێ نوێژی دەکرد، چ دەبینی کە ئەو پیاوە لەسەر هیدایەت بێو ڕێنوێن کراو بێ، یا بە خۆپاراستن فەرمان بـدا، ئایا رەئیت چییە ئەگەر بە درۆی دابنێو روو بسـوڕێنێ، ئایا نـەیزانیوە کـە بەڕاستی خـوا دەیبینێ.

و خوای گەورە بە موساو هارون دەفەرموێت کاتێك ناردنی بۆ لای فیرعەون: ﴿اذهبا إلى فرعون إنه طغى، فقولا له قولا لينا لعله يتذكر أو يخشى، قالا ربنا إننا نخـــاف أن يفـــرط علينا أو أن يطغى، قال لا تخافا إنني معكما أسمع وأرى﴾ طه/٤٣-٤٦.

واتە: بچنە لای فیرعەون، بەڕاستی (توغیانی کردووەو) خۆی قەف کردووە، جـا بـە نەرم نیانی قسەی لەگەڵدا بکەن، بەڵکو بیر بکاتەوە (و پەند بگرێ) یا (لە خوا) بترســێ، (موساو هارون) وتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! لەمە دەترسێین کە لێمان پێش بکـەوێو مۆڵەتی راگەیاندنمان پێ نەدا یا سەرپێچی بکا، فەرمووی: مەترسن، من لەگەڵتانم، (هەموو شتێك) دەبیسمو دەی بینم.

و دەفەرموێت: ﴿يعلم خائنة الأعين وما تخفي الصدور، والله يقضي بـــالحق والذيـــن يدعون من دونه لا يقضون بشيء إن الله هو السميع البصير﴾ غافر/١٩-٢٠.

واتــە: خیانــەتی چاوەکــان (چاوپیســەکان)و ئــەوەی کــە لــە دڵو دەروونیــاندا شاردراوەتەوە(خوا) پێی ئەزانێ،و خوا بە هەق داوەری ئەکا،و کەسانێ (بتگـەلێ) بێجگـە لەو بانگی دەکەن ناتوانن هیچ داوەری بکەن، بەڕاستی هەر خوا بیسەرو بینایە.

وچـەندان ئایـەتی تـر هـەن بەڵگــەن لەســەر وەسـف کردنــی خــوای گــەورە بــە سیفەتەکانی بیستنو بینین.

**١٢- وتەو قسەی کردگار:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وكلّم الله موسى تكليماً﴾ النساء/١٦٤.

واتە: و خوا بە هەقیقەت لەگەڵ موسادا قسەی کرد.

و دەفەرموێت: ﴿أفتطمعون أن يؤمنوا لكم وقد كان فريق منهم يسمعون كلام الله ثم يحرفونه من بعد ما عقلوه وهم يعلمون﴾ البقرة/٧٥.

واتە: (ئەی موسڵمانان) ئایا چاوەڕوانی ئەکەن (ئاواگەلی) بە ئێوە بڕوا بهێنن، یا وەکو هەندێ لەوانەی قسەی خوا ئەبیسنو دوای تێگەیشتن، لە واتاکانی ئەویان ئەگۆڕێ کەچی ئەشیان زانێ.

و دەفەرموێت: ﴿وإن أحد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله ثم أبلغه مأمنه﴾ التوبة/٦.

واتە: و ئەگەر یەکێ لە موشریکان پەنای بە تۆ هێنا، پەنای بدە تا قسەی خوا ببیسێ(و بیری لێ بکاتەوە)، لە پاشان ئەو بە جێگای هێمن بگەیێنە، چونکە ئەوان هۆزێکی نەزانن.

و چەندان ئایەتی تریش کە بەڵگەی وەسفدارێتی پەروەردگاری تاکو تەنیان بە سیفەتی قسەکردنو ئاخافتن.

❁❁❁

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، خۆی بە زۆر ناوی تر ناو بردووە، جگە لەوانەی باسمان کردن، لەو ئایەتانەی باسی ناوەکانی خوای گەورە دەکات:

﴿هو الله الذي لا إله إلا هو عالم الغيب والشهادة هو الرحمن الرحيم، هو الله الذي لا إله إلا هو الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبار المتكبر سبحان الله عما يشركون، هو الله الخالق البارئ المصور له الأسماء الحسنى يسبح له ما في السماوات والأرض وهو العزيز الحكيم﴾ الحشر/٢٢-٢٤.

واتە: ئەو خوایە کە مەعبودی تر بێجگە لەو نیە، هەر ئەوە دانای نهێنو ئاشکرا، هەر ئەویشە بەخشەرو دڵاوا، هەر ئەو خوایە کە مەعبودی تر بێجگە لەو نیە، فەرمانڕەوایە، پاکە (لە عەیب)و ئەمنیەت دەرە، پارێزەرە، زاڵە، خاوەن شکۆیە، ئەو شیاوی گەورەییە، لە هەر شتێ کە ئەیکەنە هاوبەشی پاکو بەرییە، هەر ئەو خوایە خوڵقێنەری بێ وێنە،

دیمەن دەرە، هەر بۆ ئەوە ناوی چاكو شیاو، هەرچی لە ئاسمانــەکانو زەویـدان بێخەوشـی ئەو دەڵێن،و هەر ئەویشە عەزیزو حەکیم.

و دەفەرموێت: ﴿سبح اسم ربك الأعلى﴾الأعلى/١.

واتە: ناوی پەروەردگاری بەرزو گەورەی خۆت بە پاکی ببە.

و دەفەرموێت: ﴿فسبح باسم ربك العظيم﴾ الواقعة/٧٤.

واتە: جا کە وایە نێوی پەروەردگاری گەورەت بە بێ خەوشی بڵــێ (و خـوا بـە پـاك بزانە).

لەم بارەیەوە ئایەت زۆر هەن، وەك چۆن لەسەر زاری پێغەمبــەرەوە ﷺ زۆر نـاوی تر هاتوون، وەکو فەرموودە راستەکان ئاماژەی پــێ دەکـەن، –چونکـە پێغەمبـەر ﷺ لـە هەموو کەسێك زیاتر زاتـی پـەروەردگاری ناسـیوە– لەوانـە ((**لله تسعةوتسعون اسماً، مائة إلا واحداً، لا يحفظها أحدٌ إلا دخل الجنة، وهو وتر يحب الوتر**)) بوخـاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە، و لە ریوایەتێکی تردا: ((**من أحصاها**)) هـاتووە، تورمذیش بـەم جۆرە ریوایـەت دەکـاو ئەمەشـی بۆ زیاد دەکـات: ((**هو اللّٰه الذي لا إلـه إلا هـو، الرحمن، الرحيم، الملك، القدوس، السلام، المؤمن، المهيمن، العزيز، الجبار، المتكبر، الخالق، الباريء، المصور، الغفار، القهار، الوهاب، الرزاق، الفتاح، العليم، القابض، الباسط، الخافض، الرافع، المعز، المذل، السميع، البصير، الحَكَم، العدل، اللطيف، الخبير، الحليم، العظيم، الغفور، الشكور، العلي، الكبير، الحفيظ، المقيت، الحسيب، الجليل، الكريم، الرقيب، المجيب، الواسع، الحكيم، الودود، المجيد، الباعث، الشهيد، الحق، الوكيل، القوي، المتين، الولي، الحميد، المحصي، المبديء، المعيد، المحيي، المميت، الحي، القيوم، الواجد، الماجد، الواحد، الصمد، القادر، المقتدر، المقدم، المؤخر، الأول، الآخر، الظاهر، الباطن، الوالي، المتعالي، البرّ، التواب، المنتقم، العفو، الرؤوف، مالك الملك، ذو الجلال والإكرام،**

المقسط، الجامع، الغني، المغني، المانع، الضار، النافع، النور، الهادي، البديع، الباقي، الوارث، الرشيد، الصبور))

ئەم نۆهەدو نۆ سیفەتەش هەموو ئەوانە نین کە لەمەڕ ناوەکانی خوداوە هاتوون، بەڵکو فەرموودەی تر هەیە کە سیفەتی زیاتری تێدایە، بۆ نموونە لە گێڕانەوەیەکی تری فەرموودەکەی رابوردوودا هاتووە: ((الحنان، المنان، البديع)) هەروەها ئەم ناوانەش لە ناوەکانی خودادا باس کراون: (المغيث، الكفيل، ذو الطول، ذو المعارج، ذو الفضل، الخلاق).

ئەبو بەکر بن ئەلعەرەبی لە راڤەی تورمذیدا لە هەندێ لە زاناکانەوە دەگێڕێتەوە: لە قورئانو سوننەتەوە هەزار ناوی خوای گەورەی کۆکردۆتەوە، هەروەها خاوەنی (القصد المجرد) هەمان مەبەستی گوتووە، (شەوکانی)ش لە (تحفة الذاكرين)دا ئاماژەی بەمە داوە، پاشان دەڵێت (تێرو تەسەلترین فەرموودە کە ناوەکانی ژماردبێ، ئەمەی رابوردوو بوو، هێندەی پێویستی تێدایە) جا بەو پێوەرەی هەموو ناوێك لە ناوەکان پیرۆزن، و سیفەتێ لە سیفەتەکانی خوداوەند دەردەخەنو تەعبیریان دەکەن، ئەوا هەر ناوێ لەم ناوانە ! یان بەڵگەیە لەسەر سیفەتی کەمالو تەواوێتی، یان لەسەر سیفەتی هەبوونی –وجودی، یاخود سیفەتی سَلب، یان لەسەر سیفەتی کاروفرمان (فعل)، سەرچاوەی هەموو ئەو سیفەتو ناوانەش بۆ سیازدە سیفەت دەگێڕدرێنەوە کە لە برگەکانی پێشوودا باسمان لێوە کردن، ئەوانەش سەری هەموو سیفەتی کردارەکانو سلبو کەمال وجودو ماناکانن (المعانی). أهـ

❁❁❁

جارێکی تریش پێمان خۆشە کە دوپاتی بکەینەوە کە بەدیهێنەر بەدیهاتوو نیە، خوای گەورە لەهیچ شتێکدا بە دروستکراوەکانی ناچێت:

﴿ليس كمثله شيء وهو السميع البصير﴾ الشورى/١١.

واتە: شتێك بە وێنەی خوا نیە،و هەر ئەویشە ژنەواو بینا.

و لە بنەماکانی گومڕایی ئادەمیزاد لە سۆنگەی ئیعتقادو بڕوابوونەوە ئەوەیە کە بڕوایان بە لێك چوونی خودا بێت لەگەڵ بەدیهاتووەکان، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا وەڵامی ئەم بیروبۆچوونانەی داوەتەوە، بۆ نموونە یەهودییەکان وایان دادەنا خوای گەورە بوونەوەرانی بەدیهێناوە،و لە رۆژی حەوتەمدا دوای شەش رۆژەبەدیهێنان، پشوویداوە -ئەمەش جۆرێکە لە لێك چواندن- خوای گەورەش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿ولقد خلقنا السماوات والأرض وما بينهما في ستة أيام وما مسنا مـــن لغــوب﴾ ق/٣٨.

واتە: و بە هەقیقەت ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەنێوان ئەواندایە لە شەش رۆژ (دەوران)دا خوڵقاندمانو رەنجو ماندوو بوونیشمان پێ نەگەیی.

مانای ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی نێوانیشیانمان دروست کردن لە شەش رۆژدا بێ ماندوو بوون، خوای گەورە وەڵامی گاورەکانیش دەداتەوە کە دەڵێن پەروەردگار لە چەند بەشێك پێکهاتووەو هەندێ لە بەندەکانی بەشێکن لەو، لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:

﴿وجعلوا له من عباده جزءاً إن الإنسان لكفور مبين﴾ الزخرف/١٥.

واتە: و بۆ خوا لە نێو بەندەکانیدا منداڵیان دانا، بەڕاستی مرۆڤ ناسپاسێکی ئاشکرایە.

جامرۆڤی موسڵمان تەنیا ئەوەی خوای گەورە بڕیار ئەدات کە بۆ خۆی بڕیاری داوە سەبارەت ناوو سیفاتەکانی، خوای گەورەش بە جۆرێك پاك رادەگرێ وەك چۆن خۆی ناساندووە لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەیەوە: ﴿سبحان الله عمـــا يصفـــون، إلا عبـــاد الله المخلصين﴾ الصافات/١٥٩-١٦٠.

واتە: خوا لەو تەوسیفەی ئەوان دەیکەن پاكو بێخەوشە، مەگەر بەندەکانی پاکی خوا.

خوای گەورە هەبووو ئامادەیەو هیچ شتێکیش بە بوونی ئەو ناکات، بینایەو هیچ بینایییەکیش پێی ناچێت، بیسەرەو هیچ بیستنێك پێی ناکات، هەموو سیفاتەکانی تریشی هەر بەم جۆرەن، ئێمەش هەر ئەوەندە سەبارەت خوداوە دەزانین کە لە قورئانەکەیدا یان لەسەر زاری پێغەمبەرەوە، خوای گەورە خۆی پێ ناساندووین. و لە نێوان ئایەتەکانی قورئانیشدا هیچ ناتەبایی‌و دژ یەکییەك نیە. هەروەها سوننەتە راستەکانی پێغەمبەریش ﷺ هەر بە هەمان جۆرن، بەڵکو هەر یەکەیان راڤەی ئەوی تر دەکات، هەر یەکەشیان هەندێکی وەسف دەکات، بە جۆرێکیش پەروەردگار دەناسین کە سەرجەم زانیارییەکانی هەردووکیان کۆبکەینەوە، بەبێ ئەوەی وا تێبگەین قورئان‌و سوننەت لەگەڵ یەکدا ناتەباو ناکۆك بن.

هەر وەك چۆن حەز ناکەین زیاد لە خۆو تەکەلوف بکەین لە تێگەیشتنی دەقەکان‌و توندڕەوی‌و ستەم نەکەین، بەڵکو تەنانەت حەز ناکەین لە باسێکدا رۆبچین کە پەیوەندی بە زاتی خوداوەندەوە هەبێت، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە سوود بە بڕواکەمان بگەیەنێ‌و گەردن کەچی‌و پاك بوونەوەیمان پێ ببەخشێ، لەم بارەشەوە بیروباوەڕەکەمان سادەو سانایە، کۆین لەسەری‌و کەس نکۆڵی ناکات، خوای گەورە بوونی هەیەو هیچ شتێکیش بە بوونی ئەو ناکات، بیسەرەو هیچ شتێکیش بە بیستنی ناکات، دەبینێ وهیچ شتێك بە بینینی ئەو ناچێت،و راگیربووە (مُسْتَوٍ) بەو واتایەی کە راگیربوون (الإِسْتِواء) دەیگەیەنێت، هیچ شتێکیش وەك راگیر بوونی نیە، و نزیکەو هیچ شتێکیش وەك نزیکییەکەی نیە، هەر بەم جۆرەش هەموو ناوو وەسفێکی پەروەردگار کە زاتی خۆی پێ وەسف کردووە....

﴿ولا يحيطون به علماً﴾ طه/١١٠.

واتە: بەڵام ئەوان توانا(احاطه)یان بەسەر (زانستی) ئەودا نیە.

ئەدەبی هاوەڵان لەم رووەدا بەم جۆرە بووە،و ئێمە سنوورشکێنی ناکەین بۆ شتێکی تر.

(الدارمي) لە سلێمانی كوڕی یەسارەوە دەریهێناوە كە: پیاوێك هات بۆ مەدینە، لـە (متشابە)ی قورئان دەیپرسی، عومەر بانگی كردو پەلكێكی خواری دارخورمای بـۆ ئامـادە كردو پێی گـوت: تـۆ كێیـت؟ ئـەویش گوتـی: مـن (عوبـەیدوڵلا سـەبیغ)م، عومـەر پـەلكی دارخورماكەی گرت بە دەستەوەو پێی گوت منیـش (عـەبدوڵلای عومـەر)م، ئیـدی پـەلكی دارخورماكەی گرتە دەستەوەو هێندەی لێدا تا سەری خوێناوی كرد، تـا ئـەو كاتـەی پێـی گوت: بەسە. ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەوەی لەسەرمدا هەبوو ڕەوییەوە.

عومەر دەیزانی لە پرسیاری ئەو كابرایە چی دەكەوێتەوە بۆیە بـەو جـۆرە هـەڵس‌و كـەوتی لەگـەڵدا كـرد، گـەواهی واقیعـی نەتـەوەی ئێمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەم قسـەیە، لەوكاتانەوەی ئەم باسانە تاووتوێ دەكرێن پەرت‌و بڵاوی‌و دوژمنایەتی تەشەنەی كردووە، بۆیە ئیمامی مالیك لە وەڵامی كەسێكدا كە مانـای (الإسـتواء)ی لێ پرسـیی، بەمـە وەڵامـی دایەوە: (والسؤال عنه بدعـة) مانـای پرسـیار كـردن لـەم بارەیـەوە بیدعـەو هەڵبەسـتراوە، خوازیارین لە خوای گەورە دڵمان لە بیدعە پاكژو خاوێن بكاتەوە.

پێمان خۆشە كۆتایی ئەم بەشە بە دوو تێبنیی بێنـین، یەكـەمیان ئەوەیـە: هـەندێ كەس سەبارەت بە هەندێ لە تایبەتمەندییـەكانی ناوەكـانی خـوای گـەورە قسـە دەكـەن،و دووەمیش سەبارەت ناوە گەورەكەی (ﷲ)یە.

**١- باسی تایبەتمەندییەكانی ناوە پیرۆزەكانی (ﷲ):**

مامۆستا بەننا دەفەرموێ: هەندێك دەڵێـن هـەر نـاوێك لـە ناوەكـانی خـوای گـەورە نهێنی وتایبەتی خۆی هەیە، كە پێوەی پەیوەستە بە شێوەیەكی زیاد كردن یـاخود كـورت كردن بێت، بەڵام هەندێك كەس تیایاندا زیـاتر لـە سنووری خۆیـان ڕۆ دەچـن، تـا دەگاتـە ئـەوەی دەڵێـن هـەر نـاوێك خزمـەتكارێكی ڕۆحـانی هەیـە، خزمــەتی ئەوانــە دەكــات كــە بەردەوامن لەسەر یاد كردنی ئەم ناوە، تا بـەم جـۆرە... ئـەوەی لـەم بـارەوە دەیـزانم – وفوق كل ذي علم عليم: لەسەر هەموو زانایەكەوە زانایەكی تر هەیە– ئەوەیە كە هەر ناوێك لە ناوەكانی خوای گەروە زاراوەی ڕێزدارن، فەزڵیان بەسەر هەموو وتەیەكەوە هەیە، فـەڕو

بەرەکەتیان تێدایە، لە یاد کردنەوەیاندا پاداشتێکی گەورە هەیە، و گـەر مـرۆڤ بـەردەوام بێت لەسەر یاد کردنی خوای گەورە دەروونی پاکژ دەبێتەوەو گیانیشی خاوێن دەبێت، بـە تایبەتی کاتێك یاد کردنەکەی بە ئامادەگی دڵو تێگەیشتنی ماناکـەی بێـت، بـەڵام ئـەوەی لەمە بترازێت، ئەوە لە قورئانو سوننەتدا نەهاتووە، فرمانیشمان پێکراوە زیاد لە پێویست لە ئابینی خوادا رۆنەچین، و هیچ شتێکی نەخەینە سەر، ئەو کورتەیەی باسمان کرد : لـەم بارەیەوە بەسە.

٢- باسی ناوە گەورەکەی (ﷲ):

مامۆستا بەننا دەڵێت: لە زۆر فەرموودەدا ناوە گەورەکەی پەروەردگار باس کراوە، لەوانە:

أ- لە (بُرَیدة)ەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بووە لـە پاڕانەوەکەیدا گوتوویەتی: ((اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا إلـه إلا أنـت، الأحـد الصمـد، الـذي لم يلـد ولم يولـد، ولم يكـن لـه كفـواً أحـد.)) پێغەمبــەر ﷺ فەرمووی سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە بە ناوەگەورەکەی خودا پاڕایەوە، کە ئەگەر پێی بپاڕ درێتەوە وەڵام دەداتەوە،و گەر پێی داوا بکرێت دەبەخشێ. ئـەم فەرموودەیە ئەبوداودو تورمذیو نەسائیو ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە (وقـال المنـذري: قـال شـيخنا أبو الحسن المقدسي: هو إسناد لا مطعن فيه ولا أعلم أنـه روي في هـذا البـاب حديـث أجـود إسناد منه، قال الحافظ إبن حجر: هذا الحديث أرجح ما ورد في هذا الباب من حيث السند).

ب- لە ئەنەسی کـوڕی مالیکـەوە ﷺ گێڕاویانەتـەوە کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ هاتە مزگەوتو پیاوێك نوێژی دەکردو دەپاڕایەوەو تێیـدا دەیگـوت: (اللـهم لا إلـه إلا أنـت، المنـان، بديـع السـماوات والأرض، ذالاجــلال والإكـرام) پێغەمبــەر ﷺ فـەرمووی ((أتدرون بم دعا الله؟ دعا الله بإسمه الأعظم، الذي إذا دعي به أجاب وإذا سئل بـه أعطى)) رواه أبوداود والترمذي والنسائي وإبن ماجـة. مانـای ئایـا دەزانـن بـە چـی دوعـای کرد؟ لە خوا پاڕایەوە بە ناوە گەورەکەی، کە ئەگەر پێی بپاڕدرێتەوە وەڵام دەداتـەوە،و ئەگەر پێی داوا بکەیت دەبەخشێت.

ج- لـە ئـەسمای کچــی یــەزیدەوە (خــوا لێی رازی بێــت)، پێغەمبـــەر ﷺ فەرموویەتی:"إسم الله الأعظم في هاتين الآيتين" ناوەگەورەکەی خودا لـەم دوو ئایەتەدایـە: ﴿وإلهكم إله واحد لا إله إلا هو الرحمن الرحيم﴾ البقرة/١٦٣.

واتـە: و خـواو مـەعبودی ئێـوە تاکـە، هیـچ مـەعبودێك نیـە، مەگــەر ئــەو کــە زۆر بەخشەرو میهرەبانە.

و سەرەتای ئال عیمران ﴿الم، الله لا إله إلا هو الحي القيوم﴾.

واتە: ئەلیف، لام، میم، (الله) زاتێکی وایە کە بێجگە لـەو مـەعبودێ تـر نیـە، هـەر ئەویشە زیندووی پایەدار.

رواه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجة. وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

د- لە سەعدی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە گـوێی لـە پێغەمبـەر ﷺ بووە فەرموویەتی: ((**هل أدلكم على اسم الله الأعظم، الذي إذا دعي به أجاب، وإذا سئل به أعطى؟ الدعوة التي دعا بها يونس، حيث نادى في الظلمات الثلاث: لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين**)) پیاوێك گوتی: ئایا ئەو دوعایە بە تایبەتی بۆ یونس بوو یا بۆ سەرجەم بڕواداران؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((**ألا تسمع قول الله ﷻ: فنجيناه من الغم وكذلك ننجي المؤمنين**))؟ الأنبياء/٨٨. رواه الحاكم.

واتـە: ئایـا گوێت لـەو وتەیـەی خـوای گـەورە نـەبووە کـە دەفـەرموێت: لـە خـەمو ناڕەحەتی رزگارمان کرد، بەم جۆرەش بڕواداران رزگار دەکەین.

جـا خوێنـەری بـەڕێز لـەم فەرموودانـەو ئـی تریشـەوە ئــەوە دەبینیــت کــە نــاوە گەورەکەی خوای گەورە بە شێوەیەکی دیاری کراو دەست نیشان نەکراوە، بـەڵکو زانایـان لـە دەستنیشـانکردنیدا جیـاوازن:لـە بــەرەندە کردنــی فــەرموودەکان بەســەر یــەکتریدا، بەڕادەیەك کە جیاوازییان دەگاتە چل وتــە. ئەگـەر ئـەوەی ئێمـە لـەم فەرموودانـەو وتــەی کەسانی باوەڕ پێکراوی پیاوانی ئەم نەتەوەیەوە وەری گرین ئەوەیە کــە نـاوە گەورەکـەی پەروەردگار پاڕانەوەیەکی تێکەڵە لە چەند ناوێکی پیرۆزی کردگاری مەزن، ئەگـەر مـرۆڤ پێیان بپاڕێتەوەو مەرجەکانی داخوازی پاڕانەوەی تیا هاتبێتە دی لەرووی شەرعەوە، ئەوا

خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەکەی دەداتـەوە وەك چۆن لـە زۆر فـەرموودەدا باسـی لێـوە کراوە.

جا گەر وابێت ئەوا ئەو کەسانەی وای دادەنێن ئەوە نهێنیەکە لە نهێنیەکان، کە بـە هەندێ کەس دەبەخشرێو بە هۆیەوە دەتوانن شتە داخراوەکانی پێ بکەنەوەو بە هۆیەوە لە عادەتو بارە ئاساییەکان تێبپەڕن،و بە هۆیەوە چەند تایبەتمەندییەکیان پێ بـدرێ کـە بە کەسانی تر نابەخشرێ، ئـــــەمانە شتێکی زیادەن کە خوای گـەورەو پێغەمبەرەکـەی باسیان لێوە نەکردووە. جـا گـەر ئـەو جۆرە کەسـانە بەڵگـەی ئـەم ئایەتـە بهێننـەوە کـە دەفەرموێت:

﴿قال الذي عنده علم من الكتاب أنا آتيك به قبل أن يرتد إليك طرفك فلمـــا رآه مستقرا عنده قال هذا من فضل ربي ليبلوني أأشكر أم أكفر ومن شكر فإنما يشكر لنفسه ومن كفر فإن ربي غني كريم﴾ النمل/٤٠.

واتە: ئـەو کەسـەی کـە زانسـتی کتێبی (ئاسمـانی) لابـوو، وتـی: بـەر لـەوەی چـاو بترووکێنی دەیهێنمە لات! جا کاتێ کە (سولەیمان) دیتی تەختەکەی لا حازرە، وتـی: ئەمـە لە فەزڵی پەروەردگارمە تـا تـاقیم بکاتـەوە ئایـا (بـۆ نیعمـەتی خـوا) شـوکر یـا ناسپاسـی دەکەم؟و هەر کەسێ شوکری بکا شوکری بۆ خۆی کردووەو هەر کەسیش ناسپاسـی بکـا، جا بەڕاستی پەروەردگارم بێ نیازو کەریمە.

بەو واتایەی کە وتەی ﴿عنده علم من الكتاب﴾ ناوەگەورەکەی خـودا دەگرێتـەوە، ئەوا بەو جۆرە کەسانە دەڵێین: زانایانی تەفسـیر باسـیان لـەوە کـردووە کـە ئـەو ناوانـەی بانگی خودای پێ کردبـوو (یـا حـي یـا قيـوم) یـان: (الله لا إلـه إلا هـو الحـي القيـوم) بـوو، هەندێکی تریشیان گوتویانە زاراوەکە بە سریانیە (آهيا شراهيا)یـە، ئەمـەش گوتنێکـی بـێ بەڵگەیە،و باسەکە لەوە دەرنەچوو کە لە فەرموودە ڕاستەکاندا هاتووە.

کورتـەی باسـەکەمان ئەوەیـە: هـەندێ کـەس هـەن گرنگـی ئـەدەن بـە شـتە شـاردراوەکانو ئـەو شـتانەی جـێی چـەندو چوونـو پاڕانـەوەو داوا تایبەتمەندێتییـەکان دەکـەنو زیـادە لـە (المأثورات)دا دەکـەنو دەڵێـن ئـەوەی کـە لـە قورئـانو سـوننەتدا

نەهاتووە! ئەوا زۆر بە توندی نەهی لێکراوە، کەواتە با لە سنووری (المأثور) دەرنەچین.
أه.وتەی مامۆستا تەواو بوو.

۞۞۞

ئێستا دوای ئەوەی نۆ دیاردەی گەردوونیمان باس کرد، هەر دیاردەیەك لە روویەکەوە بەڵگەمان لەسەر خوای گەورە بۆ دێنێتەوە پاشان بەڵگەکانی دیاردەکانیشمان باس کرد، جا هەر دیاردەیەك باسمان کردبێت یاخود باسمان نەکردبێت بەڵگەیە لەسەر ناوێك لە ناوەکانی کردگار، هەندێکێشمان لەوە باس کرد کە پەیوەندی بە ناووسیفەت‌و زاتی کردگارەوە هەبوو، وەك لە قورئان‌و سوننەتدا هاتبوون، ئەوە ماوە بەراوردی نێوان ئەم تێگەیشتنە دروستە بکەین لە لایەن موسڵمانەوە بۆ زاتی خوداوەند، هەروەها لەگەڵ تێگەیشتنە هەڵەکانی تردا لە لایەن ناموسڵمانەکانەوە، تا بۆ مان روون بێتەوە بە تەنیا موسڵمان توانیویەتی خودا بە تەواوی بناسێت، ناسینێك لەسەر زانست‌و ژیری‌و بەڵگەنەویستەکان بنیات نرابێت، ئەوا هیچ روویەك لە رووەکانی نابینیتەوە ئاڵۆزو گرێیاوی بێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئاینی ئیسلام لە لایەن (ﷲ)ی پەروەردگار ەوەیە،و موحەممەدیش رەوانە کراوی خودایە، خوای گەورە بۆ ئەوە ناردویەتی خەڵکی لە گومرایی‌و پوچی‌و گەندەڵییەوە رزگار بکات بۆ حەق‌و راستی،لە هەموو شتەکاندا.

۞۞۞

پێش ئەوەی بەم بەراوردکارییە هەستین پێمان خۆشە کورتەی ئەمەی رابوورد لە باسەکەماندا،بیخەینە روو:

١- دیاردەکانی ئەم گەردوونە، بەڵگەن لەسەر ناوە پیرۆزەکانی خودا، ناوەکانیشی بەڵگەن لەسەر سیفاتەکان، سیفەتەکانیش دەلیل‌و بەڵگەن لەسەر زاتی خودا.

٢- ئەوەی لە دیاردەکانی گەردوون ئاماژەمان بۆ دەکات ئەوەیە کە پەروەردگار خاوەنی سیفەتەکانی: (زانست‌و ویست‌و هێزو توانا‌و ژیان‌و بیستن‌و بینین‌و قسەکردن‌و

تاكو تەنیایيو مانەوەو سەرەتاییو راوەستاویو بێ باکیو بێ ئاتاجییە)و لە ناوەکانیشی: المذل، المعز، الرزاق، المعطي، المنعم...ـــە.

٣- تێڕوانینیشمان بۆ ئەوەی خوای گەورە وەسفی زاتــی خـۆی پــێ كـردووە، یــان پێغەمبەرەکەی ﷺ ناوی هێناوە، ئەوەمان نیشان ئەدات کە هاوتاییەکی تەواویان هەیـە لەگەڵ ئەو بەڵگانەدا کە لە دیاردەکانەوە بە بەڵگەی ژیریی گەیشتوینیەتێ، ئەوەی کـە لـە دەقەکاندا هـاتووە لەگـەڵ زیـاتکردنێکدا لـە دەقـەکاندا، وتەکـەمان دەگەیەنێتـە ئەوپـەڕی تەواوێتی (الکمال)و ئەدەب، ئایینێکیش دەسـتی ژیریـی بگرێـتو لـەم باسـەدا بیگەیەنێتـە لوتکـە ئـەوا بێگومـان هیـچ گومـانێك لای مـرۆڤ نامێنێتـەوە کـە ئـەو ئایینـــە سروشــێکی راستەقینەیە!

٤- لە هەموو ئەمانــەی رابـوردن، نیشـانەو بەڵگـە هـەن بـۆ موسـڵمان لـەم بابەتـەو شـتەکانی تریشـدا (چونکـە لقێکـە لێی) کـە موسـڵمان دروسـتی ژیریـــی لا گەلاڵــە بـــوو،و گەیشــتبتە پــاکیو ســەفای تێگەیشــتن،و دروســتی ســروش(وحـی)،کـە دەسـتی ژیریـــیو تێگەیشتن دەگرێت بۆ راستە رێگا.

# بەراوردکاریەکان

لە ژێر ناونیشانی (العقیدة الإلهیة)دا عباس محمود العقاد لە پەرتووکی (حقائق الإسلام وأباطیل خصومه) لێکۆڵینەوەیەك دەخاتە روو، کە تیایدا بەراوردی نێوان بیروباوەڕی ئیسلامی سەبارەت خوداوەند (اللَّهُ) ﷻ لەگەڵ بیروباوەڕی ناموسڵمانانی لەسەر خوداوەند دەکات، تێبینی ئەوەش دەکرێت کە بەراوردکارییەکە لەسەر هەندێك باوەڕی فەلسەفی داڕێژراوە، بە جۆرێکیش لەمەڕ بیروباوەڕی ئایینی دەکۆڵێتەوە کە خەڵکانی زەمانی خۆی لە کاتی هاتنە خوارەوەی سروش و ئیسلام و ناردنی پێغەمبەر دا لێی تێگەیشتبوون، نەك بەو جۆرەی کە هەیە لای پێغەمبەرەکانی خودا (صلوات الله وسلامه علیهم) کە خاوەنی پەیامەکان بوون -گەر لە بنەڕەتدا سەبارەت پێغەمبەران بێت- چونکە ئێمە باوەڕمان وایە کە موسا و عیسا و هەموو ئەو پێغەمبەرانەی لە لای خواوە نێردراون بیروباوەڕیان سەبارەت زاتی خوداوەند هەمان بیروباوەڕی سەروەرو بەڕێزمان موحەممەدە ﷺ، چونکە هەموویان پێغەمبەرو نێردراوی یەك خودان، بەڵام ئەم بیروباوەڕە پاش ئەوان دەستی تێوەردراو هەڵگێڕدرایەوە، بۆیە پێویستیان بە راست کردنەوە هەیە، جا پەیامی پێغەمبەرمان ﷺ ئەو راست کردنەوە تەواوە بوو، چونکە لادانی تەواو لە بیروبۆچوونی زاتی خوداوەند لە جیهاندا لە لایەك و راست کردنەوەی ئەم لادانە لە لایەکی ترەوە بەڵگەی ئەوەیە نامەی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خوداوە رەوانە کراوە. جا ئێمە لێرەدا هەموو باسەکەی عەققاد نانووسینەوە، بەڵکو لێی هەڵدەبژێرین، لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەدا ئەوەی دەینووسین وتەی خۆیەتی، هەر لێدوانێکیش لە دامێنی لاپەڕەکەدا هاتبێت ئەوە وتەی ئێمەیە.

العقاد دەڵێت:-

# بیروباوەڕی خودایی

بیروباوەڕ بە خودا بریتییە لە ترۆپکی بیروباوەڕی ئایینی بە شێوەیەکی گشتگیری تێروتەسەل (مجملو مفصل -تێکراییو درێژە پێدان). کەسێك بیروبـاوەڕی هـەر کۆمـەڵێك لە بابـەت خـوداوە بزانێـت ئـەوا رێـژەو بەشـیانی لـە ئـایین بـۆ روون دەبێتـەوە، کە تـا چ رادەیەك خاوەنی تێگەیشتنو ویژدانی بەرزن؟ راستی ئەو پێوانانەش دەردەکەون کە خێرو شەڕی پێ دەپێون، بەم پێیەش چاکەو خراپـەکان دەسـت نیشـان دەکرێـن. ئـەو کەسـەی بیروباوەڕی بە خودا بەرز بێت، دینی لە لا نزم نابێت، و دینی بەرز نابێتەوەو بیروباوەڕیش بە خوداوەند نەوی‌و نزم بێـت، ئەمـە لەگـەڵ سـیفەتەکانی یەکـەم هـەبوودا نـاگونجێت کـە هەموو بووەکانی تر شوێنی دەکەون.

جا تێڕوانین بۆ سیفەتەکانی خودا گەورەترین بواری پێشبڕکێ لە نێوان گـەورەترین عەقڵمـەندەکانی خـاوەن فەلسـەفە هزریـەکانو حیکمەتـە دینیـەکان دەخولقێنـێ، لـێرەدا ئەرکو رۆڵی فەیلەسوف یان پیتۆڵ زۆر سانایی ترە لە ئەرکی حەکیمو خـودان ئایینـەکان، چونکە فەیلەسوفی تیۆریی مەلی بیر کردنەوەی بۆ پێوانە کردن بـە هیچ کۆتێکی بەندایەتی کـردنو سـنوری هەڵسوکـەوت نابەستێتەوە کـە حـەکیمی ئـایینی پێـوەی پەیوەسـتە، هەروەها ئەو کەسانەش پێوەی پابەندن کە شوێنیان دەکەون لە ژیانی گشـتیو گوزەرانـی تایبەتدا، بۆیە لە فەیلەسوفە تێۆرییەکاندا هەیە کە خاوێنیو پاکی خودای بە جۆرێك بەرەو لووتکە بەرز کردۆتەوە کە ئەندێشەو خەیاڵ نایگاتـێ، جـا چ جـای بیـر کردنـەوەو هەسـت کردن؟.

ئیسـلامیش لـە ناوجەرگـەی بیابـانی عەرەبییـەوە هـاتو بـەرزترینو سـەروەرترین بیروباوەڕی سەبارەت خوای تاكو تەنیا لەگەڵ خـۆی هێنـا، کـە بـیروبۆچوونی فەلسـەفەی تیۆریو لە هەمان کاتدا بیرو بۆچوونی باوەڕی ئایینی لادراویشی راسـت کـردەوە، راست

کردنەوەی چەمکی هەر یەك لەم دوانەش —لەرووی کەمو کوڕییەکانیانەوە بوو— ئەمەش بە گەورەترین موعجیزەو سەراسیمە دائەنرێت کە پێوانـەی خـاوەنی ژیریـی راسـتو بەدیـهیو بێگومانە راستەکان ئەوە دەر دەخەن کە سروشە لە لایەن خوداوە.

کۆڕاییـەك هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە گوتــراوە: سـیفەتەکانی خـودا گەیشـتونەتە لووتکەی بەرزی لە رووی خاوێنیو داماڵین[4](التجريد) بە پێی ڕێبازەکەی ئەرسـتۆی گـەورە فەیلەسوفی یۆنانی.

ئەوانەی خاوەنی ئەم رایەن رێچکەکەی (ئەفلۆتین)یش لە یاد ناکـەن کـە پێشـەوای رێبازی ئەفلاتۆنی نوێو گەورەو شێخی فەلسەفەی سۆفیگەرێتییە لە رۆژئاواییەکان تا ئەم سەدانەی دواییش، بەڵام ئەوان لە بارەی وتەکانیان بـۆ پـاکی وەسـفی خـوای گـەورە هیـچ بـاس ناکـەن؛ چونکـە رێبازەکـەی نزیکـترە لـە بـێ ئاگـایی سـۆفیەتییەوە وەك لـە بیرکردنەوەیەکی ئاشکراو لۆژیکی گونجاو رێتێچوو، رێبازەکەشی لە خاوێنو پـاك راگرتنـدا (التنزيه) ئەوەیە کە زیادە بخاتە سـەر هـەر سیفەتێ لـەو سیفەتانەی خـوای پـێ وەسـف دەکرێ، ئیدی زیادەی دەخاتە سەرەچەندێك لە توانـای زاراوەکـانیدا بێـت، بەڕادەیـەك کـە پەیوەندی دەپچڕێت لەگەڵ هەموو مانـا دیـارو شـارراوەکان، زۆربەشـیان وای دەبینـن کـە (ئەفلۆتین) خۆشی ئەم تێڕوانینەی نەبووە لەو سیفەتانەی دەینەخشێنن، بەڵکو مەبەسـتی سەرەکی ئەوە بـووە بۆچوونو تەسـەورەکان بگەیەنێتـە ئەوپـەڕی دەستەوەسـانیو بـێ توانایی.

لەوانە ئەو نکۆڵی سیفەتی تاكو تەنیایی (الوحدانية)ی دەکرد، تا سـیفەتی الأحديـة بدرکێنێت،و دەڵێ: یەك (واحد) تاك (أحد)[5] نیــە، چونکـە یـەك دەچێتـە ریـزی ژمارەکـانی دووو سێو دەوە....، بەڵام تاك (الأحد) وا نیە هەرتاکەو دوو بارە نابێتەوە.

---

[4] ئەمە وەك ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت نەك بەو جۆرەی کە لە راستیدا وابێت، وەك العقائد لەمـەودوا روونتری دەکاتەوە.

[5] موسڵمانان بە[الأحدية والواحدية]دەڵێن؛ چونکە خودا واحدو ئەحەدە ﴿وإلهكم إله واحد﴾. ﴿قل هو الله أحد﴾.

هەر لەو روانگەیەوەش نکۆڵی لەسیفەتی هەبوون (الوجود)دەکات، تابڵێت: خوداوەند بە هەبوون وەسف ناکرێت، تا خوا لەوە پاکتر راگرین کە سیفەتی نەبوون (العدم) لە بەرانبەریا دەوەستێتو ئەم سیفەتەش بوونەوەرانو بەدیهاتووان تێیدا بەشدارن.

بۆیە نموونەی ئەرستۆ دێننەوە لە پاك راگرتنی خوادا، بەلاّم نموونەی ئەفلۆتین ناهێننەوە؛ چونکە رێچکەکەی لە پەرستگای بێ ئاگایی شێواویدا دەپچڕێو دەوەستێ، تێکەڵی ژیانی هزریو پراکتیکی نابێت.

رێبازی ئەرستۆش لەمەڕ خودا ئەوەیە: هەبوویەکی ئەزەلیو ئەبەدیە، تەواوێتی ڕەهایەو یەکەمو دواهەمینی بۆ نیە،و کارو ویستیشی نیە. لەو کاتەوەی کە کار کردن بریتییە لە داواکردنی شت، خواش بێ ئاتاجە لە هەموو داوایەك،و ئیرادەش: هەڵبژاردنە لە نێوان دوو شت دا، خوای گەورە هەموو گونجاوترین (الأصلح)و باشترینێك (الأفضل)ی لە هەموو تەواوییەك (الكمال) لا کۆبۆتەوە، ئیدی پێویستی بە هەڵبژاردنی نێوان باشو خراپ نیە،و لە نێوان رێزدارو ناڕێز پێدراودا. بەلای ئەرستۆ وایە ناگونجێ بۆ خودا لە کاتدا (زەمان) بەکار هەستێ؛ چونکە ئەبەدیو هەمیشەییەو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نایێت کە داخوازی کاری لێبکات، هیچ نوێیەکیشی بەسەردا نایەت سەبارەت هەبوونی ڕەهای، کە یەکەمینو دواهەمینی بۆ نیە، هەروەها کۆنو نوێیی، هەموو ئەوەی کە لەگەڵ تەواوێتیدا دەگونجێ ئەوەیە کە خۆشنودی بە بەخششی مانەوەی هەیە بەوەی کە هیچ داوایەك (بغية) لە پشتییەوە نیەو هیچ نیعمەتێکیش لە سەرو خوارییەوە نیەو هیچ گرنگییەك (عناية تعنيه) لە سنوورەکەی دەرناچێت.

جا خودای تەواوی ڕەهای تەواوێتی لای گرنگ نیە (لا یعنیە) کە جیهانو گێتی بخوڵقێنێ، یان یەکەم ماددەی دروست بکات کە (الهیولی)یە... بەڵکو ئەو (الهیولی)یە توانای هەبوونی تێدایە، کە لە هێزەوە دەری دەکات بۆ کار،کە تاسەی دەرچوونە بۆ بوون لە لایەن خوداوە بەسەریا دەڕژێ، ئیدی ئەو تاسەیە دەیهێنێتە بوون، پاشان لە ناتەواوی کەموکوڕییەوە دەیگوێزێتەوە بۆ تەواوێتی کە لە توانای سنووریدا هەیە، ئیدی دەجوڵێو

بە پێی ئەو تاسەو توانایەی هەیەتی دەکەوێتە کار،و پـێی نـاگوترێت: ئـەوە لـە دروسـت کردنی خوداوەندە تەنیا ئەوە نەبێ کە بەم پێوەرە بەدیهاتووە.

تەواوێتیەکی ڕەها کار ناکاتو ناشیەوێت کار بکات.

دەشێ گومانی ئەوە ببەین کە لەوانەیە تەواوێتیەکی ئـەوو نـەبوونی ڕەهـا – العدم المطلق– ڕەهاو نەبوونی ڕەها وەك یەك وابن...

دەبا باسی ئەرستۆ بکەین کە پێش هەموو شتێ ئەو خاوەنی ئەو بۆچوونە بوو[٦].

با وای دابنێین کە ئەو عەقڵە مەزنەی هەیەتی بـەو کەسـەی ئەبەخشـێ هەسـت بـە توناکەی بکات، کەس ناوێرێ ڕەخنەو سوکایەتی پێ بکات پێش ئەوەی هـەوڵی خـۆی لـە داوای لێبوردنکردنـدا بچوێنێـت بـە هـۆی نـەفامی ئـەو زەمەنـەی ئـەو تیـایدا ئـەژیاو کەمتەرخەمی بیرو هزری دەوروبەرەکەی تەنی‌بوو، نەك بە لایەنی نـەفامیو کەمتەرخـەمی بیر کردنەوەی ئەوەوە؛ ئەویش هەرگیز لە بیر کردنەوەکانیدا ئەگەرێکی پێش نـەهێناوین ئەگـەر نەیگەیاندبێتـە ئـەو پـەڕی مـەوداکانی،و پێداویسـتیو بەربەسـتەکانی بـە ئاکـام نەگەیاندووە هێندەی لە توانای مرۆڤدا هەبێت لە ئەنجام گەیاندنی.

با بڵێین ئەوە ئەرستۆیە؛ بۆ ئەوەی باسـی ئـەو عەقڵە دەگمەنە بکـەین کـە کـەمو کوڕی لە تێڕوانینی سیفەتە بەرزو بڵندەکـاندا نـەبووە؛ بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـە زەمـانێکدا ژیاوە کە مەعریفە نەیتوانیوە کەوا تایبەتمەنیەکانی بوونەوەری زەوی "نـەوی – السـفلی" ئاشکرا بکات کە هەستی پێ دەکەینو لە دوو توێیدا دەژین، جـا گـەر ئـەو بیزانیایـە ئـەو سیفەتو نیشانانە چین کە ئەو هەیەتی ئەوا ئـەو کاتـە لـەو پـەڕی کـەمالی بەرزایـەتیدا رای

---

[٦] ئەرستۆو ئەوانی تریش سەبارەت حەقیقەتەکانی بوون وەك منداڵ وان، گەر لەگەڵ پێغەمبـەراندا علیـهم السلام بەراورد بکرێن.

خۆی دەگوت، نەك ئەو ڕایانەی کە لەسەرچاوەی گومانەوە هەڵقوڵاون‌و پێوانەکەیان لەسەر هیچ پێوانە کراوێك دانەمەزراوە[٧].

وا لە کەمالی بوونەوەرە بڵندەکانەوە[ئاسمانیەکانەوە]تێدەگەیشت کە بوونەوەری هەمیشەیین‌و دەمێننەوەو لە ناو ناچن؛ چونکە لە ڕووناکی دروست بوون‌و ڕووناکیش سانایەو تووشی لەناوچوون نایەت، وەك چۆن بەسەر ماددە پێکهاتەییەکانا دێت.

جا گەر ئەرستۆ تا ئەو کاتە بژیایەو بیزانیایە ماددەی زەوی – نەوی– هەمووی لە ڕووناکییە،و ڕەگەزەکانی ماددەش هەموو دەگێڕدرێنەوە بۆ گەردەکان‌و کارەبا، ئەم گەردو کارەبایانەش پەرت دەبن‌و دەبنە تیشك؛ ئەو کاتەش زەن و گومانی پێوانەکانی تووشی ئەو هەڵەیەی نەدەکرد، جیاوازی نێوان پێداویستی مانەوەو پێداویستی لەناوچوون، یان لە نێوان تایبەتمەندییەکانی ساکاری‌و تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی (خصائص التركيب) دایە.

دەبوو دەرك کردن بە هەڵەکانی لە تێگەیشتن لە پێداویستییەکانی سادەیی‌و کەمالیی، و پێداویستییەکانی مانەوەو لە ناوچوون، وای لێ بکردایە بۆچوونە هەڵەکانی سەبارەت تێڕوانینەکانی لەمەڕ پێداویستییەکانی کەمالی خودایی ڕاست بکردبایەوە، ئەوجا لە عەقڵیدا هیچ ڕێگرێك پەیدا نەدەبوو لە بارەی کۆکردنەوەی یەك کەمال لە چەند سیفەتێکدا وەك سیفەتی پیرۆز لە تێڕوانینی ئیسلامدا خوای پێ وەسف دەکرێت، وەك میهرەبانی‌و بەخشین‌و هێزو تواناو کارو ویست، و هیچ ڕێگرێکیش نیە لە هۆشیدا بەرانبەر ئەم سیفەت‌و پێداویستی‌و داخوازیانە، چونکە هیچ هێزێك نیە بێ بوونی هێزسەپێنێك بەسەریدا، دڵ فراوانییش (کَرَم) نایەتە دی بێ بەخشین، ویستیش بەبێ هەڵبژاردنی نێوان دوو شت نایەتەدی، جا گەر خوای گەورە شتێك هەڵبژێرێت ئەوا لەبەر زاتی خۆی نایەوێت،

---

[٧] ئەگەر ئەرستۆ لەگەڵ ئەم نەفامییەی‌دا یەکەم مامۆستا بێت وەك دەڵێن؛ ئیدی چۆن دێت بە بیری مرۆڤدا کە شوێن کەوتەی پێغەمبەران گوێ بۆ وڕێنەو هەڵەکانی خەڵکانی تر بگرن.

بەڵکو بۆ بەندەو بەدیهاتووەکانیەتی، کە زۆر حاڵەتی بۆ دەگونجێت لە بارەی مافی خوداوە ناگونجێت، جا گەر خودا شتێکی دروست کرد لە زەمانێکدا ئەوا نابێت لـە تـێڕوانینی هـەتا هەتایی خوداوە تەماشای ئەو شتە بکەین، بەڵکو دەبێت تەماشـای ئـەو شـتە بەدیـهاتووە بکـەین لـە زەمانەکـەی خۆیدا، پاشـان هیـچ ڕێگرێـك نیـە لـە بـەردەم ژیرییـدا کـە ویسـتی ئەبەدییەتی خوای پێوە پەیوەستە بەو جۆرەی لە هەر زەمانێکدا بێت.

تێگەیشتنی ساکاری هەتا هەتایی‌و مانەوەیی لای ئەرستۆ ئـەوە نیـە کـە ئـەمڕۆ لـە بوونەوەرە زەمینیە نەوییەکان هەستی پێ دەکەین جا چ جای بۆ چوونی کەمالی ڕەهـا لای ئێمە، وەك ئەو بۆچوونەی ئەرستۆ بێت کە بە نەبوونێکی ڕەهای چواندووە، نەکارکەرو نـە ویستخوازو نەزانا بێت بە نیعمەت‌و بەخششەکانی خۆشبەختی... ڕازی بێت بەوەی کە ئەو نیعمەتبەخشی گوشادە.

بـەم پـێیـە بۆمـان هەیـە بپرسـین: ئایـا ئەرسـتۆ بـە داماڵاندنـە فەلسـەفییەکەی توانیویەتی پلەی کەمالی بەرزو بڵندی بگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی کـە موسـڵمان لـە عـەقیدەی ئایینەکەی پەی پێ بردووە؟.

بە یەقین‌و دڵنیاییەوە دەڵێین: نەخێر خودا لە ئیسلامدا بێ نیازە بە خـەڵك‌و جـێی نیازی هەمووانەو یەکەمینەو کۆتایی بۆ نیە، نموونەی بەرزێتیش هەر شایستەی ئەوە، هیچ شتێك وەك ئەو نیەو پەی بە هەموو شتێك دەبات.

پـاش ئەمـە ئـەوە مـاوە بپرسـین: ئایا عـەقیدەی ئـایینی کـەمتر پـەی بـردووە بـە بۆچوونی پاکێتی (التنزیه) وەك لە بیرۆکە فەلسەفەییەکاندا؟

لە وەڵامدا دەگوترێت: نەخێر! بەڵکو ئـایین لێرەدا فەلسـەفەیەکە ڕاست تـرە لـەو فەلسەفەیەی بەو جۆرە دەڵێـت، گـەر بـە پێوانـەی فەلسـەفەی ڕاسـت‌و دروسـت بیپێوین، چونکە سیفەتەکانی خودا کە لە عەقیدەی ئیسلامیدا هاتووە لەوە دەرنـاچێت کـە نـەرێی ئـەو کـەم‌و کوڕیانـە بکـات کـە لـە حـەقی خـوادا نـاگونجێن، هـەروەها هـەژمار کردنـی کەموکوڕییەکانیش نابێتە هۆی پێداویستی هەژمار کردنی کەمالی ڕەها کە تاکڕەویی تیایەو

نایەتە هەژمار کردن. چونکە کەمالی ڕەها یەکە، بەڵام کەم‌و کوڕییەکان زۆرن، بە تەنیا ئەو یەك کەمال‌و تەواوییە هەمووی نەریێ دەکات، باوەڕی موسڵمانیش بە ﷲی زاناو بە توانـاو کارلەجێ (بەوەی دەیــەوێ) بەخشـەرو میـهرەبان، ئـەوە دەگەیـەنێت کـە پـەروەردگار لـە هەموو نەزانین‌و دەستەوەسانی‌و نکۆڵی‌و بێ ئاگاییەك دوورە، چونکە ئەو تەواوو پاکـە لـە هەموو کەم‌وکوڕییەك، داخوازییەکانیشی ئەوە دەخوازێـت کـە کارکـەرو بەدیهێنـەر بێـت،و ئەوەی دەیەوێت بۆ بەدیهاتووەکانی مەبەست بێت، داخوازی کـارو بەدیهێنانیشـی ئەوەیـە کە دوور بێ لەو (گۆشەگیرییە شادە —العزلة السعيدة) کە ئەرستۆ لە بابەتی دامـاڵین‌و پـاك ڕاگرتنەوە بە هەڵە لێکی داوەتەوە. ئەو شادە[8] بە نیعمەتی کەمال، شـادمانە بـە نیعمـەتی بەخشینەکانی، بەسییەتی (کیفایتە)بۆ زاتی بلّنـدی خـۆی ڕێ لـەوە نـاگرێت کـە هـەبوونی پێویست‌و بەسییەتی بەندەکانی بدات لە کاتێکی دیاری کـراودا، یـاخود لـەو بوونـە دیـاری کراوەی کە بەرەنگاری بوونی خودا ناکات لە بابەت ئەبەدی‌و بێ سەرەتایی‌و کۆتـایی‌و بـێ هاوەڵ‌و هاوشێوەیی.

و لە سیفەتەکانی خودا لە ئیسلامدا، لەوەی کە دەبێتە وەڵام بۆ فیکـرەو بۆچوونـی ﷲ لە فەلسەفەی ئەرستۆدا هەروەك چۆن دائەنرێت بە وەڵامی خاوەن لێکدانەوەی ئایینە کتێبدارو بێ کتێبەکان ئەوەیە: خودا لای ئەرستۆ خۆی ئاقڵ دەکات بـەڵام نـاتوانێت جگـە لـە خـۆی ئـاقڵ بکـات، پـاك دەبێتـەوە لـە ویسـت‌و داخـوازی چونکـە ویست بـە ڕای ئـەو داواکارییە، خوداش تەواوەو هیچ شتێك جگە لە خۆی داوا ناکات، مەزنترەو پەی بە هەموو زانستە هەمەکی‌و هەندەکییەکان بردووە، چونکــە وای دادەنێـت ئەمـە لـە زانسـتی عـەقڵی ئادەمیزادە، ماناش لە بەدیـهێنان بـەزەیی‌و دڵ ڕەقـی نیـە... چونکـە بەدیـهاتووەکان لـە

---

[8] گوتەی (بەختەوەری) بۆ خودا وشەیەکی فەلسەفی‌یە، لە زاراوەی ئیسـلامی‌دا بـەکار نـەهێنراوەو بـەکار ناهێنرێت.

پێشترن بەوەی داوای کەمال بکەن بە هەوڵدان بۆی، بەڵام لە ئیسلامدا خودا زانای پەنهانو ئاشکراکانە.

﴿وما يعزب عن ربك من مثقال ذرة﴾ يونس/ ٦١.

واتە: و هیچ شتێك لە زەویو ئاسمانەکاندا لە پەروەردگارت ون نابێ، بە ئەندازەی تۆزقاڵێك نە چکۆلەتر لەوەو نە گەورەتر لەوە.

﴿وهو بكل خلق عليم﴾ يس/ ٧٩.

واتە: ئەو بە هەموو بەدیهاتوویەك زاناو ئاگایە.

﴿وما كنا عن الخلق غافلين﴾ المؤمنون/ ١٧.

واتە: و لە مەخلوقی خۆمان غافڵ نین.

﴿وسع ربنا كل شيء علما﴾ الأعراف/ ٨٩.

واتە: ئاگاداری پەروەردگارمان هەموو شتێکی داگرتووە.

﴿ألا له الخلق والأمر﴾ الأعراف/ ٥٤.

واتە: ئاگادار بن کە بەدیهێنانو تەگبیری (جیهان) بۆ ئەو (خواو بە ئەمری ئەو)ە.

﴿عليم بذات الصدور﴾ فاطر/ ٣٨.

واتە: بەڕاستی خوا زانا بە دڵو نێو سینەیە.

هەروەها ئەو خاوەن ویستو کارلەجێیە بەوەی دەیەوێت.

﴿وقالت اليهود يد الله مغلولة غلت أيديهم ولعنوا بما قالوا بل يـــداه مبســـوطتان﴾ المائدة/ ٦٤.

واتە: و یەهودیان وتیان: دەستی خوا گرێ دراوە، دەستی ئەوان گرێ درێ،و لەبەر ئەم قسە وا دەیکەن لە رەحمەتی خوا دوور بن، (وا نیە) هەردوو دەستی (وزەی) خوا ئاواڵەیە.

جا لەم ئایەتەدا وەڵامی ئەو جولەکە عەرەبانە دراوەتەوە کە تایبەتە بە بۆنەیەکی دیاری کراو، ئەویش زەکاتو صەدەقەیە، وەك چۆن لە وتەی هەندێك لە راڤەکاراندا هاتووە

بەڵام وەڵامیشە بۆ هەموو ئەوانەی ویستی خوا دەبەستنەوە لە هەر بارێك لەبارەكانەوە بێت، دووریش نیە لە نێو جولەكەكانی دوورگەی عەرەبی كەسانێ هەبووبن ئاماژە بە یەكێ لە گێڕانەوە فەلسەفییەكانی ئەرستۆیان كردبێ لەو بارەوە.

قورئان ئاماژەی بە جیاوازی نێوان ئایینە جۆراوجۆرەكان كردووە، لەوانە ئەوەی لە سورەتی (الحج/١٧)دا هاتووە:

﴿إن الذين آمنوا والذين هادوا والصابئين والنصارى والمجوس والذين أشـركوا إن الله يفصل بينهم يوم القيامة إن الله على كل شيء شهيد﴾.

واتە: بەڕاستی كەسانێ كە بڕوایان هێناوەو كەسانێ كە بوونەتە جولەكەو سائبینو مەسیحیو زەردەشتی (مەجوس ١١ سەدە بەر لە زایینی سەری هەڵداوە)و ئەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، خوا لە ڕۆژی بەرێ لە نێوان ئەواندا داوەری دەكاو هەق لە باتڵ جیا دەكاتەوە، بەڕاستی خوا لەسەر هەموو شتێك حازرو ئاگایە.

لە سورەتی (الأنعام/٢٩)یشدا ئاماژە بە دەهرییەكان كراوە: ﴿وقـالوا إن هـي إلا حياتنا الدنيا وما نحن بمبعوثين﴾.

واتە: و وتیان: بێجگە لە ژیانی دونیا، ژیانی تر نیە،و ئێمە زیندوو نابینەوە.

ولە سورەتی (الجاثية/٢٤)دا هاتووە: ﴿وقالوا ما هي إلا حياتنا الدنيا نموت ونحيا وما يهلكنا إلا الدهر وما لهم بذلك من علم إن هم إلا يظنون﴾.

واتە: و ئەوانە وتیان: بێجگە لە ژیانی ئەو دونیایەمان، شتی تر لە كاردا نیە، دەستەیەك لە ئێمە دەمرنو دەستەیێتر جێگای ئەوان دەگرنەوە، بێجگە لە ڕۆژگار شتی تر ئێمە لە ناونابا،و ئەوان بەو قسە كە دەیڵێن بڕواو یەقینیان نیە، بەڵكو تەنیا گومانی بێ بنەڕەتیان هەیە.

كەواتە بیری ئیسلام سەبارەت ﷲ بیری تەواوكاری هەموو ئەو بیرۆكەو بۆ چونە زۆر و پەرتو بڵاوانەیە كە لەو بیروباوەڕە ئاینیانەدا هەیەو هەروەها لەو ڕێچكە فەلسفەیانەدا لەدەوری دەخولێتەوە؛ لەبەر ئەمە نمونەی بەرزی لە سیفەتەكانی زاتی

خوادا گەیشتۆتە رادەیەك، لەناواخندا راستکردنەوەی ویژدانەکانو ئەقڵەکانی لە خۆگرتووە، بە جۆرێك کە شایستەی کەماڵی خوداوەند بێت، بە سۆنگەو پێوانەی ئیمانیو تێڕوانینو پێوانە کردنی.

ئیدی بیری مرۆڤدائەندرێت بە یەکێك لە هۆکارەکانی گەیشتن بە ناسینی ﷲ لە ئیسلامدا، هەرچەندە ڕێ پیشاندان هەمووی لەلایەن خوداوەیە.

و سەرجەم ئەوەی دەگوترێت سەبارەت بیروباوەڕی زاتی خودایی کە ئیسلام باسی کردووە ئەوەیە: زاتی خودایی لەو پەڕی تەواوێتیو ڕێزدارترین سیفەتەکاندایە لەوەی کە نایەت بەعەقڵی مرۆڤدا. ئیسلامیش وتەی یەکلاکەرەوەی هەیە سەبارەت کێشەی مانەوەو لە ناوچوون لەم بارەوە. عەقڵ سەبارەت هەبوونی هەمیشەییو هەبوونی لە ناوچوون لە بۆچوونی بیروباوەڕی ئیسلام زیاتر ناڵێت، چونکە عەقڵ ناتوانێ تصوری دوو بوونی هەتاهەتایی بەدینەهاتوو بکات، بەجۆرێك یەکێکیان رووتکراو و داماڵراو (مجرد)، ئەوی تریان ماددە بێت، و ئەو دووانەش هیچیان سەرەتاو کۆتاییان نەبێت.

بەڵام عەقڵ تەصەوری بوونێکی ئەبەدی ئەکات کە هەبوونێکی زەمەنی بەدیبێنێت، یان تصوری هەبونێك دەکات هەر بەردەوام بێت، تەصوری هەبوونێك دەکات کە لەماوەیەك دەست پێ بکاتو لە ماوەیەکی تری زەمەنی تەواو بێت.

لە کۆنەوە ئەفلاتۆن گوتویەتی – لەمەدا راستی گوتووە–: زەمان لاسایی کارو گێڕانەوەی هەتا هەتایی نیە.. چونکە ئەو بەدیهاتووەو بەڵام هەتاهەتاییتی: بەدێهاتوو نیە.

کەواتە مانەوەی بەدیهاتووەکان مانەوەیە لە زەمەندا، بەڵام مانەوەی بەدیهێنەرمان، مانەوەی هەمیشەییو هەتاهەتاییە کە نەڕابوردوو ئێستاو داهاتوو ناتوانێت سنووری بۆ بکێشێتو لەبەردەمیا ببێتە ئاستەنگ.

چونکە هەموو ئەمانە لە سنووری جوڵەو گواستنەوەی بۆچوونی ئەوەی لەناوچوونەکانن، کە جوڵەو گواستنەوە سەبارەت بەدیهێنەری هەتا هەتایی ڕێی تێناچێت.

ﷲ بەجۆرێکە: ﴿الحي الذي لا يموت﴾ الفرقان/٥٨.

واتە: هەمیشە زیندووەو قەت نامرێ.

﴿وهو الذي يحي ويميت﴾ المؤمنون/٨٠.

واتە: و ئەو زاتێکە زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ.

و ﴿كل شيء هالك إلا وجهه﴾ القصص/٨٨.

واتە: هەموو شتێك تیا دەچێ مەگەر تەنیا زاتی پاکی ئەو نەبێ.

جا هەر چەندێك پلەی خاوێنێتی هزرو بیری خودایی لە ڕێبازەکەی ئەرستۆدا بەرز بێتەوە، وەك چۆن هەندێك لێی دواین، یاخود ڕێچکەی مامۆستاکەی ئەفلاتۆن کە هەندێك ئاماژەمان پێدا، ئەوا ئەم پاك کردنەوە فەلسەفییە[٩] نزیکترە لەوەی کە لە خەیاڵو ئەندێشەیەکی هەڵچووەوە هەڵقوڵابێت، سەبارەت بیروباوەڕی خودایی کە لەنێوان کاهنو پەرستشە یۆنانیەکاندا تەشەنەی کردبوو.

بێگومان وێنەی "جۆبیتێر" کە لای ئەوان خوای خواکانە، نزیکتر بوو لە وێنەی شەیتانەوەإوەك لە خوایەکی پاكو بێ لەکە، هەرچەندە وەسفی پاکڕاگرتن لای ئەوان نەگەیشتۆتە رادەی کەماڵی پێویست.

"جۆبیتێر" رقاویو بوغزنو توندو تیژ بوو، سەرقاڵی ئارەزووەکانی خواردنو دڵداری بوو، هیچ گوێی بە کاروباری خواکانو بەدیهاتووەکانی تر نەئەدا،تەنیا پاراستنی دەسەڵاتو ڕۆچوونی لە زوڵمو ستەمدا نەبێت، تووڕە دەبوو لە"أسقولاب" کە خوای پزیشکێتی (الطب) بوو، چونکە نەخۆشانی تیمار ئەکردو بێ بەشی ئەکردن لە وەرگرتنی ئەو باجانەی لەسەر گیانی مردووەکان لەسەر زەمینەوە دەگوێزرانەوە بۆ ناخی کەوتنە خوارەوەی ناو ئاگر،و لە "برۆمثیوس" تووڕە دەبوو کە خوای مەعریفەو پیشەسازی بوو، چونکە خەڵکی فێری بەکارهێنانی ئاگر دەکرد،و مەعریفەی بە جۆرێك بەکار ئەبرد کە هێزێکی لێ

[٩] لەگەڵ ئەمەشدا شتێك بوو لە لاڕێو هەتڵە بوون.

پێك بێنێ‌و بەرەنگاری هێزی خواكانی پێ بكات، بۆیە بە سزایەكی هەمیشـەیی حوكمـیدا، تەنانەت بە مردن‌و دوور خستنەوەشی لە ریزی خواكاندا رازی نەبوو، بەڵكو هونەری بـەكار دەهێنا لە دۆزینەوەی جۆرەها سزا بۆی، بە كێوێكی سەختەوە بەستییەوەو باڵندە گۆشت خۆرەكانی بۆ ئەنارد تا جەرگی هەڵدڕن‌و بیخۆن بە درێژایی رۆژگـار،كـە شـەویش دادەهـات چاك ئـەبووەوە، ئیـدی لـە دوای رۆژهـەلاتن بـە هـەمان دەرد ئـەچووەوە.. بـەم جـۆرە بـە بەردەوامی لە سزادا بوو، بێ هیچ تكاكارێك‌و داواشی لێ وەرنەدەگیرا. لەو گێڕانەوەشدا كـە شاعیرو فەیلەسوف (هزیۆد) لە بـارەی هـۆی توڕەبوونـی خوداكـە لـە (برۆمیثـوس) روونـی دەكاتەوە: ئەوەیە كە ئەو بەشـە گۆشـتەی لـە خۆراكـی شـایی خواكـاندا بـە جۆرێـك بـۆی دانابوو ئێسكی زۆر تێكردبو و كەمتر گۆشت‌و چەوری بۆ دانابوو، (جۆبیتێر)یـش وای زانـی كە بە هۆی مەعریفە زانین‌و زیرەكییەكەیەوە خۆی بەسەردا دەسەپێنێ، چونكـە لـە نێـوان خواكـاندا بـە مەعریفـەی فـراوان‌و زیرەكییـەكی بـاش ناوبـانگی دەرنـەكردبوو كـە خـوا گەورەكەش بەم جۆرە ناوبانگی دەركردبوو. نابێت ئەوەش لە یاد كەین ئێمـە كـاتێك بـاس لە خوا گەورەكە دەكەین ئەوا لە (هزیۆد)ی شاعیرو فەیلەسوفەوە وەرمان گرتووە، زۆریش هەوڵی داوە "جۆبیتێر" بە پاك‌و بێ لەكەیی رابگرێ‌و لـە بـەرگێكی پـیرۆزو گـەورەییدا بـە خـەڵكی نیشـان بـدات، كـە لەگـەڵ خوایـەكی پەرسـتراو بگونجێـت دوای بـەرز بوونـەوە لـە پەرستندا لە ئایینی یۆنانیە كۆنەكاندا.

لەمەدا گێڕانەوە جیاوازەكان لە (جۆبیتێر)ەوە گێڕاویانەتەوە كە فێڵی لـە (هـیرة)ی خـێزانی دەكـردو خـوای هـەوری رەوانـە دەكـرد بـۆ سەرپەشـتی كردنـی خـۆر لـە كـاتی هەڵهاتنیدا، لە ترسی هەڵنەكردنی (غیرة) لای خێزانەكەی لە كاتی هاتنی رۆژدا،و موفاجەئە كردنی لە نێوان دڵدارەكانیدا لەسەر عەرشی (ئۆلمپ).. جارێكیان خێزانەكەی لە ناكـاوێكدا دەیبینێت پێی (جانیمید)، كە شوانێكی قەشەنگی مەڕو مـالات بـوو، لـە چۆڵـەوانیدا ماچ دەكات ئیدی دەبـات‌و بەرزی دەكاتەوە بۆ ئاسمان... ئیدی (جۆبیتێر) نەیتوانی خۆی لـە

تـاوانی سـەرقاڵ بوونـی بـە قاچییـەوە بشـارێتەوە، بۆیـە بـۆ خێزانەکـەی نـەفامی خـۆی دەرخست سەبارەت کۆکردنەوەی لەززەتی نێوان تامی جامێکو تامی لێودا.

نموونەیَ نەتەوە پێشینەکانیش وەکو یۆنانیەکانە؛ کە دوورییەك هەیە لە نێوانیاندا، لەنێوان وێنەی خودا لە حیکمەتی فەیلەسوفەکانو ریَو رەسمی کاهینو پەرستشکارەکان.

هندییـە کۆنـەکانیش پـەرستگاو جێگاکانیـان جۆرەهـا خوداوەنـدی لێبـوو: لەوانـــە ئەوانەی پەیوەندی هەبوو بە ئاژەڵو رەگەزەکانی سروشت، ئەوانەی پاشـکۆی رەچەڵـەكو بتەکان بوون، و زۆرجار لە مجێور داوا دەکرا کە لێیان نزیك بێتەوە بە بیَ رەوشـتی پـیرۆز (البغاء المقدس)و رشتنی خوێن (سفك الدماء).

ئەم خوداوەندە جۆراوجۆرانە بە سێینە (الثالوث)یەکی هەمیشەیی کۆتایی هات کـە سـیَ وێنـەی خوایـی دەگرێتـەوە: ئـەوانیش"براهمـا"ی خـودا لــە وێنــەی بەدیهێنەردایــە، "فشنو"ی خودا لە وێنەی پارێزەردایە، "سیفا"ی خودا لە وێنــەی روخێنەردایـە... ئیـدی کاری روخانو خراپەکارییان تایبەت کردبوو بە خوای هەرە مـەزن کـە ئـەم کـارە دەگرێتـە ئەستۆ کاتێك لەو بەرگەدا خۆی بۆ بەندەکانی دەنوێنێت.. لەگەڵ ئەمەشدا شـتێکی تریـان زیاد کردبوو ئەویش ئەوە بوو کە بۆ هەر خوایەك پەیوەستێك "قرينة"یان دانـابوو ناویـان نابوو "الشاكتي" یان خێزانو هاوڕیَ، هێندە شەڕو خراپەیان ئەدایە پـاڵ کـە ئـەوەندەیان بە پەیوەستو هەڤاڵەکە نەدەگووت.

جا ئەم خوداوەندانە ئەوەندە ماوەیان دوور نیە لەگەڵ وێنەی شەیتانو دێوەکـانو رۆحە پیسەکاندا کە لە کۆنترین ئایینەکاندا هـاتووە، جـا گـەر بـە پلـەکانی پـاك بوونـەوەو داماڵین (التنزيه والتجريد)[10]دا سەربکەوین ئەوا لە لوتکەکەیدا دەگەینە دوو وێنەی جیـاواز: یـەکێکیان وێنـەی "الكارمـا"یـەو ئـەوی تریـان "النرفانـا"یــە، هــەردووکیان لەمــەڕ مانــا

[10] کاتێك عەقڤاد لەمەڕ پاکڕاگرتنو داماڵین لە لای نەتەوەکان دەدوێت، مەبەستی لەوە ئەو پاك راگرتـنو داماڵینە رێژەییە یە کە عەقڵی ئەو ئوممەتانە لـە حاڵـەتێك لـە حاڵەتـەکاندا گەیشـتویەتیَ، نـەك ئـەو پـاك راگرتنو داماڵینەی کە پێویستە بیَ، چونکە ئەوە تەنیا لای موسڵمانانە.وەك لە وتەکەیدا دەردەکەوێت.

هزرییەکانەوە حیسابیان بۆ دەکرێت، کەمو دەگمەن بۆ وەسـف کردنـی زاتـی خـودا بـەکار دێـت. کارمـا ئـەو قـەدەرە زاڵەیـە لەسـەر هـەموو شـتە هـەبووەکان، لەوانـە خوداوەنـدو تەنەکانی ئاسمان. ئەم قەدەرەش لە راستیدا حاڵەتێکە لە حاڵەتە گشـتییەکان، دەتوانـین مانای لێبکەین بەوەی کە ئەوەیە (پێویستە) یـاخود ئـەو دۆخـە بەرپابووەیـە بـە باشـترین نموونەو شێوەوە، ئەو قەدەرەی کە بەکارما ناو دەبرێت ئەو خودایە نیە لای ئەوان کـە بـە سیفەتە زانراوەکان وەسف کراوە، بەڵام هاو واتای وشەی "پێویستێتی –الإنبغاء–"ە یـان وشەی (ئەرك– واجب)ە، وەك چۆن لە رووداوو هەبووەکاندا واجب کراوە.

(نرفانا)ش حاڵەتێکی گشتییە وەك کارما بەڵام ئەمیان لە نەبوونـەوە نزیکـترە وەك لە هەبوون، چونکە بەو حاڵەتە دەگوترێت کە هـەموو گیـانێك کۆتـایی پـێ دێـت کـاتێك لـە نارەحەتی بوون تەواو دەبێت، ئەوسا راماڵ دەبێت لە خەریك بوونـە لاشـەیی‌و گیانیـەکان، ئەوا لەم حاڵەتی (نرفانا)یەدا گیانی خوداوەنـدو ئـادەمیزاد وەك یـەك دەبێـت، هەرچـەندێك شادمان بێت بە نیعمەتی نەمری هەست پێ نەکراوو نەبینراو.

ئێمە لەم چەندلاپەڕە کەمـەدا نامانـەوێت وێنـەی خوداوەندو پـەروەردگار لـە لای سـەرجەم نەتـەوەکانی شارسـتانیە یەکەمـەکان بخەینـە روو، بـەڵکو تـەنیا بـە چـەند نموونەیەکی بەڵگەدارەوە دەوەستین کە پلەی بەرزی پاك راگرتن لای ئەوان دەردەخـات،و ئـەو نـزم بوونەوەیـەی تووشـیان هـاتووە سـەبارەت تێڕوانینیـان بـۆ زاتـی خوداوەنـد لـە بەلاشەکردن‌و لێکچواندن‌و تێکدان، بۆ ئەوەی زیاتریش عادات‌و خوو باوی پێشینەکان لەم رووەدا روونتر بکەینەوە ئەوا پێویستە ئەم نموونەیەش باس بکەین لە پاڵ ئەوەی یۆنـانی‌و هندییـەکاندا، ئـەویش نموونـەی ئـاینی میسـرییە کۆنەکانـە، لـە کۆنـترین سـەردەمی فیرعەونەکانەوە تا سەردەمی ئایینە پەڕاوییەکان، ئـەویش –واتـە ئـایینی میسـری کـۆن– پێشکەوتوو ترین ئایینە کـە لـە یەکتاپەرسـتیی‌و پـاکڕاگرتندا گەیشـتبێتێ، هەرچـەندە لـە

پەرستشە بەناوبانگو بڵاوەکانیدا هەندێك جار دەگاتە رادەی ئایینە پێشینەکان لە پەرستنی (سنجاق)[11] و بت،و پەرستنی گیانە پیسەکانو شەیتانەکان.

ئایینی میسرییە کۆنەکان گەیشتە رادەیەکی بڵند لە یەکتاپەرستییو پاکڕاگرتندا بە تایبەتی لە ئایینی (آتون)دا کە موژدەی پێدرا بۆ فیرعەون کە دەگێڕدرایەوە بۆ (ئەخناتون).

لە نوێژە پارێزراوەکانی (ئەخناتون)ی بەردەستمان، کە نوێژی بۆ یەك بەدیهێنەر دەکرد، نزیکە لە سیفەتدا بگاتە رادەیەك ئەو خوا بەدیهێنەرەی کە خواناسەکانی شوێنکەوتەی ئایینە پەڕاوەکان نوێژییان بۆ دەکرد، گەر ئەو نامۆ بوونو لادانەی تیا نەبوایە لە پەرستنی بێباوەڕیی کە پابەند کرابوو بە پەرستنی خۆرەوە، کە ئەم جۆرە خۆرە دنیاییەش رەمزو هاومانای ناوی بوو لە زۆربەی نوێژەکاندا.

۞۞۞

ئەم گەواهیدانە لە مێژووی کۆنەوە، گەواهی دانی نموونە هێنانەوەیە نەك گەواهی ژماردنو بەش کردن، لە دەلالەتو ئاماژەکردنیشدا بەسە بۆ ئەوەی نموونە بۆ پاکڕاگرتنی بیری خوداوەند لە نێو نەتەوەکانی مێژووی کۆندا بهێندرێتەوە، چونکە بەڵگەیە لەسەر پلەی گەیشتنی بیری خودایی پاك لە پێشکەوتووترین شارستانیە یەکەمەکاندا، کە ئەوانیش شارستانێتی میسریو هندیو یۆنانیە.

کۆی تێبینی سەبارەت بە پاکڕاگرتنی بیری خوداوەند لای پێشینەکان ئەوەیە کە؛ پاکڕاگرتنێکی تایبەت بوو، کورتی هەڵهێنابوو لەسەر کۆمەڵێکی کەمی بیر مەندو هۆشمەندەکان کە لە نهێنی ئاییەکانیان دەزانی.

---

[11] ئەو گیانانەن دەچنە شێوەی شتی ترەوە. وەرگێڕ

پاش ئەمەش تێبینی ئەوە دەكرێ، ئەو بە پـاك راگرتنـە هـەموو كـاتێك لـە لاوازیو كەمو كورتی بەدەر نەبووە كە ژیریی وای ببینێ، ئەمەش وای لێدەكات لەبارو شیاو نەبێت بەتایبەتی كۆمەڵێك بیكەن بە ئایینی خۆیان.

بۆ نموونە لە ئایینی میسرییەكاندا بـیری یەكتاپەرستیی لە ژەنگو ژاری بێباوەڕیی بەدەر نەبوو، پەرستنی خۆر دیاردەیەكی كاریگەر بوو لە پەرستنی (آتون)دا.

ئـایینی هندییـەكانیش خـەڵكی فـێری بڕواهێنــان بــە زاتــی خــودا نــەدەكرد كــە سیفەتەكانی ئاشكران، هیچ پەرستراوێكیشیان لە كارمـاو نرفانـا لا رێـزدار تـر نـەبوو، ئـەو دووانەش بە واتا هزریو ناوەكییەكان نزیكترن لە بوونەوەرە زیندووەكـان، (نرفانـا)ش كـە یەكێكیانە، لە فەناو لە ناوچوونەوە نزیكترە وەك لە مانەوە.

و پاك كردنەوەی فەلسەفیی كە حیكمەتی یۆنانیی لــە رێبازەكـەی ئەرسـتۆدا پــێی گەیشت، تەنانەت نزیكە لــەوەی بگاتــە ئــەو رادەیــەی تــەواوێتیو كــەماڵی ڕەهـا بداتــە پــاڵ نەبوونو عەدەمی ڕەهاوە، ئیدی وێنەی خوایەكمان پێ نیشان ئــەدات كــە شایسـتەی بـڕوا پێ هێنان نیەو بە پێی ڕۆشنایی بۆچوونی دروستیش جێی قەناعەتو متمانە نیە لەســەر ڕۆشنایی تێگەیشتنێكی دروستەوە.

هیچ كام لەمانە لە بــە پـاك راگرتــنی خــودادا نەگەیشــتوونەتە ئـەو ئاسـتەی ئــایینی ئیسلام هێناوێتیی، كە گونجاو بێت لە بڕواپێهێناندا لە عەقیدەیەكی ئایینیو گونجاوبێ لـە وەرگرتنی رێبازەكانی هزریدا.

هەر وەك زانراوە ئایینی ئیسلام سێیەم ئایینی بەناوبانگە لــە نێـوان ئایینــە خــاوەن كتێبەكان، پلەو شوێنی لە نێوان زانستی بــەراوردكاریی ئایینــەكاندا پەیوەسـتە بـە شـوێنی دوو ئایینەكەی دیكەوە كە ئەوانیش موسایيو مەسیحییە،و بەراووەردكاری نێوان ئیسلامو دووئایینەكەی تر بە شێوەیەكی پراكتیزەیی: ڕۆژئاواییــەكان لــە نووســینەكانیان ئامـاژەیـان پێداوە كە زۆربەیان نەگەیشتوونەتە تێگەیشتنێكی پێویست بە ئیسلام، بۆیە بــە تــیرازێكی تێكدراوو هەڵگەڕاوەی ئایینی مەسیحیو موسایی تێدەگەن.

لەراستیدا ئـەم کێشـەیە کێشـەی دەقـی پـارێزراوو پەرستشـی تێبیـنی کـراو کـە دەمەقاڵەی دوورو درێژ لـە کێشـانی رەخنـەو بـەراوردکاری ناگرێتـە خـۆی؛ هەرچـەندە لـە بواری بانگەوازو رکابەری دەمارگیریدا بواری هەبووە، تەنیا ئەوەندە بەسـە لـە نێـوان ئـەم ئایینانەدا کە باسی بیروباوەڕی خودایی بکەین لە هەر یەکێکیاندا، تا پلەو پایەی راستی بە پاك راگرتن لە حوکمی ئایینو مەعریفەی تیۆرییەوە دەربخەین.

ئەو سەرچاوانەی کـە بیروبـاوەڕە عیبرییـەکانمان لێ وەرگرتـووە بـە شـێوەیەك کـە ئەمڕۆ شوێنکەوتوانی ئایینی موسایی پەیڕەوی دەکەن، کە لەبەردەستی هـەموو کەسـێکدا هەیەوهەموو کەسێ دەتوانێ لـە زمانـە راسـتەقینەکەیەوە یـان زمانـە پەرچڤەکراوەکانـەوە بخوێنێتـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەم راسـتیانەی بـۆ دەربکـەوێ، بەناوبانگترینیشـیان تــەورات[12] و تەلمودن. جا وێنەی خودا لەم سەرچاوانەدا هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی وێنەی (یەهوا)یـە کە بە خوای گەلی ئیسرائیل دانراوە.

لە پەڕاوە پیرۆزەکانیشیاندا یەهوایان وا وەسف کردووە کە حەزی لە بـای گەرمـە، هەندێك جاریش دەربارەی گوتوویانە: بەژێر سێبەری باخچـەکاندا دەڕوات، تـا بەهەواکـەی فێنك بێتەوە، جگە لەمەش بە زۆر شتی تریش وەسفیان کردووە. بەوەی زۆرانبازی لەگـەڵ بەندەکانیا دەکاتو ئەوانیش زۆرانی لەگەڵدا دەکەنو لـە سـوارەکانی چیـا دەترسـێ وەك چـۆن سـەربازەکانی لێی دەترسـن. سـەردەمێکی زۆریـش لەگـەڵ عـیزرائیلی شـەیتانی ئافەریدەکان هیچ جیاوازییەکیان نەدەکرد، ئیـدی بـە قوربـانیی لێی نزیـك دەبوونـەوە، لـە شەیتانیش بە قوربانیی وەك ئەو نزیك دەبوونەوە...

---

[12] دەقەکانی تەورات!یەهودو نەصاری‌یەکانی پێوە پابەند دەکات وەك یەك، کەچی ئەوانـە شـەرم ناکـەن بیروباوەڕەکەمان بەوەی خۆیان بەراورد بکەن. لەگەڵ ئەو هـەموو خـوارو خێچـیـەی تیایاندایـە، لەمـەش زیاتر بـەڵکو وای دەبینـن کـە بیروباوەڕەکـەی ئێمـە لـەوەی وان نزمـترو دابـەزیوترە، پاشـان بـەو جـۆرە کەسانەش دەگوترێت ئەوانە ژیری‌یان هەیە !.

عيبرانيـەكان لەسـەر ئـەم بيروباوەڕەيـان مـەيی بـوون. بۆيـە (يـەهوا) وەك خـوای عيبرييەكان مايەوە، نەوەكانی ئيسحاقی كوڕی يەعقوب لە ژێر كاريگەری ئەودا بوون، هيـچ كەسێكيش تكای رزگار بوونيان لیٚ ناكات تەنيا ئەوانە نەبێت كە پشـتيوانی عەرشـی داودو نەوەكەی بن دوای خـۆی، ئـەم بـۆ چوونـە هيـچ گۆڕانكارييـەكی بەسـەردا نـەهاتووە پێـش سەردەمی لە دايك بوونی مەسيح، هەروەها لە لايەن نـەوە پارێزگارەكـانی ئيسرائيليشـەوە هيچ گۆڕانكارييەك بەسەر باوەڕە يەكەمينەكەياندا نەهات، بەڵكو ئەم گۆڕانكارييە لە لايـەن كەسـانی نـوێی بـەرژەوەنديخوازی نـاو ئـايينی جولەكـەوە هـات، بـەڵكو كەســێكيش لــە نێوانياندا بەم كارە هەستا كە لە شەريعەتەكەی ئەواندا بـە پێغەمبـەرێكی لیٚ تـوڕە نـاوزەد كرابوو، كە لە دەستەكەی ئەوان لاياندابوەو يـاخی بـوون، ئـەويش عيسـای كـوڕی مەريەمـە (صلوات اللهو سلامه عليه).

عيسای كوڕی مەريەم، يەكەم بانگەوازی تايبەت كـرد بـە بـەنی ئيسـرائيلەوە، نـەك هيچ كەس‌و كۆمەڵێكی تر، لە ئينجيلەكانيشدا درێژەی گفتوگۆی نێـوان سـەييدی مەسـيح‌و ژنە كەنعانيەكەمان بۆ دەگێڕنەوە كاتێك پەنای پیٚ برد شەيتان لە كچەكەی دوور بخاتەوە، لە ئينجيلی مرقس الإصحاح حەوتدا هاتووە:-

(ژنێك كچەكەی تووشی شەيتان هاتبوو، ناوبانگی ئەويشی بيستبوو، چـوو بـۆ لایو خۆيـدا بەســـەر قاچـەكانيا، ژنەكـە- ئومـــەمی- بـوو واتـــە لــە نەتـــەوەكانی جگـــە لــە ئيسرائيلييەكان بوو، دەڵێن رەگەزی فينيقی سوری بوو، داوای لێكرد شەيتان لە كچەكـەی دوور بخاتەوە، بەڵام يەسوع پیٚی گوت: تۆ سەرەتا بهێڵــە بـا كوڕەكـان تـێر بـبن؛ چونكـە باش نيە نانی كوڕان بسێندریو بدریٚ بە سەگەكان، لە وەڵامدا پیٚی گوت: بەڵیٚ گـەورەم، هەروەها سەگەكانيش لە ژێر سفرەكانەوە لە پاشماوەی كوڕەكانيان دەخوارد، ئيدی پیٚی گوت: لەبەر ئەم قسەيە، بڕۆ ئەوا شەيتان لە لاشەی كچەكەت دەرچوو..).

گێڕانەوەی مەتی بۆ ئەم بەسەرهاتە وەك گێڕانەوەكەی مرقس وايە، لــە ئيصحـاحی پازدەی ئەو ئينجيلەدا هاتووە:-

(سەییدی مەسیح لەوێوە دەرچوو بەرەو دەوروبەری سوورو سەیداء کەوتە ڕێ، لە ڕێ تووشی ژنێکی کەنعانی بوو کە لەو ناوەوە دەهات، پێی گوت: بەزەییت پێمدا بێتەوە ئەی گەورەم کوڕی داود. کچەکەم زۆر شێت بووە. ئەویش هیچ وەڵامی نەدایەوە. پاشان قوتابییەکانی داوایان لێکرد بەوەی کە: وەڵامی بداتەوە چونکە بە دواماندا هاوار دەکات، لە وەڵامدا گوتی: من تەنیا بۆ لارو چەوێڵییەکانی نەتەوەی ئیسرائیلی نێردراوم کە گومڕابوون، ئیدی ژنەکە هاتو کڕنووشی بۆ بردو گوتی: ئەی گەورەم یارمەتیم بدە. لەوەڵامدا گوتی: باش نیە نانی کوڕان ببردرێتو بۆ سەگەکان فڕێ بدرێت، ژنەکە گوتی: بەڵێ گەورەم. هەروەها سەگەکان لەو پاشماوەیە دەخۆن کە لە سفرەی خاوەنەکانیانەوە دەکەوێتە خوار، لەم کاتەدا یەسوع وەڵامی دایەوەو پێی گوت: ئەی ژن! ئیمانو بڕوات بەرزە، کەواتە ئەوەی دەتەوێ با بێتە دی. ئیدی لەو کاتەدا کچەکەی چاك بۆوە).

لەم بەسەرهاتەو لەسەراپای هەواڵی قوتابییەکانی ناو ئینجیلدا هاتووە کە مەسیحی بەڕێز هەوڵی داوە بانگەوازەکەی تایبەت بکات بە نەوەی ئیسرائیلییەکان، ڕووشی لەوان وەرنەچەرخاندووە بۆ کەسانی تر تەنیا کاتێك نەبێت کە سوور بوون لەسەر نکۆڵی کردنو مووچڕ بوون لە وەرگرتنی پەیامەکەیدا، ئیدی دوای بێ هیوابوون لێیان، بڕیاریدا بانگەوازەکەی لە نێو نەتەوە پەرشو بڵاوەکانی نێوانیاندا پەخش بکاتەوە، نموونەی ئەمە وەکو ئەو ماڵە وایە کە خواردنی شایی ئامادە کردبێتو بانگی کەسو کارو دراوسێکانی کردبێت بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام ئەوان بیانووی سەرقاڵیو بوار نەبوونیان هێناوەتەوە، ئیدی ئەو ماڵە: خزمەتکارەکەی دەنێرێت بە دوای ئەو کەسانەی لەسەر ڕێ تووشیان دەبێت، وەك کەسانی نامۆو ڕێبوار، کە هیچ ناسیاوییێك لە نێوانیاندا نیە، تا ئەو ڕادەیەی ماڵەکەیان پڕ دەبێو جێی کەس نامێنێتەوە لەسەر سفرەکەیان، لەجیاتی ئەو کەسانەی کە بانگ کرابوونو نەهاتبوون.

لەبەسەرهاتی ژنە کەنعانیەکەوە تێبینی ئەوە دەکرێت کە سەییدی مەسیح بە (سەییدی نەوەی داود) بانگ کراوە، لە کاتێکدا باوەڕی یەهودییەکانیش وابوو بە هیوای

رزگار بوون بوون لەسەر دەسـتی ئـەو پێغەمبـەرەی لـە نـەوەی داودو لـە پشـتی یـەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بێ.

سەردەمی مەسیح تێپەڕی‌و دوای ئەو، سەردەمی پۆلصی پەیامبەر هاتە پێشـەوە، باوەڕی رزگاری کە لەسەر نەوەو رەچەی پشتی ئیبراهیمی خـەلیل وەسـتاوە هـەر لـە نێـو عیبرییەکاندا شتێکی دان پیانراووبەڵگـە نەویسـت بـوو، کـە ئـەو عیبریانـەی لەسـەر بـەندو باوەکانی خۆیان مابوونەوەو لە نێوان ئەو مەسـیحییانەی لـەو بـەندو باوانـە رزگاریـان بـوو بوو، بەڵام من لێرەدا راڤەیەکی نوێ بۆ ئەم بنەچەو بینایە زیاد دەکەم، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بینا رۆحییە تەنیا لەسەر بینایی لاشە نەوەستاوە، هیچ جیاوازییەکیش نیە لـە نێـوان ئەوانـەی کـە سـوننەتی ئیـبراهیم خـەلیل زینـدوو دەکەنــەوە لـە عیبرییــەکان،و لای ئــەو ئومەمیانەش کە عیبرییەکان بە (بالجوییم) ناوزەدیان ئەکەن.. واتە نەتەوە نامۆکان.

کەواتە عەقیدەی خودایی وەك عیبرانیەکان بڕوایان وایەو تا چەرخی لە دایـك بـوون دەقیان لەسەر گرتبوو، ئەوە عەقیدەی گەلێکە لە نێـو گەلـەکاندا هـەڵبژێردراوە سـەبارەت خوایـەك کـە لـەنێو هـەموو خوایـەکاندا هــەڵبژێردراوە[١٣]، لـەم عەقیدەیەشــدا بــڕوای یەکتاپەرستیی نابینرێتەوە،و ئەوەش نیە شایستەی ئـایینێکی ئـادەمیزادی بێـت، یـان بـە جۆرێکـی دروسـتی وا بێـت لێکۆڵەرەوەیـەکی بـە ویـژدان بـە سـەرەتایەکی بڕواهێنــانێکی خودایی دابنێت کە ئیسلام بانگەوازی بۆ کردووە.

پاش سەرهەڵدانی مەسیحییەت بیروباوەڕی خودایی گەشەی کرد، ئیدی بڕوا هێنان لەوەوە گواسترایەوە کە بڕوا بە خوا بهێنرێت بۆ کوڕەکـانی ئیـبراهیم.لـە لاشـەدا، بـۆ بـڕوا هێنـان بـە خـوا لـە نەتـەوەکانی ئیـبراهیم لـە گیانیشـدا، بـەم جـۆرە سـەردەمی سـەییدی مەسیح‌و سەردەمی پۆلصـی رەسـول تێپـەڕی،و مەسـیحییەت پـەیوەندی کـرد بـە نەتـەوە

[١٣] لێرەدا (عەققاد) زۆر دەقی تەوراتی هێناوەتەوە کە ئاماژەی ئـەوە دەکـەن ﷲ خـوای جیـهانیان نیـە، بەڵکو تەنیا پەروەردگاری ئەوانە، ئەوانی تریش خـوای تریـان هەیـە، لـە راسـتیدا ئەمـە ئـەو بیروبـاوەڕە پاڵفتەو روونە نیە کە موسا ﷺ بانگەوازی بۆ کردو تەورات پێش هەڵگێرانەوەی باسی کردبوو.

بیانیەکانەوە،لەسەرو هەمووشیانەوە نەتەوەی میسری، ئیدی لەم ئاکامـەوە بیروبـاوەڕێکی خوایی نوێ سەری هەڵدا لە بۆ چوونی عیبرانیەکاندا، ئەویش عەقیدەی (الثـالوث) بـوو کـە کۆی (باوكو کوڕو گیانی پیرۆز– الروح القـدس) لـە خـۆ دەگـرێ، ناوەڕۆکەکەشـی ئەوەیـە مەسیحی رزگار کەر کوڕی خودایە، خواش وەك فیـداو قوربانیـەك بـۆ نەتـەوەکانی ئـادەمو حەوای رەوانە کردووە، بۆ کەفارەتو سڕینەوەی ئەو هەڵەو تاوانەی تێی کەوتن کـاتێك لـە بەری ئەو درەختەیان خوارد لـە بەهەشـتدا، دوای ئـەوەی فرمانیـان پـێ کرابـوو لێی نزیـك نەبنەوە.

ئیدی ئیسلام هاتە گۆڕێو ئەو عەقیدە خواییە لە گـۆڕێ بـوو کـە ئـاییني مەسـیحی پـەرەی پێدابـوو، بـەوەی کـە ﷲ خـوای تـاكو تـەنیا لـە (ســێ) سـتوون[١٤] پێکـهاتووە، ئەوانیش: باوكو کوڕو روح القدسە، مەسیحیش ئەو کوڕەیە لەم سێ ئەقانیمەدا هەیـە، کـە خاوەنی یەك سروشتو تەبیعەتێکی خواییە بە پێی بـڕواو رێچکـەی کۆمـەڵێك مەسـیحی،و خاوەنی تەبیعەتێکی خواییو مرۆییە لە رێبازی هەندێ مەسیحی تردا.

شتێکی روونیشە کاتێك ئەو لێکۆڵەرەوەیـەی دەیـەوێت زانسـتی بـەراوردکاریی لـە نێـوان ئایینـەکاندا بەسـەر مەسـیحیو ئیسلامدا بچەسـپێنێت، ئـەوا لەسـەری پێویسـتە

---

[١٤] ١+١+١=١ ئەم وتەیە دروست نیەو ناماقوڵە، ئەوا ئەو کەسانەی شەرم لە هیـچ مامۆسـتایەك ناکـەن لە نموونەی ئەم دەقانە دەیانگرێتەوە:

﴿وقالوا اتخذ الرحمن ولدا، لقد جئتم شيئا إدا، تكاد السماوات يتفطرن منه وتنشق الأرض وتخر الجبال هدا، أن دعوا للرحمن ولدا، وما ينبغي للرحمن أن يتخذ ولدا، إن كل من في السماوات والأرض إلا آتي الرحمـــن عبدا، لقد أحصاهم وعدهم عدا، وكلهم آتيه يوم القيامة فردا﴾ مريم/٨٨–٩٥.

واتە: و ئەوانە وتیان: رەحمان (خوا) منداڵی بۆ خۆی داناوە!، بە هەقیقەت قسەیەکی دزێو (و قـۆڕ) تـان بە زارا هێناوە، لەوانەیە ئاسمانەکان لەبەر ئەم قسەیە پارچە پارچە بێو زەوی لـەت بـێو کێوەکـان (بـە هاڕەهاڕ) برووخێنە خوارێ، کە بۆ خوای رەحمان منداڵیان دانا،و بۆ خوا شیاو نیە منداڵ بۆ خۆی دابنێ، (بێجگە لەمە) نیە کە هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەویدا هەیە وەکـو عـەبد دێنـە لای خـوای دلۆڤـان، بـە هەقیقەت ئەوانەی بە وردی ژماردووە،و لە رۆژی قیامەتدا هەموو تاكو تەنیا لای خوا حازر دەکرێن.

لێکۆڵینەوەکەی بۆ ئایینی مەسیحی لەو ماوەیەدا بێت کە بانگەوازی ئیسلامی لە دوورگــەی عەرەبیدا سەری هــەڵدا، چونکــە ڕێ پێدراو نیــە بــەوەی هیــچ لێکۆڵەرەوەیــەك وای دابنــێ ئیسلام تیراژێکی هەڵگێڕدراوی ئــایینی مەسـیحییە، تــەنیا لــەو حاڵەتــەدا نــەبێت وا بزانێت پێغەمبــەری ئیسـلام لــە مەسـیحییەوە وەریگرتــووە وەك چــۆن لــە ژینگــە عەرەبییەکــەیدا ناسیویەتی، و بە جۆرێکی وا کە پەیوەندی پێوە کردبێ لە ژینگە جیاوازەکانی دەورویەری دوورگەی عەرەبیی. جا هەر چــەندێك ئــایینی مەسـیحی لەسـەرجەم ژینگــەکانو سـەردەمە جۆراوجۆرەکانیان پەرەی سەندبێ، ئەوا بە تــەنیا ئــەو بیروبـاوەڕە مەسـیحییەی ڕێ دراوە بەو کەسەی بەکاری بەراوردکاری نێوان ئایینەکان هەســتێو بیکاتــە سەرمەشـقی ئیسـلام، ئــــەو عەقیدە مەسیحییەیە کــە لــە دوورگــەی عــەرەبیو دەوروبــەریدا هــەبوون، (جــۆرج سیل) پەرچڤەکاری قورئان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وەسفی حاڵی مەسیحییەکانی کـردووە لە حیجازو سەرجەم شوێنە نزیکەکانیەوە، لەم بارەوەو لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ:

(شتێکی جەخت کراوە کەنیسەی ڕۆژهــەڵات بــە هــۆی ئــەو نارەحــەتیو ئازاردانــەی لەسەرەتای ساڵانی ۲۰۰ی زایینیـدا وای لــە زۆربــەی شـوێنکەوتوانی کـرد پــەنا بــۆ وڵاتــانی عەرەب بەرن بۆ بەدەسـت هێنــانی ئــازادی، زۆربەشـیان بــە (یەعاقوبــە) نـاودەبرێن، بۆیــە زۆربەی گەورە فەلەکان لەم کۆمەڵەن.و بەناوبانگترین ئەو خێڵانەی بوونە گاور: (حمیر، و غسان، و ربیعە، و تغلب، و بهراء، و تنوخ، هەندێك لە طيء، و قضاعة، و خەڵکی نەجران، و حيرة...)و لەبەر ئەوەی ئایینی گاوری بەم جۆرە تەشەنەی کرد لــە وڵاتــەکانی عــەرەبدا ئەوا بەم ڕووەوە پەیوەست بوو کە دەشبوو وابێ، کــە گاورەکــان لــە زۆر جــێدا قەشــەیان هەبوو، تا سیاسەتی دێرەکانیان پێ ڕێك بخەن، لەمەو پێش باسی قەشــەکانی (ظفــار)مــان کرد،دەشڵێن (نەجران) شوێنی قەشەکان بوو،(یعاقبە)کان دوو قەشەیان هەبوو؛ بــە یــەکێکیان دەگوت قەشەی عەرەب بە گوتنی زاراوەکەو، شوێنی جێگیر بوونیشــی (بـاکولا– بـوو) کــە لای ئیبنولعیبری بە کوفە دەستنیشان کراوە، یان جێیــەکی تــری نزیك بــەغدادە بــە پــێی بۆچوونی (ئەبی فیداء)، دووەمیشیان بە قەشەی عەرەبی التغلبيين ناو دەبرا کە جێکــەیان

لە حیرە بوو. بەڵام نەستوریەکان لەم دوو کورسییەدا هیچ قەشەیان نـەبوو، جگـە لـە یـەك قەشە نەبێت کە لە ژێر سەرپەرشتی بەطریکەکەیاندابوو).

هەتا دەگاتە ئەوەی کە دەڵێت: (بەڵام کەنیسەی رۆژهەڵات دوای هەڵوەشاندنەوەو تێکچوونی کۆمەڵگەی نیقاوی بـە چـەند گفتوگۆیەکـەوە ئاڵۆسکاو دوایـی نەدەهـات، بـە گێڕانـەوە جیاوازەکانی الأریوسـیىنو نەسـتووریەکانو یعقوبییـەکان کـە جیـاوازبوون لـە دەربڕینی بیروباوەڕەکەیان سەری داوەکە بزر بوو، پاش توێژینەوە دەرکەوت هەر یـەك لـە بیدعەی نەستووریەکان و یەعقوبییەکان کە هـەر یەکـە بانگەشـەی دەربڕینـی جیاوازی لـە عەقیدە دەکرد ئەمە پێشتر بوو لەوەی بانگەشەی عەقیدەکەیان بکەن، و بەوەی کە بەڵگە دەربڕین هـەر یـەك لـە گفتوگۆکـاران زاڵ بێـت بەسـەر ئـەوی تـردا، لـە پێشـتر بـەوەی کـە بانگەوازی هۆیەکی پێویست دوبـڕن ببێتـە هـۆی لـە خۆگرتـنی چـەندان کۆمـەڵو پێکـەوە لکانیان، کۆمەڵێك لە قەشەو ئوسقوفەکان دەیانگوتەوەو دەیانگێڕایەوەو چـەندو چوونیـان دەکرد، بۆ ئەوەی هەر یەکەیان قسەی خۆی سەرخات، کێشەکان بەرەو ئـارەزووی خۆیـان لار بکەنـەوە، پاشـان وتـە جێبـەجێ کـەرانو خـاوەن پایـەکان لـە کۆشـکی پاشـایەتیدا هەریەکەیان کەسێکی لە پێشەوای سوپا یان خاوەن دوانگەو وتاردەرەکان تایبـەت دەکـرد بە خۆیەوە، تا پاڵپشتیان بێو بەهێزیان بکات، ئیدی بۆیە پلەو پایـە بـە هـۆی بەرتیلـەوە چـنگ دەکەوت، پلەو پایەش بە ئاشکرا دەکڕدراو دەفرۆشرا. هەرچی دێری رۆژئاواش بـوو پڕ بوو لە بەهیلاکچوونی دەماسوسو ئەرسکینوسەکان، لە گێرمەوکێشو پێشبڕکێ کردنـدا لەسـەر پایـەی ئوسـقوفییەت – مەبەسـت لـە ئوسـقوفییەتی رۆمـا– کـە دەبـووە هـۆی هەڵگیرسانی ئاگری ئاژاوەو خوێنڕژان لە نێوان ئەو دوو گروپەیاندا.. زۆرتر وتووێژەکـانیش لە لایەن قەیسـەرەکان خۆیانـەوە دروست دەبـوو، بـە تایبـەتی قسطنطینوسـی قەیسـەر، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیدەتوانی راستییەکانی ئایینی مەسیحی لـە ئەفسانەو چەوتییـەکانی سەراسیمەییەکان جیابکاتەوە، ئایینەکەیان ئاڵۆزکاندبوو بە چەندان باسـی پـڕ جیـاوازی... ئەمە حاڵی گاورێتی بوو لە وڵاتە ناعەرەبییەکاندا. بەڵام سەبارەت ئەو وڵاتانەی کـە جـێی

باسەکەمانە ئەوا لەوان باشتر نەبووە… بۆ نموونە هـەندێك لـە گاورەکـانی عـەرەب بڕوایـان وابووو دەیانگوت کە گیان لەگەڵ لاشەکاندا دەمرن‌و پاشان لـە رۆژی دواییـدا هـەردووکیان زیندوو دەبنەوە، دەڵێن أوربیجانوس ئەم رێبازەی تێدا دروسـت کـردن، چـەندان‌و چـەندان بیدعە لە دوورگەی عەرەبدا بڵاوبووەوە تا نەڵێین ئەو بیدعانە لە دوورگەدا دروست بووە !!

هەندێك لەو بیدعانە ئەوە بوو کـە خاوەنـەکانیان دەیـانگوت مەریـەمی عـەزرا[15] خـوا بووە، بە جۆرێك دەیانپەرست وەك خـوا بپەرسـتن، کـە پارچـە زیـوی خڕیـان بـۆ دەکـردە قوربانی کە پێی دەگوترا کلیرس، بۆیە بە خاوەنانی ئەم بیدعەیە دەگوترا کلیرییەکان…

لەگـەڵ ئەمەشـدا لـە دوورگـەی عـەرەبیدا ژمارەیـەکی زۆر لـە کۆمـەڵی جیـاواز بـە نـاوی جیاجیاوە دوورگەی عـەرەبدا کۆبوونـەوە، لـە ترسـی تۆقـاندنی قەیسـەرەکان پـەنایان بـۆ بردبوو..).

بیروباوەڕی کۆمەڵە مەسیحییەکان لە دوورگەی عەرەبی‌و جیهانی دەوروبـەریدا، بـە جۆرێك بوو – ئـەو کەسـە وەسـفی دەکـات کـە بەرانبـەر ئیسـلام دەمارگـیر بـووو خۆشـی نەدەویست، واشی گومان پێ نەدەبرا کـە خراپـەو زیـان بـە مەسـیحییەت ئەگەیـەنێت‌و لـە کاتێکدا لە تواناشیدا هەبوو بەرێوەیان ببات: لە راستیدا بیروباوەڕی کۆمەڵە مەسیحییەکان بەم جۆرە بوو، کە جێی سەرسوڕمان نیەو شایستەی شوێن پێ هەڵگرتنیش نین: شـتێکی روون‌و ئاشکراشـە هەڵوێسـتی ئیسـلام هەڵوێسـتی راسـتکەرەوەی تەواوکـەر بـوو، نـەك هەڵوێستی گواستنەوەی وەرگر، بێ هیچ تێگەیشتن‌و گرنگی پێدانێك.

---

[15] قورئانی پیرۆز ئاماژەی ئەوانەی داوە بەو ئایەتەی دەفەرموێت ﴿وإذ قال الله يا عيسى ابن مريم أأنـت قلت للناس اتخذوني وأمي إلهين من دون الله قال سبحانك ما يكـون لي أن أقـول مـا ليـس لي بحـق﴾ المائدة/١١٦.

واتە: و(بێنەوە بیر) ئەو زەمانەی کە خوا فـەرمووی: ئـەی عیسـای کـوڕی مەریـەم! ئایـا تـۆ بـە خـەڵکت گوتووە کە لە باتی خوا، من دایکـم بـە نـاوی دوو مـەعبودی تـر (بپەرسـتن و) وەریگـرن؟ (عیسـا) ئـەڵێ: (خوایە !) تۆ (لەهاوبەش بوون) پاك‌و بێ خەوش، بۆ من ناشێ، شتێك کە هەقی من نیە قسەی لێبکەم.

ئیسلام هاتو بانگەوازی یەکخوای پاکی کرد، دوور لە بۆگەنیـــی هاوەڵدانان، دوور بێ لە نەفامی دەمارگیریو پشتاوپشتێتی (نەسەب)، پاك بێ لە هەموو وێکچوونێـك کـە لـە پاشماوەی رەچەڵەکبازییەکانەوە دزەی دەکرد بۆ ناو ئایینی خاوەن پەڕاوەکان.

ئەو خودایەی کە موسڵمانان بڕوایـان پێیـەتی، یـەك خوایـەو هیـچ هـاوەڵێکی نیـە ﴿سبحانه عما یشرکون﴾.

ئیدی خوای یەك هۆزو یـەك پشـت نیـە کـە بیـاندات بەسـەر ئـەوانی تـردا بـێ هیـچ کاریگەربوونێك، بەڵکو خوداوەندی هەموو جیهانیانە، سەرجەم مرۆڤایەتی دروست کـردووە تا یەکتر بناسـنو بـەهۆی تـەقواوە رێزدارێـتی بنوێنـن، ئیـدی پلـەو پایـەی هیـچ عـەرەبێك نادرێت بەسەر عەجـەمداو هیـچ قرشییەك نـادرێت بەسـەر حەبەشـییەکدا تـەنیا بـە تـەقوا نەبێت.

: ﴿یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوبا وقبـــائل لتعـــارفوا إن أکرمکم عند الله أتقاکم﴾ الحجرات/١٣.

واتـە: ئـەی خەڵکینـە! بەڕاسـتی ئێمـە ئێوەمـان لـە پیـــاوو ژنێـك خولقــاندووە،و ئێـوەمان کردە نەتەوە، نەتەوەو هۆز هۆز تـا یـەکتر بناسـن، بەڕاسـتی بـەڕێزترینتان لای پەروەردگارتان خۆپارێزترینتانە.

و ئەو پەروەردگارە تاكو تەنیایە: ﴿لم یلد ولم یولد، ولم یکن لــــه کفــوا أحـــد﴾ الإخلاص/٣-٤.

واتـە: (هیـچ شـتێك) لێـی نـەبووەو (لـە هیـچ شـتێکیش) نـەبووە،و هیـچ هــاولفـو هاوتایەکیش بۆ ئەو نیە.

هیچ مرۆڤێك بە تاوانی هیچ مرۆڤێکی تر ناگیرێت، هیـچ نەتەوەیـەکیش بـە رێـڕەوی نەتەوەیـەکی پێشـتر ناپرسرێتەوە، گێـتیو مرۆڤایـەتیش تاوانبـار نـاکرێت بـە بـێ نـاردنی پێغەمبەران.

﴿ولا تزر وازرة وزر أخرى﴾[16] /١٨.

واتە: و هیچ کەس باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ.

﴿تلك أمة قد خلت لها ما كسبت ولكم ما كسبتم ولا تسألون عما كانوا يعملـون﴾ البقرة/١٣٤.

واتە: ئەوانە ئوممەتێك بوون کە ڕۆیشتن، ئـەوەی وا کردیـان بـۆ خۆیانـەو ئـەوەی وا کردتان بۆ خۆتانە،و ئێوە بەرپرسی کردەوەی ئەوان نین.

﴿وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا﴾ الإسراء/١٥.

واتە: و ئێمە هیچ (تاكو تاقمێك) سزاو عەزاب نادەین تا (لەبەرا) پێغەمبەرێكیان بۆ نەنێرین.

ئایینەکەش ئایینی بەزەییو دادپەروەرییە، هەموو سورەتێك لە قورئـاندا بـە (بسم الله الرحمن الرحيم)[17] دەست پێ دەكات.

﴿وما ربك بظلام للعبيد﴾ فصلت/٤٦.

واتە: و پەروەردگارت سەبارەت بە بەندەکان هیچ ستەمکار نیە.

﴿هو الأول والآخر والظاهر والباطن﴾ الحديد/٣.

واتە: هەر خوایە ئەوەڵو ئاخرو زاهیرو باتین.

﴿وسع ربي كل شيء علما﴾ الأنعام/٨٠.

واتە: ئاگاداری پەروەردگارم ئەوەندە پەرە دارە کە هەموو شتێك دەگرێتەوە.

﴿وهو بكل خلق عليم﴾ يس/٧٩.

واتە: ئەو بە هەموو بەدیهاتوویەك زاناو ئاگایە.

---

[16] ئەم تێگەیشتنە لە کوێ؟ لەگەڵ بیروباوەڕی ئەوانەی دەڵێن مرۆڤایەتی هەمووی تاوانبارە بەو هەڵەیەی حەزرەتی ئادەم ﷺ کردی، تەنانەت بە پێ‌درۆکانیان خوا ناچار دەبێت کوڕەکەی لە سێدارە بدات. خوا پاك‌و بێ لەکەیە لەم وەسفانە تعالى الله عما يصفون! !.

[17] جگە لە سورەتی (التوبة) نەبێت کە ئەویش حیکمەتی خۆی تێدایە. وەرگێڕ

لێکۆڵـەرەوەی بـەراوردکاری نێـوان ئایینـەکان دەتوانێت ئـەوەی دەیـەوێت بیڵێـت سـەبارەت ئـەم خودایـە کـە تـاکو تەنیایـەو پـەروەردگار ی جیهانیانــەو پــەروەردگار ی ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاواکانـە، تـەنیا ئـەوە نـەبێ بڵـێ: ئـەم خوایــە تــیرازێکی وەرگــیراوە لــە بیروباوەڕی عەرەبە نەفامەکانەوە، یان لە عەقیدەی خاوەن پەڕاوەکانەوە وەرگیرابێت کە بیروباوەڕی جاهیلیی تــێ کـەوتووە، بـەو جۆرەی کـە (جۆرج سیل) وەسـفی دەکـات لـە سـەرەتای پەرچڤـەی قورئـاندا کـە کردوویـەتی، چونکـە عەقیدەیـەکی خودایـــی گــەر لــە کەلەپووری نەفامەکانەوە وەرگیرابێ، لە مۆرکــی دەمارگـیرێتی زیـاتر هیـچ مۆرکێکـی تـری پێوە دیار نابێت، و پڕ دەبێ لە شانازی کردن بە پلــەو پایـەو دەسـەڵات. ئـەو کاتــەش لـە خلّتـەو خـەوشو بۆگـەنی هاوەڵدانـان بـەدەرنابێتو لـە تەڵەکــەو فێڵــە دانراوەکــانی نــاو پەرستنەکان بەدەر نابێت کە پڕ بووە لە چڵکو چەوێڵ، کە دوعاو نوشتەو پەنا گرتن (رقي وتعاويذ) شوێنی بەندایەتیو نوێژەکانی گرتبۆوە.

موعجیزەی موعجیزەکـان ئەوەیـە ئیسـلام بـەو جۆرە نـەبووە، بــەڵکو بەوپــەڕی ڕاشکاوی یەکلاکەرەوەی دڵنیاوە دژی هەموو ئەمانە بووە، کە ڕێی بە پسانەوەوەوڕێکەوتنو ملکەچی نەداوە لەم بارەوەو هیچ سیفەتێکیشی لە دەمارگـیری جـاهیلیو شـانازی کردنـی جاهیلی پــێ قـێزەون تـر نیـە،و دوژمنایـەتی جـاهیلی لەسـەر جیـاوازی تـیرەو ڕەچەڵـەکو کۆمەڵ پێ ناشیرینتر نیە.

لەناو جەرگەی وڵاتی دەمارگیرییەوە ئەو ئایینە بـەرپابوو کـە نکۆڵـی دەمارگـیرێتی دەکرد.

لە قوڵایی وڵاتی هۆزو تیرەکانەوە ئەو دینە بڵاو بووەوە کە بانگەوازی بـۆ لای یـەك خـوای تـاكو تـەنیاو پـەروەردگار ی هــەموو جیـهانیانو ڕۆژهــەڵاتو ڕۆژئاواکــان دەکــرد، پەروەردگار ی هەموو نەتەوەو مرۆڤایەتییەکان بێ هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا، جگـە لـە جیاوازی چاکەخوازیو بڕوا هێنان نەبێت.

لە کاتێکدا ئەو لێکۆڵەرەوانەی سیفەتی زانست ئەبەخشنە زاناکانی بەراوردکاری نێوان ئایینەکان لە رۆژئاوادا، ئەوا بە پێی وەسف کردنیان بۆ ئیسلام (وەك ئاشکرایەو دەبیستریٚ) لە پێڕەوو پابەندەکانیاندا یان لە دووبارە کردنەوەی لاساییەکانیاندا، کەوا دیارە ئەوان ژیریی خۆیان زۆر ماندوو نەکردووە لەم رووەوە بە شێوەیەکی تەواو، کە بەتەواوی گرنگی بدەن بەم ئایینە بە جۆرێکی گشتیو دوورودرێژ.

جا لە پەرتووکێکدا کە یەکێکە لە پەرتووکە تازەکان باس لە ئایینەکانی گرۆی ئادەمیزاد دەکات کە مامۆستایەکی فەلسەفە لە زانکۆیەکی گەورە نووسیویەتی، نووسەری تایبەتمەند بەم لێکۆڵینەوانە دوای ئاماژە کردن بە شمشێری توندو تیژیو وەرگرتن لە ئایینی گاورو صائیبیو مەجوسییەکانەوە، دەڵێت:

(موحەممەد پۆشیویەتیو دیاری کردووە بۆ خوای پەروەردگار ی – پۆشاکیٚ لە ئاکاری عەرەبیی،و کەسایەتی عەرەبیی...) [18].

هەروەها دانەر دەڵێ: (ئەو راستییەی لێرەدا ئاماژەی پێ دەدەمو دەیخەمە روو بۆ هەموو لێکۆڵەرەوەیەکی ئەم ئایینە عەرەبییە دەردەکەویٚ، هەروەها ئەو کەسایەتییە خواییە عەرەبییەش...).

بەم وەسفە کۆنو لاساکارە نووسەر وەسفی خوای ئیسلام دەکات، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی کردووە دەگاتە ئەوەی ئەمە بڵێ؟... ئەی دەبوو چ بڵێت ئەگەر هەر لە دوورەوە بە پڕوپاگەندە ئیسلامی ببیستایە؟!.

---

[18] زۆر سەیر دەبوو ئەوەی کە گوتویەتی ئاماژەو گەواهی پێ بدایە بەو ئایەتەی دەفەرمویٚ ﴿قل لو كان البحر مدادا لكلمات ربي لنفد البحر قبل أن تنفد كلمات ربي ولو جئنا بمثله مددا﴾ الكهف/١٠٩.

واتە: بڵێ: ئەگەر دەریاکان بۆ (نووسین)ی واژەی پەروەردگارم ببنە مەرەکەب، دەریاکان تەواو دەبن بەر لەوەی واژەکانی پەروەردگارم تەواو بن، هەرچەند وێنەی ئەو (دەریایانەش) بێنینە کۆمەکیان.

حسداً حملنه من أجلها          وقديماً كان في الناس الحسد

واتە: حەسوودی هەڵی گرتوون لەم پێناوەدا، لە مێژینە حەسەد لە مرۆڤا هەیە.

ڕەنگە پێویست نەکات هیچی تر بڵێین دوای گوتنی (بسم الله الرحمن الرحيم) لە سورەتی الفاتحەدا، تا بزانین موسڵمان ئاتاجی خوداوەندی جیهانیانە، ئەویش دووجار وەسفی کردگارەکەی ئەکات بە بەزەیی، لەکاتی دەست پێ کردنی هەر سورەتێك لە سورەتەکانی قورئاندا.

ڕەنگە بیتوانیایە زۆر باشترو دروست تر بەراوزدییەکانی بکردایە گەر ڕازی بوایە بەو سیفەتە لە سیفەتەکانی خوای ئیسلام، ئەوسا بە کاری بەراوردکاری هەستایە لە نێوانیاندا لەگەڵ ئەو سیفەتانەی لە ئاینەکانی تردا نا موسڵمانان هەڵیانبژاردووە، دەبینین لە سەرەتای داواو پاڕانەوەکانیاندا ناوی پەروەردگار بە سیفەتەکانی هێزو دەسەڵاتو جەبەرووت دێنن.

ﷲ خودای هەردوو جیهانە، پادشای ڕۆژی سزایە، تیراژێکی هەڵگەڕاوە نیە لە وێنەی ﷲ لە بیروباوەڕی خاوەن پەڕاوەکاندا، بەڵکو ئەو سەرچاوەو ڕەسەنایەتییەیە کە هەر کاتێك لە عەقیدەی خودایی لابدرێت هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای، بە تەواوترین شێوە کە لەسەریەتی،و بە تەواوترین شێوە کە پێویستە ببێ.

بۆیە ئەم عەقیدە خواییە لە ئیسلامدا ڕاست کەرەوەو تەواوکاری هەموو عەقیدەیەکی پێش خۆیەتی لە ڕێبازی ئاینەکاندا، یان لە ڕێچکە فەلسەفەو لێکۆڵینەوەکانی پەروەردگار یدا.

ئەم عەقیدە عەقیدەیەکی تەواوە، عەقیدەی هیندییەکانی لە کارماو نرفانا ڕاست کردۆتەوەو تەواویشی کردووە، چونکە عەقیدەیەکی پووچو بەتاڵە، یان فەنایەکی لێ زەوت کراوی زاتە کە لە نێوان ئەوو نەوەی زیندووواندا ناسازێ!.

ئەم عەقیدەیە عەقیدەیەکی تەواوە، ڕاست کەرەوەو تەواو کاری عەقیدەی مامۆستای یەکەمی مامۆستایانی فەیلەسوفە غەربییە کۆنەکان بوو، چونکە لە داماڵین (التجريد)و پاك ڕاگرتن (التنزيه) تێگەیشتنێکی هەڵەی هەبوو، کە ئەم هەڵەیە وای لێکرد

گوتـەی تـەواوێتی ڕەهـا (الكمـال المطلـق) بدركێنـێ؛ وەك عـەدەمی ڕەهـا لـە دامـاڵین لــە كاروكرداردا،و ویستو داماڵین لە گیانیش.

و ئایینێكە عەقائیدی خوایی راست ئەكاتەوەو بـەكاری تەواوكاریشـیان هەڵدەسـتێ كە لە ئایینی نەتەوەكانی پێش خۆیو شارستانیەتییەكانیانو ڕێچكەی فەیلەسـوفەكانیاندا دەریان بڕیبوو؛ نیشانیان نەدا لە كوێوە هاتووە،و چ پێغەمبەرێك سـەرچاوەو بانگخوازیـان بووە؟ ئەویش لە دوورگەی عەرەبییە.

لە پێغەمبەرێكی نەخوێندەوار لـە نێـوان هـەموو پێغەمبـەرە رەوانـە كراوەكـان كـە خاوەنی پەڕاوو پەرستش بوون.

جا گەر ئەمە سـروش نـەبێت لـە لایـەن خـوداوە، دەبـێ چـی بـە سـروش (الوحـی) دابنرێت؟.

هـەرچۆنێك بـووە لــــە بەنـەمر دانـانی ئیمـانداران بـە سروشـی خودایـی كــە بـۆی نێردراوەیا ببێ، ئەگەر وا نەبێ چۆن كەسێكی نەخوێندەوار لە ناو جەرگەی بیاباندا بڕوا بـە ﷲ دێنێ؟ بە بڕوایەكی تەواو لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی، ئەگەر ئەمە وەحی نەبێت لـە لایـەن خـوداوە؟ ئـەوە بەردێكـە چۆتـە بـەرچاوو دڵـەكانیان، كـە نكۆڵـی وەحـی دەكــەن، لەسـەروو ئـەم موعجـیزە گەورەیەشـەوە! ئەمە ئایینە جێی بڕوا لــە هیــچ وێنەیــەكی بەرهەستو ئەندێشەشـــدا؟. وتەی عەققاد لێرەدا تەواو بوو.

❁❁❁

پاشان: ئیدی زۆر سەیرەو جێی پێكەنینو گریانە، بەراوردكاری عـەقیدەی ئیسـلام لە بەشی پەروەردگارێتیدا لەگەڵ وڕێنەو پووچایەتی مرۆڤەكان لەم رووەوە بكەین.

ئایا سەیر نیە ئایینێك كە ئەم دەقەی تیا بێت:

﴿ولو أنما في الأرض من شجرة أقلام والبحر يمده من بعده سبعة أبحـــر مـــا نفـــدت كلمات الله﴾ لقمان/٢٧.

واتە: و ئەگەر هەموو دارو چیوی روی زەوی ببنە قەڵـەم(نووسـینگ)و دەریـاش بـۆ ببێتە مەرەکەبو حەوت دەریای دیکەیش بێ بە کۆمەکیەوە، قسەی خوا (یان پێنانوسـرێ و) دوایی نایێ.

بـەراوردی بکـەین بـە ئـایینێك کـە سـەبارەت خـودا دەڵێـت: جیمـاع دەکـات، یــان زۆرانبازی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا دەگرێت، تا وای لیٚ دێت زاڵ بن بەسەریدا، یـان کـوڕی هەبێت، واتا ژنی هەیە، نموونەی ئەم گوتە پووچو سوکانە شایستەی ئەوە نین لەگەڵ ئــەو وتە مەزنانە بەراورد بکرێن؟!.

هـەر دەقێـك سـەبارەت زاتـی خـودا لـە ئیسـلامدا لیٚی بکۆڵینـەوە، هـەمووی ئــەوە دەسەلمێنێ کە ئەم دەقە جگە لە خوای گەورە –چ بە وتە یان بە سروش– ئەوا لــە لایـەن هیچ شتێکی ترەوە نەنێردراوە.

بەڵام چی بکەین لە کەسانێك بە کوێـری راهـاتوون، بـە شـێوەیەك حـەز بـە بینـایی ناکەن!!

بـەڵێ لـە دیاردەکـانی گــەردوونمان کۆڵیــەوە، ئــەوانیش رێنموونیـان کردیــن بــۆ سـیفەتەکانی خــودا، کــاتێکیش گەڕاینــەوە بــۆ پــەڕاوی خــودا (قورئــان) ئــەوا زیــاتر تێگەیشتنەکەمان یەقینی لە خۆ گرت، زیاتر لــە پانتاییـەکانی باسـەکەوە شـتمان بـۆ روون بۆوە، بێگومان ئەگەر ئێمە موسڵمان نەبووینایەو بەهۆی وەحیو سروشـەوە ئـایینی خـودا لە مێشکماندا نەچەسپایە، ئەوا نەماندەتوانی بەم جۆرە خۆمان لەم باسە بدەین. چونکـە ئەم ئایینە ئایینێکـە دەسـتی ژیریـی دەگرێـت لەسـەر رێی زانسـت، تـا بـۆی بسـەلمێنێت لقەکان بە بنەماکانەوە ببەستێتەوە، بنەماکانیش دەگێڕێتەوە بۆ سەرچاوە ئایینیەکەی کە جگە لە حەق هیچی تر نیە.



کەسانێك هەن نابیستن‌و ئاقڵ نابن‌و بـیر ناکەنەوە، بیروباوەڕیان زۆر هیچ‌و پووچە، کاتێکیش بانگ بکرێن بۆ ئەم پاکێتیی‌و لۆژیکە کاربەجێیە، ڕەفزی دەکـەن چونکـە لەسـەر بیروباوەڕێکی چەوت‌و چەوێڵ ڕاهاتوون، بە جۆرێکیش وەریان گرتووە بـێ ئـەوەی خۆیـان ماندوو بکەن بۆ لێکۆڵینەوە، ئەو کەسانە وەك خودا سەبارەتیان دەفەرموێ:

﴿بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم﴾ الزخرف/٢٢.

واتە: نا بەڵکو ئەڵێن: بەڕاستی باو باپیرانمان ئایینێکیان بووەو ئێمەش بە شوێنی ئەوانا.

ئەوا هەموو خاوەن بیروباوەڕە پووچـەکان ئـەم قسـەیە دەکـەن. ئایا کـاتی ئـەوە نەهاتووە ئەم جۆرە کەسانە چاوێك بە خۆیـاندا بخشـێننەوە؟! چونکـە کێشـەکە کێشـەی هەڵبژاردن نیە؛ بەڵکو کێشەی چارەنووسی ئادەمیزادە: یان بۆ بەهەشـت، یـاخود بـۆ نـاو ئاگر، کە خۆیان‌و باووباپیرانیان ئەسوتێنێ بە شێوەیەکی هەمیشەیی، ئەگەر ڕێی هیدایەت نەگرنە بەر.

ڕەچەڵەکبازەکان، شوبهێنەرەکان، کەمکەرەوەکان (لە سـیفاتەکانی خـودادا)، یـان ئەوانـەی سـیفاتی خـوا دەبەخشــن بــە دروســتکراوەکانی:وەك لێخۆشـبونی تـاوان یـان نارەحەتی لەسەر لا بردن، یان وەڵام دانـەوەی پاڕانـەوە، یـاخود بـە نـەمر کـردن‌و گـەورە کردن.. ئەوانەی کە بە تەواوی سیفەتە بەرزەکانی خوا ناناسن‌و ناوە پیرۆزەکـانی نـازانن‌و بوونـی تـــەواوی درك پێناکــەن‌و دەســەڵاتی هەمیشــەیی هەســت پێناکــەن‌و کۆمــەکیی بەرفراوانیی ناناسن، کە چۆن کاروباری دروستکراوەکانی بەڕێوە دەبـات لـە سـەرەتاوە تـا کۆتــایی پێــهێنان. ئەوانــەی کــە ئایــەت‌و نیشــانەکانی خــودا نابیننــەوە لــەو هـــەموو دروستکراوانەیدا ئەوا هیچیان خوا ناناسن.

تەنیا ئێمەی موسڵمان بە تەواوی خودا دەناسین، بەوپــەڕی تەواوییـەوە بـە پـاکی ڕادەگرین، بە تـەواویش دەیپەرستین، کەسێکیش بەشی دووهــەم‌و سـێهەم لـەم پـەرتووکـە بخوێنێتەوە ئەوا ڕاستییەکی سەراسیمەبەبەخش دەبینێت، چونکە دەیبینێ کە هـەر خـوای گەورەی سروش بــەخش‌و کارسـازە ویسـتی بـۆ ئـەم پێغەمبـەرو ئایینـە بـووەو ڕەوانـەی کردووە.



## تێبینی:

❁ ئەم وەرگێڕانە لە پەرتووکی (اللّه جل جلاله) بە پێنووسی (سعید حوّی) چاپی دووهەم (دار القلم/ دمشق-بیروت) ئەنجام گەیەنراوە.

❁ تەرجەمەی ئایەتەکان لە (تەرجومەی کوردی قورئانی پیرۆز- بە پێنووسی محمد صالح ئیبراهیمی) چاپی ئێران، ڕەمەزانی ١٤١٧کۆچی ــــــ "چاپی یەکەم" وەرگیراوە.

**وەرگێڕ**

## لەسەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە:


١- الله يتجلى فى عصر العلم (جۆن كليفر) كۆى كردۆتەوە

٢- العلم يدعو للإيمان كريسى مۆريسۆن

٣- الله والعلم الحديث عبدالرزاق نوفل

٤- قصة الإيمان نديم الجسر

٥- الله عباس محمود العقاد

٦- العقائد الإمام حسن البنّا

٧- الوجود الحق د. حسن هويدي

٨- مصير البشرية ليكونت دينوى

٩- حقائق الإسلام وأباطيل خصومه عباس محمود العقاد

١٠- مع الله في السماء د. أحمد زكي

١١- مفتاح السعادة الشيخ محمد الهاشمي

١٢- كراسة جامعية (كلية الطب) د. الشطي

١٣- رسالة من الشيخ سعيد النورسي د. سعيد رمضان البوطي




# ناوەڕۆك

لە کتێبەکانی:

هزری هاوچەرخی ئیسلامی




1 مەشخەڵی ڕێ (معالم فی الطريق):

سەيید قطب

وەرگێڕانی : کرێکار

بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سونتەتدا

(لە ژێر چاپە)

د. عومەر سلێمان ئەشقەر

وەرگێڕانی: ئارامی گەلاڵی